



# شێرپەنجە



## باشترین ڕووداوی ژیانم

سالی جەنگینز
لانس ئارمێسترانگ
وەرگێڕانی بۆ کوردی:
**ناسر سەلاحی**

TEROZH

# شێرپەنجە باشترین ڕووداوی ژیانم

نوسینی: سالی جەنگینز و لانس ئارمێسترانگ

# شێرپەنجە باشترین ڕووداوی ژیانم

نوسینی: سالی جەنگینز و لانس ئارمێسترانگ

وەرگێڕانی بۆ فارسی: حەمیی رەزا بولحەسەنی

وەرگێڕ بۆ کوردی: ناسر سەلاحی

چاپی یەکەم

٢٠٢٢

# "بەناوی ئەو کەسەی  کە بیر ناگاتە ئەوپەڕی جوانیەکەی"


ناوی کتێب: شێرپەنجە باشترین ڕووداوی ژیانم

ن: سالی جەنگینز و لانس ئارمێسترانگ

وەرگێڕانی: ناسر سەلاحی

پێداچوونەوەی: دێرین کامیل- دیدار کامیل

بابەت: دروستی خۆراکی

چاپخانە: چوارچرا

ژمارەی دانە: ۱۰۰۰ دانە

ساڵ و نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ۲۰۲۲

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە (  ١٢٨٤ ) ساڵی ٢٠٢١ پێدراو

# پێرست

## موناجات

ئەی پەروەرێنم! شەرابی بەرگەگرتنی زیاتر بڕژێنە کاسەی ئێمەوە! ئێمە جیا لە رێگای تۆ رێبواری هیچ تەریقەتێکی دیکە نین. لەم قووڵایی شۆرەکاتەدا، جیا لە ئەوین و ژین، کەس ئێمەی بۆ دۆزینەوەی رێگا بانگهێشت نەکردووە. تۆ باش ئاگات لە هەموو ئەو شتانەیە کە روو دەدەن!

ئەی پەروەرێنم دڵەکانمان بە نووری ئەوینی خۆت رووناك بکەرەوە، لە تەنگاناندا فریامان کەوە کە جیا لە تۆ هیچ کەسی دیکە شك نابەین، هەرچی هەیە و نییە لە لایەن تۆوەیە.

ئامین.

## پێشەکی وەرگێڕی فارسی

ئەم کتێبەی ئێستا لەبەر دەستاندایە، گێڕانەوەی ژیانی پڕ لە هەوراز و نشێوی ئەفسانەی پاسکیلسواری جیهان و براوەی حەوت خولی پێشبڕکێی نێودەوڵەتی تۆردۆفرانس و پاڵەوانی راستەقینەی گۆڕەپانی ململانێ لەگەڵ شێرپەنجەدایە کە ئەویش "لانس ئارمێسترانگ"ە. بە بڕوای من ژیانی ئەو بە واتای وشە پاڵەوانێتیێکە کە دەتوانێ کار لە هەموو مرۆڤێك بکات و شێوە بیرکردنەوە و روانینێکی نوێی پێببەخشێت. شێوە بیرکردنەوە و روانینێك کە دەتوانێ مرۆڤێکی دیکەی لێ دروست بکات: مرۆڤێك کە نەك هەر ترسی لە بەرەنگاربوونەوە نییە، بەڵکو ئامێزی بۆ دەکاتەوە. مرۆڤێك کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەموو لەمپەر و هێزە نەرێنییەکان دەگۆڕێ بۆ هەلی زێرین و پەیژەی سەرکەوتن و گۆڕان، وا دەکات تێکڕای هێزەکانی گەردوون بە ئاڕاستەی سەرکەوتنی ئەودا وەگەڕ کەون. مرۆڤێك کە دەتوانێت هەموو خەونەکان بکاتە راستی.

ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمجار و لەسەر پێشنیاری ژمارەیەك لە هاوڕێیانم چەند شتێکم لە بارەی ژیان و کەسێتی ئەم پاڵەوانە گەورە خوێندەوە، زۆر کاری تێکردم، ئاخر لەو کاتەدا خۆشم سەرقاڵی تێپەڕاندنی قۆناغەکانی چارەسەری کیمیایی و چارەسەر بە تیشك بووم. پاش خوێندنەوەی ژیاننامەی ناوبراو، گۆڕان و شۆڕشێکی گەورە لە دەروونی مندا رووی دا و ورەیەکی سەیرم پەیدا کرد. بەشێوەیەك کە ئێستاش

دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ، هەر کات ئەو ژیاننامەیە دەخوێنمەوە، رستە و وتەکانی نێوی هیوا و گەشبینی و وزەیەکی چەند هێندەم پێدەبەخشێت. هەر لەبەر ئەم هۆکارە، لە دوایین قۆناغی چارەسەری کیمیایی خۆمدا، بڕیارمدا بە وەرگێڕانی ژیاننامەی ئەو و کۆکردنەوەی بابەت گەلێکی دیکە خزمەتێکی هەرچەند کەمیش بێت بە کۆمەڵگەی تووشبوانی شێرپەنجە، وەرزشکاران و تێکڕای ئەو کەسانە بکەم کە لە دڵ و گیانیاندا رەنگی داوەتەوە.

پێویستە لێرەدا و بەر لە هەموو شتێك، ملکەچانە سوپاسی پەروەرێنی خۆم بکەم کە پێنووسی ئافراند و وای کرد کە بەندە بچووکەکانی شایانی بن. هەزاران جار سوپاس و ستایشی ئەو دەکەم کە هێز و توانایەکی پێبەخشیم تا بتوانم لە دژوارترین ساتەکانیشدا تەنیا بیر لە بەدیهێنانی بەشێك لەو ئەرکە گەورەیە بکەمەوە کە لەسەر شانمە و لە نووسین بەردەوام بم...

هەروەها سوپاسی بنەماڵە شیرینەکەم دەکەم، واتە باوك و دایکی دڵسۆزم و دوو خوشکە بەسۆزەکەم کە هەمیشە باوەڕ و متمانەیان پێم بووە و پشتگیریان کردووم.

حەمید رەزا بولحەسەنی زستانی ۸۵



١

# پێش و پاش

دەمەوێ لە تەمەنی سەد ساڵیدا بمرم، ئەویش لە کاتێکدا کە ئاڵای وڵاتەکەم بە شانمەوەیە و ئەستێرەی تەکساس بە کڵاوەکەمەوەیە. بە سواری پاسیکەلەکەم و بە هاوار کردن، بە خێرایی ٧٥ میل لە کاتژمێکرێکدا بە سەر کێوەکانی ئالپەوە گوزەر بکەم و بە بیستنی هاندان و هاواری خۆشی هاوسەر و منداڵەکانم لە هێڵی کۆتایی بپەڕێمەوە. پاشان بە غرور و سەربەرزییەوە لە دەشتێکی سەوزەڵان و پڕ لە کوڵەبەڕۆژەکانی فەرەنسادا پاڵکەوم، رێك لە خاڵی پێچەوانەی ئەو مردنە تاڵەی بۆ من پێشبینی کرابوو، بوەستم و بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لەم دنیایە بکەم...

مردنی بەشێنەیی لای من واتای نییە. هیچ کارێك بەرە بەرە و بە شێنەیی ئەنجام نادەم، تەنانەت هەناسە کێشانیش! هەموو شتێك بەخێرایی ئەنجام دەدەم: خێرا دەخۆم، خێرا دەخەوم،...، کاتێك "کریستین"ی هاوسەرم شۆفیری دەکات، زۆر ئازار دەچێژم، چونکە هەر کە چاوی بە گڵۆپی زەرد دەکەوێ خێرا پێ بە ستۆپدا دەنێت، لە کاتێکدا من بە ورووژانەوە لەسەر کورسییەکەی خۆم بێ ئۆقرەم.

پێی دەڵێم: "خێراکە بەردەوام بە، نیگەران مەبە."

هاوسەرەکەم لە وەڵامدا دەڵێ: "لانس! بچۆ لەگەڵ پیاوێکدا هاوسەرگیری بکە."

هەموو تەمەنم خەریکی پاسکیل سواری بووم. لە جادەکانی پشتەوەی

ئاستین، تەکساس(Texas, Austin)ەوە بگرە تا شەقامە پانەکانی شانزەلیزە[1]. هەمیشە وتوومە، ئەگەر من بەهۆی ڕووداوێکی لەناکاو و لە ناوەختدا مردم، ڕەنگە ئەو ڕووداوە، جیا لە پەلاماری گەلە گورگێك لە یەکێك لە جادەکاندا هیچ شتێکی دیکە نەبێت. بڕوا بکەن زێدەڕۆیی ناکەم، پاسکیلسوارەکان بەردەوام مل لە ملی لۆرییە زەبەلاحەکانی نێو جادەکان دەنێن. تا ئێستا زۆر ئوتۆمبێلی جۆراوجۆر خۆیان پێداکێشاوم، هێندە زۆر ئەم ڕووداوانەم بەسەر هاتووە کە هەر بەڕاستی ناتوانم بیانژمێرم. هەر لەبەر ئەم هۆیە ئیدی فێر بووم کە چۆن تەقەڵی برینەکانم دەرکێشم. ئەم کارە تەنیا نینۆککەرێك و دڵێکی بەجەرگ و بەهێزی گەرەکە.

ئەگەر لەشم ببینن کە لەژێر جلە وەرزشییەکانمەوە شاردراوەتەوە، ئەو کات تێدەگەن دەڵێم چی. شوێن تەقەڵێکی زۆر و برینە قووڵەکان بە هەردوو باسکەکانم و هەردوو قاچەکانمەوە دیارن. هەمیشە هەوڵم دەدا قاچەکانم خاوێن ڕاگرم و تووکەکانی بتاشم، ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بووە کە شوفێری لۆرییەکان بەردەوام ویستوویانە لێمدەن. ئەوان پێیان وابووە من لاوێکی بێ سەرەوبەرە و ژنانیم. بەڵام پاسکیل سوارەکان ناچارن قاچەکانیان بتاشن، چونکو لەکاتی ڕووشان یان بریندار بووندا، ئاسانتر خاوێن دەکرێتەوە و ئامادە دەبێت بۆ برینپێچ کردن.

---

[1]– شانزە لیزە (Champs-Elyées) شەقامێکی پان لە شاری "پاریس"ی پایتەختی فەڕەنسایە. ئەم شەقامە بە درێژی ١٩١٠ مەتر لە ناوچەی ٨ی پاریس، لە باکووری خۆرئاوای ئەم شارە هەڵکەوتووە.

ساتێك، لە شارێیەکدا خەریکی پایەدەر لێدانی و ساتی دواتر.. زرم! بە سەرەوە دەچێتە نێو لێتاوەوە. شەپۆلێك هەوای زۆر گەرم پەلامارت دەدات. لە ژێر زمانتەوە هەست بە تامی توند، تاڵ و چەوری دووکەڵی ئەگزۆز(سالۆنسا)ی لۆرییەکان دەکەیت. لەو بارودۆخەدا تەنیا کارێك کە دەتوانی بیکەی، ئەوەیە کە لە تیشی کزی گڵۆپی دواوەی ئوتۆمبێلەکانەوە کە خەریکە لە چاو ون دەبن، بە نیشانەی ناڕەزایەتی دەربڕین دەستتی بۆ مشت بکەیت و بەرزی بکەیتەوە.

شێرپەنجەش شتێکی هاوشێوەی ئەم بابەتەیە. وەك ئەو کاتەیە کە بەهۆی لۆرییەکەوە فڕێ بدرێتە لێواری جادە! شوێنی برینەکانم ئەم قسەیەم دەسەلمێنن. شوێنەواری برینێکی کۆن لەسەر سنگم، رێك لەسەر سنگم هەیە کە سەردەمی چارەسەری کیمیاییم بیر دێنێتەوە. لەو شوێنەدا بۆرییەکی نەرم و باریکیان بەناوی کاتتەر (Catheter) دانابوو تا لەو رێگایەوە دەرمانەکان بکەنە لەشمەوە و بە ئاسانی تێکەڵ بە سووڕی خوێن ببێت. لە بەتاڵایی لای راستی رانمەوە تا سەرەوەی رانم ریزێك شوێن تەقەڵ دەبیندرێن کە هی نەشتەرگەری گونمە. لە هەمووان گرنگتر شوێنی چەندین برینی شێوە چەماوەییە کە بە تەوقی سەرمەوەن و وەك بلێی پیشاندەری ئەوەن کە چەند جار لەکاتی ئەسپسواریدا بە سەرەوە بەربوویێتمەوە. لە کاتێکدا کە ئەوانە شوێنەواری نەشتەرگەری مێشکن کە بۆم کراوە.

لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا تووشی شێرپەنجەی گون بووم و تا لێواری مردن

چووم. تەنیا ٤٠٪ ئەگەری ئەوە هەبوو زیندوو بمێنمەوە. هەندێك لە پزیشکەکان راشکاوانە و بە خۆشحاڵی و گەشبینییەوە ئەوەیان پێدەووتم! قسە کردن لە مەرگ، شێرپەنجە و نەشتەرگەری مێشك یان بابەت گەلێکی دیکە کە دواتر باس دەکرێن، گەمەیەکی سادە نییە. مەبەستی منیش لە نووسینی ئەم کتێبە، پێشکەش کردنی بەڵگەنامەیەکی ساختە نییە، بەڵکو دەمەوێ راستییەکان بگێڕمەوە و دڵنیام ئێوەش بەتاسەوەن تا بزانن لانس ئارمێسترانگ چۆن دەبێتە یەکێك لە گەورە پیاوانی ئەمریکا و بۆ هەموو وەرزشکارانی دنیا وەك ئەفسانەیەکی لێدێت؟ چۆن لە پێشبڕکێکانی "تۆردۆفرانس" (Tour de France)دا کە بە ٢٢٩٠ میل مەوداوە بە ماندووکەرترین رووداوی وەرزشی جیهان دادەندرێت، حەوت جاری لەسەر یەك بووم بە پاڵەوان؟ ئێوە خوازیاری بیستنی نهێنییەکان، راستییەکان و چۆنێتی گەڕانەوەی پەرجووئاسای منن. هەروەها خوازیاری ئەوەن بزانن کە من چۆن ریکۆردی گریگ لیمۆند(Greg LeMond) و میگویل ئیندوراین (Miguel Indurain) م لە کتێبی ریکۆردەکاندا تۆمار کرد. ئێوە بەتاسەوەن تا شتانێك سەبارەت بە سەرکەوتنی خەیاڵی من بە کێوەکانی ئالپ، سەرکەوتنم لە پیرنە(Pyrenees) و ئەو هەست ببیستن کە لەو کاتەدا هەمبوو. بەڵام بەسەرهاتی ئەم پاڵەوانێتیانە، کەم بایەخترین شت گەلێکن کە لە ماوەی ژیانمدا روویانداوە.

هەندێکیان باس کردنیان ئاسان نییە یان تێگەیشتن لێیان سادە نییە... هەر ئێستا و لەم سەرەتایەوە، تکاتان لێدەکەم کە تەسەوراتی

خۆتان لە بارەی پاڵەوانەکان و پەرجووەکان وەلا بنێن، ئاخر بەسەرهاتی ژیانی من، چیرۆك، ئەزیلە یاخود ڕۆمانی خەیاڵی نییە. لە دیزنی لەند یان هۆلیۆدیش دروست نەکراوە. من نموونە و وێنەیەکی راستەقینەتان دەخەمە پێش چاو. سەبارەت بە خۆم، خوێندوومەتەوە کە لە داوێنی کێو و لوتکەکانی فەرەنسادا فڕیوم و بەرز بوومەتەوە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە تەنانەت ناکرێت لەسەر تەپۆڵکەیەکیشەوە بفڕیت. بەڵکو دەبێ بە هیلاکی و ماندوویێتییەکی زۆرەوە هەڵگەڕێیت. لەو حاڵەتەدا، ڕەنگە بتوانرێت بە ڕاهێنان و بەردەوام بوون بتوانرێت پێش ئەوانی دیکە بکەویت.

شێرپەنجەش هەر بەم شێوەیەیە. تەنیا کەسانی باش، شیاو و بەهێز تووشی شێرپەنجە دەبن. ئەوان بۆ پەلاماردان و زاڵبوون بە سەر ئەودا هەموو هەوڵی خۆیان دەدەن، بەڵام مخابن دیسان هەندێکیان ماڵئاوایی لەم دنیایە دەکەن. ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە پێویستە هەمووان بیزانین، کە: مرۆڤەکان دەمرن. کاتێك کە درکمان بەم ڕاستییە کرد، هەموو شتەکانی دیکە، بێ بایەخ دەبن.

من نازانم بۆچی هێشتا زیندووم؟ تەنیا پێموایە، من لەشێکی بەهێزم هەیە. کار و پیشەکەم فێری کردم کە چۆن بەرەنگاری ناخۆشی و دژوارییەکان ببمەوە و لەمپەرە گەورەکان لەسەر رێی خۆم لابەرم. حەز دەکەم بەردەوام ڕاهێنان بکەم و لە پێشبڕکێ تاقەت پڕوکێنەکاندا بەشداری بکەم. ئەمەش ئەو شتەیە کە یارمەتیم دەدات. ئەم حەز و

خولیایە فاکتەرێکی گرنگ بوو، بەڵام تەنیا هۆکار نەبوو لەوەدا کە بتوانم بەسەر شێرپەنجەدا زاڵ ببم.

ئەو کاتەی تەمەنم ١٦ ساڵ بوو، لە نەخۆشخانەی کۆپەر(Cooper Clinik) لە شاری دالاس(Dallas) کە یەکێك لە تاقیگە توێژینەوەییە بەناوبانگەکان و هەروەها شوێنی دارشتنی راهێنانەکانی وەرزشی ئایرۆبیك (Aerobic Excercise)ە، بانگ کرام تا پشکنینێکم بۆ بکەن. یەکێك لە پزیشکەکانی ئەوێ، پشکنینی بۆ کردم تا دەرکەوێ کە لانی زۆری توانای منی بۆ وەرگرتنی ئۆکسجین (VO٢ MAX) چەندە. ئەو وتی ئەنجامەکە، بەرزترین رێژەیەکە کە تا ئێستا بینیومە. هەروەها لەشی من لە چاو زۆرینەی کەسانی دیکەدا ترشی لاکتیکی کەمتری بەرهەم دەهێنا. ترشی لاکتیك، ماددەیەکی کیمیاییە کە لەش لەکاتی ئازار و ماندوێتیدا دروستی دەکات. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە گەرما لە سییەکاندا دروست ببێت و لە قاچەکانیشدا هەست بە ئازار بکرێت.

بەگشتی، توانای بەرگەگرتنی جەستەیی زیاترم لە چاو کەسانی دیکەدا هەیە و وەك ئەوان هەست بە ماندوبوون ناکەم. لەبەر ئەوە هەست دەکەم رەنگە ئەم هۆکارانەش لە چاکبوونەوەی مندا دەوریان هەبووبێت. من بەشانس بووم، بە توانای هەناسەدانێکی زیاترەوە لەدایك بووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێکی زۆرم لە دۆخی تەمومژاوی نەخۆشیدا بەسەر برد! نەخۆشییەکەم شاراوە بوو، لەپڕ دەرکەوت و بووە هۆی ئەوەی کە

بەجۆرێکی دیکە لە ژیان بڕوانم و بیرکردنەوەم بگۆڕێت. دەبوو پرسیاری ئەوە لە خۆم بکەم، ئێستا کە زیندووم، چ ئامانج و مەبەستێکم هەیە؟ دەمەوێ بە کوێ بگەم؟ بەو ئەنجامە گەیشتم کە دەبێ کارگەلێکی زۆر ئەنجام بدەم تا پێبگەم و گەورە ببم.. گاڵتە ناکەم، بەڵام بە بۆچوونی من، لانس ئارمێسترانگ یەك کەسایەتی نییە، بەڵکو دوو کەسایەتی جیاوازە: یەکیان پێش تووشبوون بە شێرپەنجە و ئەوی دی دوای تووشبوونەکەیەتی. پرسیارێك کە هەمووان حەز دەکەن بیپرسن ئەمەیە کە: "شێرپەنجە، تا چ رادەیەك تۆی گۆڕی؟" بەڵام پرسیاری راستەقینە ئەمەیە کە ئەم نەخۆشییە چۆن منی گۆڕی؟! رۆژی ٢ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٦ لە ماڵ چوومە دەر، لە نێو رووداوەکانی ژیاندا بووم بە کەسێکی دیکە، تەواو گۆڕام و دووبارە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام وەك کەسێکی دیکە.. من وەرزشکارێکی دیاری نێودەوڵەتی بووم، بینایەکی جوان و گەورەم لە رۆخی رووبار هەبوو. ئوتۆمبێلێکی پۆرشە(Porsche) هەژمارێکی بانکی زۆر باشم هەبوو. یەکێك لە پاسکیلسوارە پلەباڵاکانی جیهان بووم و سوار شەمەندەفەری بێ هاوتای سەرکەوتنە گەورەکان بووم و بەرەو پێش دەچووم. بەڕاستی من بووم بە کەسێکی دیکە. بە دەربڕینێکی دیکە، "ئارمێسترانگ"ی پێشوو مرد و ژیانێکی نوێ بە من بەخشرا. تەنانەت لەشیشم ئەو لەشەی پێشوو نەبوو! چونکو بەهۆی چارەسەری کیمیاییەوە، هەموو ئەو ماسولکانەم لەدەست دا کە بەدرێژایی چەندین ساڵ هەوڵ و کۆشش دروست ببوون، بەجۆرێك کە هەرگیز، تەنانەت دوای باشبوونەوەی تەواوەتیش نەگەڕانەوە دۆخی هەوڵیان.

راستییەکەی ئەوەیە کە شێرپەنجە، باشترین ڕووداوێکە کە بەدرێژایی ژیانم بۆ من هاتۆتە پێش. من نازانم بۆچی تووشی ئەم نەخۆشییە بووم.. بەڵام ئەم نەخۆشییە، کارگەلێکی سەرسوڕهێنەری بۆ من کرد، بۆیە هەرگیز خۆم لە قسەکردن سەبارەت بەو نادزمەوە، بەڵکو هەمیشە بە شانازییەوە باسی دەکەم. بۆچی دەبێ بمەوێ ڕووداوی نەخۆشییەکەم، گرنگترین و چارەنووس سازترین ڕووداوی ژیانم، بشێوێنم؟

مرۆڤەکان ئەم جیهانە جێدەهێڵن.. ئەمە راستییەکی تاڵە کە زۆرجار، تەنانەت ناتوانم باسی بکەم. ڕەنگە پرسیار بکەن کەواتە بۆچی درێژە بە ژیان دەدەین؟! بۆچی هەموومان نەوەستین و هەر لەو شوێنەدا کە هەین، پاڵنەکەوین؟ لەبەرە ئەوەی کە راستییەکی دیکەش هەیە.. بەڵێ، ژیان! ئەم راستییەش هاو ئاست، بەلام دژی راستییەکەی پێشووە. مرۆڤەکان دەژین، ئەویش لە باشترین و بانترین بارودۆخدا. لە قۆناغی نەخۆشییدا، زیاتر هەستم بە سەرکەوتن دەکرد تا لە قۆناغی پێشبڕکێکاندا. ئەزموونی ساتە بێخەوشەکانی مرۆییم دەکرد. پیاوێکی سادە و پاکم ناسی، زۆرجاران تراکسووتێکی وەرزشی لەبەردابوو... دواتر زانیم کە ئەو یەکێك لە نەشتەرگەرە دیارەکانی شاری تەکساسە. پەرستارێکی دلسۆزم بەناوی لاتریس(Latrice) ناسی کە وەك دایکێك هاوخەمی بۆ دەردەبڕیم، گرنگی پێدەدام و چاودێری دەکردم.

منداڵانێکم بینی کە برۆ و برژانگ بە دەموچاویانەوە نەبوو، چارەسەری کیمیایی هەموو مووەکانی وەراندبووم، بەڵام واش بە ورەیەکی پۆڵایین و

شێلگیرییەکی لەباس نەهاتووەوە دەجەنگان.

من هێشتاش لەو بابەتە تێناگەم...

تەنیا کارێك کە دەتوانم بیکەم ئەوەیە کە تەنیا ڕووداوەکانتان بۆ بگێڕمەوە.

دڵنیابووم کە هەموو شتێك لە مندا تەواو سروشتی و وەك پێشوو نییە.. بەڵام وەرزشکاران و بەتایبەت پاسکیلسوارەکان، خوویان بەوەوە گرتووە کە نکۆڵی لە شتەکان بکەن. دەبێ نکۆڵی لە هەموو ئازار و مەینەتییەکان بکەیت، چونکە ناچاری بگەیتە کۆتایی پێشبڕکێکە. ئەمە جۆرە ڕیازەتێکی دنیای وەرزشە. بەدرێژایی ڕۆژێکی تەواو، شەش یان حەوت کاتژمێر، لە کەش و هەوای جۆراوجۆردا، بەسەر خڕە بەرد، چەو، قوڕ و لیتە، با و باران، بە سەر پاسکیلەوە پایدەر لێدەدەی، لەمپەرەکان تێدەپەڕێنی و نابێ لە ئاست ئازاردا چۆك دابدەیت. هەموو بەشەکانی لەشت وە ئازار دەکەون: پشت، ڕان، دەست و قاچەکان، مل، زۆریش ئاساییە کە سمت و پاشەڵیش تووشی ئازار دەبێت.

لەسەر بنەمای ئەم خووی نکۆڵی کردنە، ساڵی ١٩٩٦ گرنگیم بەم هەستە دەروونییە نەدەدا کە لەو کاتەدا وەزعم باش نەبوو. وەرزی زستان بوو.. کە هەستم کرد گونی لای ڕاستم کەمێك ئاوساوە، بە خۆمم وت: گرنگ نییە، نابێ ئەم بابەتە بەهەند وەرگرم، دەبێ درێژە بە ژیانی ئاسایم بدەم. چونکە پێموابوو ڕەنگە بە هۆی هەندێك جووڵەوە بێت کە بەسەر پاسیکەکەوە ئەنجامی دەدەم یان ئەوەی کە پەیوەندی بە هەندێك بابەتی

فەسلەجی پیاوانەوە هەبێت. وەك هەمیشە بەوپەڕی تواناوە لە پاسکیلسواری خۆم بەردەوام بووم و هیچ هۆکارێکیشم نەدەبینی کە بوەستم.

پاسکیلسواری وەرزشێکە کە پاڵەوانی راستەقینە دروست دەکات. ئەم وەرزشە پێویستی بە توانای جەستەیی باش و بەرگەگرتنی زۆرە کە بە درێژایی سالآنێك راهێنان، بەدەست دێت. هەروەها زەینێکی ئامادەی دەوێ تا ئەو رێکارانە بدۆزێتەوە کە تەنیا بە وەدەستهێنانی ئەزموونی زۆر پێیان دەگات. ساڵی ١٩٩٦ هەستم کرد ئیدی کاتی ئەوە هاتووە بگەمە لووتکە. وەرزی بەهار، لە پێشبڕکێیەکی تاقەتپڕوکێندا بەناوی فلچی – والۆنە (Fleche - Wallonne)دا سەرکەوتنم بەدەستهێنا. تا ئەو کاتە هیچ ئەمریکییەك لەو پێبشرکێیەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابوو. لە لیگ باستۆن (Bastogne - Liege)دا کە پێشبڕکێیەکی کلاسیکی ١٦٧ میلە، پلەی دووەمم بەدەستهێنا و پاشان لە پێشبڕکێی تۆر دو پۆنت (Tour Du Pont)دا کە لە ماوەی ١٢ رۆژدا مەودای ١٢٢٥ میلم بە نێو لووتکەکانی کارۆلینا (Carolina)دا بڕی، پلەی یەکەمم بەدەستهێنا و بووم بە پاڵەوانی ئەو پێشبڕکێیە. دوایین رێکۆردم ٥ چرکە بەرز کردەوە و بۆ یەکەمجار لە ماوەی سەردەمی پیشەیی وەرزشیمدا، خەریکبوو دەچوومە ریزی پێنج پلەی یەکەمی پاڵەوانی جیهانەوە.

بەلآم کاتێك لە پێشبڕکێی تۆر دو پۆنت دا سەرکەوتنم بەدەستهێنا،

لایەنگرانی وەرزشی پاسکیلسواری ئاماژەیان بە خاڵێکی سەرنجڕاکیش کرد: هەموو جارێك کە لە پێشبڕکێیەکدا سەرکەوتنم بەدەست دەهێنا، کاتێك لە هێڵی کۆتایە دەپەڕیمەوە، توند دەستەکانم مشت دەکرد و بەرزم دەکردنەوەو دەمهێنانەوە خوارەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی و ورووژانی خۆم لەسەر پاسیکلەکە، زۆر ماندوو بووم، چاوەکانم سووڕ هەڵگەڕابوون و دەموچاوم ئاوسابوو.

ئاساییە کە دەبوو بەو سەرکەوتنە دیارانە لە وەرزی بەهاردا، دڵخۆش و پڕ لە وزە بومایە، بەڵام بە پێچەوانەوە، تەنیا هەستم بە ماندوێتی دەکرد. گۆپکەی مەمکەکانم دەکزایەوە. ئەگەر ئەو کات زانیاری زیاترم هەبایە، تێدەگەیشتم کە ئەمە نیشانەی نەخۆشییە. ئەم نیشانەیە بە واتای ئەوە بوو کە لەشم بڕێکی زۆر هۆرمۆنی ئێچ.سی.جی (HCG Hormone) دەردەدات کە هۆرمۆنێکە بەشێوەی ئاسایی لە ژنانی دووگیاندا دروست دەبێت. بڕێکی کەم لەم هۆرمۆنە لە پیاواندا هەیە، مەگەر ئەوەی کە گونەکانیان بەشێوەی ئاسایی کاری خۆیان ئەنجام نەدەن.

توانای لەشم کەم بووبۆوە، پێموابوو چی دی ئەو وزەیەم نییە تا درێژە بە کارەکەم بدەم. بە خۆم وت: چیتر هەرگیز ئەم قسە شوومە بە زمانتدا نەیەت.. تۆ نابێت ماندوێتی چۆکت پێدابدات. دوو پێشبڕکێی زۆر گرنگ و چارەنووسسازی وەرزم لە پێش بوو: تۆردۆفرانس و یارییەکانی ئۆڵمپیك لە ئاتلانتا. کاتێکی زۆرم بۆ ڕاهێنانەکانی خۆ ئامادە کردن بۆ ئەم پێشبڕکێیانە تەرخان کردبوو، هەموو ئامانجم ئەوە بوو کە لەم

پێشبڕکێیانەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنم.

دوای تێپەڕبوونی تەنیا پێنج ڕۆژ، لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس دوورخرامەوە. بەدرێژایی ماوەی پێشبڕکێکە، بەتوندی بای دەهات و بارانی بەخوریش دەباری، هەر لەبەر ئەم هۆیە تووشی هەڵامەت و ئازارێکی زۆری قورگ بووم. بەردەوام دەکۆکیم و ئازارێکی سەیر لە بەشی خوارەوەی پشتم دروستت بووبوو، بەجۆرێك کە نەمدەتوانی بە ئاسانی لەسەر پاسکیلەکەم دانیشم. سەبارەت بە سەرنەکەوتنم لە پێشبڕکێکاندا بە هەواڵنێرەکانم وت: "نەمدەتوانی هەناسە هەڵمژم."

لە "ئاتلانتا"ش دیسان لەشم تووشی کێشە بۆوە. لە پێشبڕکێکانی ریکۆرد وەرگرتندا (تایم تریال Time Tr)دا، پلەی شەشەم و لە مەودا دووردا، پلەی دوانزەهەمم بەدەستهێنا. بەگشتی ئەنجامێکی باش دیاربوو، بەڵام لە چاو ئەوەی کە چاوەڕوانیم لە خۆم هەبوو، بەڕاستی بێ هیواکەر بوو.

گەڕامەوە ماڵ. بە خۆم وت تەنیا ئەنفلۆوەنزایەکە و هیچی دی. بێ حەواس بووم و زیاتر لە رادەی ئاسایی دەخەوتم... کەمێکیش هەستم بە کوتران دەکرد، بەڵام گرنگیم پێ نەدەدا و پێموابوو بەهۆی ئەو راهێنانە قورسانەی ئەم وەرزەوەیە وام لێهاتووە.

ڕۆژی هەژدەی سێپتەمبەر، یادی بیست و پێنج ساڵەی لەدایکبوونم کردەوە، چەند شەو دواتر هەموو هاوڕێیانم بۆ میوانداریەك و چوون بۆ کۆنسێرتی جیمی بافیت، بۆ ماڵەوە داوەتم کرد. لەبیرمە ئەو شەوە، بۆ

ئەوەی خواردنەوەی فێنکمان هەبێت، ئامێرێکی مارگاریتا ( Margaita Machine)م بەکرێ گرت. دایکم بۆ بەشداری لەم میوانییەدا، لە شاری پلانۆ (Plano)وە هاتبوو بۆ ماڵەکەی من. لە نێو ڕێوڕەسمی خۆشی و میوانییەکەدا، سەیری ئەوم کرد و وتم: "من خۆشبەختترین پیاوی دنیام." ئەویندارانە دایکمم خۆش دەویست. من لەو سەردەمەدا پەیوەندییەکی دۆستانەم لەگەڵ یەکێك لە کچە جوانەکانی زانکۆی تەکساس هەبوو کە ناوی لیزا شیلز (Lisa Shiels) بوو، بەو دواییانەش گرێبەستێکی نوێی دوو ساڵەم بە بڕی ٢,٥ ملیۆن دۆلار لەگەڵ یەکێك لە بەناوبانگترین یانەکانی فەڕەنسا، بە ناوی کۆفیدیس (Cofidis) واژۆ کردبوو. خانوویەکی تازە دروستکراوی گەورەم هەبوو کە چەند مانگ بە دروستکردنییەوە خەریك بووم، خانوەکە بەجۆرێك بوو کە هەموو وردەکاریی بیناسازی و دیزانی ناوەوەی، ڕێك بە پێی خواست و زەوقی خۆم بوو. خانووێك بوو لەسەر مۆدێلی مەدیتەرانەیی، لەسەر ڕۆخی دەریاچەی ئاستین بوو، چەندین پەنجەرەی شوشەیی گەورەی هەبوو کە لە بەردەمەکەیدا مەلەوانگەیەك و حەوشێکی گۆڕەپان ئاسای هەبوو کە لە کۆتاییەکەیدا حەوزێکی بچکۆلانە هەبوو. جێتی ئیسکی و پاپۆڕە ماتۆڕییەکەی منیش لە ناو ئەویدابوو.

ڕووداوێکی نەخوازراو، ئەو شەوە جوانەی لێ ناخۆش کردین: بۆ ساتێك لە نێو کۆنسێرتەکەدا هەستم بە ژانە سەر کرد. بە هێواشی دەستی پێکرد.. چەند دانە ئاسپرینم خوارد، سوودی نەبوو. حەبی "ئیبۆپرۆفین"یشم تاقی کردەوە، بەڵام هیچ دەوری نەبوو، تا دەهات

ئازارەکە زۆرتر دەبوو. لام وابوو رەنگە بە هۆی خوارنەوەی زۆری ئەو خواردنەوە فێنکەکانەوە بێت کە لە میوانییەکە خواردمەوە. بۆیە بڕیارمدا ئیتر هیچکات، تەنانەت یەك قومیش لەوانە نەخۆمەوە. بیل ستاپلتۆن (Bill Stapleton) کە هەم پارێزەر و هەمیش هاوڕێی هەمیشەییم بوو، بڕێك لە دەرمانەکانی نەخۆشی لاژانە سەری "لۆرا"ی هاوسەری پێدام. سێ دانەم خوارد، بەڵام هیچ دەوری نەبوو. لەو ساتەوە، ژانە سەرەکەم وەك ئەوەی لێهاتبوو کە لە فلیمە سینەماییەکاندا دەبینن: ئەژنۆکانم وێکهاتبوونەوە، هەردوو دەستم بە سەرمەوە گرتبوو، مێشکم خەریکبوو دەتەقی!

دواجار چۆکم دادا و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. هەموو گلۆپەکانم کوژاندنەوە و لەسەر قەنەفەیەك پاڵ کەوتم و جووڵەم لێبڕا... ئازار بۆ ساتێکیش وازی لێنەدەهێنام و ئۆقرەی لەبەر بڕیبووم. وەزاڵە هاتبووم، بەڵام بە هەموو ئەمانەوە، دواجار خەوم لێکەوت.

سبەینێ بەیانییەکەی کە لەخەو هەستام، باسێك لە سەرئێشە نەبوو. کاتێك بەرەو چێشخانە(متبەق) ڕۆشتم تا کەمێك قاوە دروست بکەم، هەستم کرد ناتوانم بە ڕوونی ببینم و شتەکان بە باشی لێك جیا بکەمەوە. بیرم کردەوە رەنگە خەریکە پیر دەبم، رەنگە پێویستم بە چاویلکە بێت...

بۆ هەموو شتێك بیانوویەکم هەبوو.

چەند ڕۆژێك دواتر، لە ژووری دانیشتن بە تەلەفۆن لەگەڵ "بیل

ستاپڵتون"دا قسەم دەکرد کە لە پڕ هورووژمی کۆکە یەك لەدوای یەکەکان، نەیهێشت درێژە بە قسەکانم بدەم.. دەستم بە دەممەوە گرت، لە قورگمدا هەستم بە تامێکی سوێری ناخۆش کرد. بە "بیل"م ووت: "خولەکێك بوەستە. لێرە خەریکە ڕووداو گەلێکی سەیر دەقەومێت.."

رامکرد بۆ گەرماو، لە دەستشۆرەکەدا کۆکیم. لەگەڵ کۆکەکانمدا پەڵەی خوێن دەهاتەدەر، دیسان کۆکیم، دیسان بڕێکی زۆر خوێن لە دەممەوە هاتەدەر. نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەم کە بڕێکی ئاوا زۆر خوێنی دەڵەمە لە لەشمەوە دێتەدەر.

ترسابووم، گەڕامەوە ژوورەکە، تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و بە "بیل"م وت: "خۆم پەیوەندیت پێوە دەکەم." خێرا پەیوەندیم بە هاوسێ و هاوڕێی باش و پزیشکی شەخسییەکەم، واتە دکتۆر "ریك پارکەر" (Dr. Rick Parker)ەوە کرد.

وتم: "دەتوانی تا ئێرە بێت؟ خوێن لە قورگمەوە دێت.."

تا "ریك" هات، دووبارە گەڕامەوە بۆ حەمام و پاشماوەکانی خوێنەکەم لە دەستشۆرەکەدا بینی. بێ ئەوەی بمەوێ بەلوعەی ئاوەکەم کردەوە. دەمویست بە ئاو بیانشۆمەوە. هەندێکجار کارگەلێك دەکەم کە هەر بەڕاستی نازانم بۆ ئەو کارانە دەکەم.

نەمدەویست "ریك" ئەو پەڵە خوێنانە ببینێت. چونکە بە بینینی ئەو دیمەنە، منی پەرێشان دەکرد و سەرم لێدەشێوا. حەزم نەدەکرد ئەم بابەتە، زۆر گەورە ببێت.

"ریك" هاته ژوور، لووت و قورگی منی بینی. به لایتێکی بچووك، پشکنینی بۆ قورگیشم کرد، داوای لێکردم تا پەڵە خوێنەکانی پیشان بدەم. ئەو برە کەمەم پیشان دا کە لە دەستشۆرەکەدا مابۆوە. بیرم کردەوە... خوایە! من ناتوانم پێی بڵێم چەندەم خوێن لێرە پاك کردۆتەوە. زۆر ناخۆش بوو. ئەوەی مابۆوە زۆر نەبوو.

ریك، پێشتر چەند جارێك لە منی بیستبوو کە بە دەست جیوب و هەستیارییەکانی دیکەی لەشمەوە سکاڵام کردبوو. شاری ئاستین، پڕ بوو لە هەڵاڵەی رووەکەکان و هەر بۆیە زۆر ئازاری دەدام. لە لایەکی دیکەوە بەهۆی رێگرییە یاساییەکانی بەکارهێنانی وزەبەخشەکانەوە، نەمدەتوانی دەرمانی دژە هەستیاریش بەکار بهێنم. بەهەر حاڵ ناچار بووم بەرگەی ئەو ئازارە بگرم.

ریك پێی وتم: "رەنگە خوێن بەربوونەکەت لە جیوبەکانەوە بووبێت."

پێموت: "زۆر باشە، کەواتە شتێکی گرنگ نییە.."

کە لە یەکەم قسە و سەیرکردنی "رێك"ەوە زانیم کێشەیەکی تایبەتم نییە، لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ بووم، لە خۆشیان حەجمینم نەبوو، هەر هەڵبەز دابەزم بوو.. ئەو کەرەستەکانی کۆکردەوە. تا بەر دەرگایماڵەوە بەرێم کرد. کاتی خواحافیزی، منی بۆ ئێوارە خوانێك لە حەفتەی داهاتوودا دەعوەت کرد.

چەند شەو دواتر، سواری ماتۆڕەکەم بووم بچم بۆ ماڵی ریك پارکەر. بەسەربردنی کات بەو ماتۆڕە، یەکێك لە سەرگەرمییەکانی من بوو کە زۆرم

حەز لێی بوو. بەڵام ئەو شەوە، گونی لای ڕاستم ئازارێکی زۆری هەبوو، بەجۆرێك کە کاتی دانیشتن لەسەر ماتۆڕەکە لەتاو ئازار حەزم دەکرد بمرم! لەسەر مێزی ئێوارە خوانەکەش هیچ ئاسوودە نەبووم، ناچار بووم خۆم بە لایەکدا خوار بکەمەوە تا ئازارەکە کەم ببێتەوە و لە جێی خۆم نەجولێم.

بەڕاستی بەئازار و دژوار بوو.

پێشتر سەبارەت بەم ئازارە لەگەڵ ریك قسەم کردبوو، بەڵام زۆر شەرمن بووم و نەمدەویست دیسان وەك بابەتی کۆکە خوێناوییەکان دەردە سەری بۆ بنێمەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، کێشەکانی منیش بابەت گەلێك نەبوون کە بتوانم لەسەر سفرەی ئێوارە خوانەکە، بە ئاسانی لە بارەیانەوە بدوێم.. پێموابوو ئەگەر باسی ئەم ئازارەش بکەم، ئەو لە دڵی خۆیدا دەڵێت: ئەم پیاوە، بەردەوام خەریکە ناڵە ناڵ و پرتەو بۆڵە کردنە. هەر بۆیە ئازارەکەم تەحەمول کرد و هەر باسیشم نەکرد.

بەیانی ڕۆژی دواتر، کە لەخەو هەستام، بینیم لا گونەکەم بە شێوەیەکی ترسناك ئاوساوە و تۆ بڵێی بە ئەندازەی پرتەقاڵێکی لێهاتبوو. جلەکانم لەبەر کرد، سوار پاسکیل بووم و دەستم بە ڕاهێنانی ڕۆژانە کرد. بەڵام هەستم کرد تەنانەت ناتوانم لەسەر کوشنەکەش دانیشم. هەموو ڕێگاکە بە پێوە پایدەرم لێدا. دوانیوەڕو کە گەڕامەوە بۆماڵەوە، بەپێچەوانەی خواستی خۆم، دووبارە پەیوەندیم بە "پارکەر"ەوە کرد.

پێمووت: "ریك، حاڵەتێکی نائاسایی لە گونمدا دەبینم.. هێندە

ئاوساوە کە ناچارم بە پێوە پاسکیلسواری بکەم."

ریك لە وەڵامی قسەکانی مندا زۆر بە جددی وتی: "پێویستە خێرا پشکنینت بۆ بکرێت و تاوتوێیەکی وردی باری تەندروستیت بکرێت."

ئەو پێداگری کرد کە دوانیوەڕۆ من ببات بۆ نۆرینگەی پزیشکێکی پسپۆڕ. دواتی تەواو بوونی قسەکانمان، ریك پەیوەندی بە یەکێك لە پسپۆڕە دیارەکانی ئورۆلۆژی (Urologist)ی شاری "ئاستین"ەوە کرد کە ناوی دکتۆر جیم ریڤز (Dr. Jim Reeves)ە. هەر کە نیشانەکان و بارودۆخی منی بۆ ئەو باس کرد، دکتۆر ریڤز وتی، دەبێ خێرا بچم بۆ ئەوێ. ئەو سەرەیەکی بەتاڵم بۆ دادەنێت. ریك پێی وتم، ریڤز ئەگەری ئەوە دادەنێت من تەنیا تووشی سووڕان یان گرژ بوونی هێلکە گون بووبێتم، بەڵام دەبوو سەردانی نۆرینگەکەیم بکردبایە تا پشکنینی تەواوەتیم بۆ بکات. ئەگەر کەمتەرخەمی بکەم، ڕەنگە گونم لەدەست بدەم.

چوومە حەمام، جلەکانم گۆڕی، کلیلەکانم هەڵگرت و سوار "پورشە"کەم بووم. رەنگە سەیر و لەوانەشە گاڵتەجاڕانە بێتە پێش چاو، بەڵام ریك لەبیرمە چیم لەبەر کردبوو: پانتۆڵێکی رەنگ خۆڵەمێشی و بلوزێکی سەوز. نۆرینگەکەی دکتۆر ریڤز لە ناوەندی بازرگانی شار، نزیك حەوشەی زانکۆی تەکساس، لە نێو باڵەخانەیەکی پزیشکی گەورەی بە خشتی قاوەی دروستکراودا بوو.

ریڤز، پیرەمێردێکی خاوەن کەسایتی بوو. دەنگێکی کز و لەزرۆکی

هەبوو، بەجۆرێك كە وەك بڵێی لە بنكی چاڵەوە دەیبیستی. وەك هەموو پزیشكەكانی دیكە هەوڵی دەدا بە ئارامییەكی تایبەتەوە رەفتار بكات و هەموو شتێك بە سروشتی پیشان بدات. لەگەڵ ئەوەشدا لەكاتی پشكنین و سەیر كردنی لەشمدا، زۆر هەراسان و نیگەران بوو بوو.

قەبارەی هێلكەگونەكەم سێ هێندەی قەبارەی سروشتی خۆی لێهاتبوو، كە دەستی بەركەوتبایە زۆر رەق و بە ئازار بوو. ریڤز، تێگەیشتنەكانی خۆی لەسەر كاغەز نووسی و پێی وتم: "كەمێك گوماناوی دیارە. تەنیا لەبەر دڵنیابوون، دەتنێرم بۆ تاقیگەكەی ئەوبەر شەقامەكە تا سۆنەرت بۆ بگرن."

جلەكانم لەبەر كردەوە و رۆشتم. تاقیگەكە لە باڵەخانەیەكی پزیشكی دیكە و لەوبەر شەقامەكە بوو. نێو تاقیگەكە ئامێری پزیشكی ئاڵۆز و جۆراوجۆری لێبوو. لەسەر قەرەوێڵەیەكی تایبەت درێژ بووم. پسپۆڕی تاقیگەكە هات و بە ئامێرێكی تایبەت كە بە مۆنیتەرێكەوە بەسترابوو و وێنەكانی دەگواستەوە، بە بەشە جیاوازەكانی لەشمدا دەگەڕا. مەزندە ئەوەم دەكرد پشكنینێكی سادە و رۆتینی بێت كە دكتۆر ریڤز بۆ دڵنیایی زیاتر بە باشی زانیوە ئەو پشكنینەشم بۆ بكرێت.

كاتژمێرێك تێپەڕی و هێشتا من هەر لەسەر قەرەوێڵەكە بووم..

وەك بڵێی، ئەو پسپۆڕە، خاڵ بە خاڵی لەشم دەگەڕا! بە بێدەنگی پاڵ كەوتبووم. بۆچی هێندەی خایاند؟ ئایا شتێكی تایبەتی بینیوە؟ ئاخرەكەی تەواو بوو. ئامێرەكەی خستە لایەك و بێ ئەوەی یەك وشەش

بڵێت، ژوورەکەی جێهێشت.

وتم: "کەمێك بوەستە، خاتوون..."

پێموابێت ئەم جۆرە رەفتارە یەکێك لە شێواز و خووە نابەجێکانی ئەوان بوو. دوای ماوەیەك، لەگەڵ ئەو پیاوەدا گەڕایەوە کە لەکاتی چوونمدا بینیبووم. ئەو سەرۆکی بەشی تیشکناسی تاقیگەکە بوو. ئامێرە تایبەتەکەی سۆنەری هەڵگرت و خۆی دەستی بە پشکنین کرد. بە بێدەنگی پاڵ کەوتبووم، ئەویش ١٥ خولەك خەریکی گەڕان و پشکنین بوو. بەردەوام پرسیارم لە خۆم دەکرد: بۆچی هێندەی خایاند؟

سەرۆکی تاقیگەکە وتی: "زۆر باشە دەتوانی جلەکانت لەبەر بکەیتەوە."

خێرا جلەکانم لەبەر کرد و چوومە راڕەوی هاتنە ژوورەوە تا ئەو ببینم.

ئەو وتی: "ئێمە پێویستە، تیشك لە سنگت هەڵگرینەوە."

بە سەرسوڕمانێکەوە لێمڕوانی و وتم: "بۆچی؟!"

لە وەڵامدا وتی: "دکتۆر ریڤز، داوای کردووە."

بۆچی دەبوو تیشك لە سنگم هەڵگرنەوە؟ خۆ سنگم ئازار و کێشەی نەبوو.. چوومە ژوورێکی دیکە، پسپۆڕێکی دیکە هات بۆ هەڵگرتنەوەی تیشك و کارەکەی ئەنجام دا.

ترسابووم، بەرەبەرە خەریکبوو تووڕەش دەبووم.. دیسان چووم بەرەو

لای ژووری سەرۆکی تاقیگەکە. لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا چاوم بە سەرۆکی بەشی تیشکناسی کەوت.

پێکەوە چووینە سوچێکی ژوورەکەی و دانیشتین. پێمووت: "چی ڕوویداوە؟ ئەنجامەکان ئاسایی نین؟"

وتی: "پێویستە دکتۆر ریفز قسەت لەگەڵ بکات."

- "نا! من هەر ئێستا دەمەوێ بزانم چی ڕوویداوە؟"

"زۆر باشە، نامەوێ دەست لە کاری دکتۆر ریفز وەردەم، بەڵام وادیارە ئەو خەریکی ئەنجامدانی کۆمەڵێك پشکنینە تا بزانێت ئایا لە لەشی تۆدا لووی شێرپەنجەیی هەیە یان نا..."

بەهێواشی لە شوێنکەی خۆم هەستامە سەر پێ و وەك دار لە شوێنی خۆمدا وشك بووم..

لەبەر خۆمەوە وتم: تف لەم شانسە.

"تۆ پێویستە ئەنجامەکانی تیشك و سۆنەرەکە ببەیتەوە بۆ لای دکتۆر ریفز. ئەو لە نۆڕینگەکەی چاوەڕوانی تۆیە."

نیگەرانییەکی سەیر دایگرتم و تا دەهات زیاتر دڵم دەگوشرا. موبایلەکەم دەرهێنا و تەلەفۆنم بۆ ریك کرد.

"ریك! لێرە خەریکە شتی سەیر ڕوو دەدات.. هەموو شتێکم پێ ناڵێن..."

"لانس، من بەتەواوی نازانم چی روویداوە.. بەڵام حەز دەکەم پێکەوە بچین بۆ لای دکتۆر ریفز. وا باشترە لەوێ یەکتر ببینین."

وتم: "زۆر باشە.."

لە بەشی تیشکناسی دانیشتبووم، چاوەڕوان بووم تا بەڵگەنامە و تیشکە وێنەکانم ئامادە بکەن. دواجار پسپۆڕی بەشەکە هات و زەرفێکی رەنگ قاوەیی گەورە دایە دەست من و وتی: "دکتۆر ریفز لە نۆڕینگەکەی خۆی، دەیبینێت." سەیرێکی نێو زەرفەکەم کرد، تیشکە وێنەکانی سنگمی تێدابوو. دەمزانی.. بارودۆخ باش نییە. سوار ئوتۆمبێلەکەم بووم، دیسان سەیرێکی هاکەزایی نێو زەرفەکەم کردەوە. نۆڕینگەکەی دکتۆر ریفز زۆر دوور نەبوو، بەڵام پێموابوو دەبێ چەند فەرسەخ رێگا ببڕم تا بگەمە ئەوێ.

ماوەیەکی کەم بە ئوتۆمبێلەکە رۆشتم و گەیشتمە ئەوێ. ئوتۆمبێلەکەم راگرت. هەوا تاریک بوو.. لەکاتی کاری فەرمی نۆڕینگەکەش لای دابوو. ئەگەر دکتۆر ریفز ئەو هەموو کاتە چاوەڕوانی منی کردووە، بێگومان هۆکارێکی هەیە.

کاتێک بەرەو نۆڕینگەکەی دکتۆر ریفز چووم، تێگەیشتم بیناکەی چۆڵە. هەمووان رۆشتبوون، هەموو شوێنێك کش و مات و هەواش تەواو تاریك بووبوو. "ریك" گەیشت، نیگەرانی بە روخسارییەوە دیار بوو.. لەو کاتەدا کە دکتۆر ریفز سەیری تیشکە وێنەکان و سۆنەرەکانی دەکرد، منیش بێتاقەت لەسەر کورسییەکە دانیشتبووم و نووشتابوومەوە بۆ پێشەوە.

تیشکە وێنە لە فیلمی وێنەگری دەچێت: لەودا نارێکییەکان بە رەنگی سپی دەردەکەون. وێنەیەکی رەش باشە، چونکە نیشانەی ئەوەیە کە هەموو ئەندامەکانی لەش ساغن. رەش باشە و سپی خراپ!

دکتۆر ریفز، تیشکە وێنەکەی سنگمی خستە سەر ئەو گڵۆپە تایبەتەی کە لەسەر دیواری تەنیشت خۆی جێیکردبۆوە.

سنگم وەك دیمەنی کرێوەی بەفر وابوو..

دکتۆر ریفز وتی: "ئەمە بارودۆخێکی قەیراناوییە. بەڵگە و نیشانەکان، ئەوەمان پیشان دەدەن کە تۆ تووشی شێرپەنجەی گون بوویت و تەنانەت سییەکانیشتی گرتۆتەوە."

من تووشی شێرپەنجە بووم..

وتم: "تۆ دڵنیایت؟"

ریفز وەڵامی دایەوە: "تاڕادەیەك دڵنیام."

من تەمەنم تەنیا بیست و پێنج ساڵە.. چۆن دەکرێت تووشی شێرپەنجە بووبێتم؟

پرسیم: "ئایا نابێت لەگەڵ چەند پسپۆڕێکی دیکەشدا راوێژ بکەم و بۆچوونی ئەوانیش وەرگرم؟"

دکتۆر ریفز وەڵامی دایەوە: "بێگومان. تۆ مافی خۆتە هەر کارێك بە باشی دەزانی، بیکەیت. بەڵام من بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە پێت بڵێم، لە

قسەکانی خۆم دڵنیام. سبەینێ کاتژمێر حەوت، کاتێکم بۆ دیاری کردووی تا بە نەشتەرگەری، ئەو گونەت بۆ دەربێنم کە گومانی شێرپەنجەی لێدەکرێت."

من تووشی شێرپەنجە بووم... تەنانەت سییەکانیشمی گرتۆتەوە.

دکتۆر ریڤز، سەبارەت بەم نەخۆشییە، بەوردی باسی هەندێك شتی کرد: شێرپەنجەی گون یەکێك لە جۆرە دەگمەنەکانی شێرپەنجەیە کە زیاتر پیاوانی تەمەن ١٨ بۆ ٢٥ ساڵ تووشی دەبن. ساڵانە لە ئەمریکا تەنیا ٧٠٠٠ حاڵەت دەبیندرێت و بەو پێشکەوتنانەی ئەم دواییانە لە بەرهەمهێنانی دەرمانە کیمیاییەکاندا، تا رادەیەکی زۆر چارەسەری بۆ دۆزراوەتەوە، بەڵام زوو پێزانین و دەستوبرد لێکردنی، لە گرنگترین هۆکارەکانی چاك بوونەوەن. دکتۆر ریڤز لەوە دڵنیابوو کە من تووشی شێرپەنجە بووم، بۆیە پرسیاری گرنگ لای ئەو تەنیا ئەوە بوو کە چەندە بڵاو بۆتەوە؟ ئەو جەختی لەوە کردەوە کە من چاوم بە دکتۆر "دودلی یومان" (Dr. Dudley Yuman) بکەوێت، کە یەکێك لە پسپۆرە زۆر باشەکانی شێرپەنجەناسی (Oncologist) شاری "ئاستین" بوو. نابێت کات بە فیڕۆ بدەین.. هەموو چرکەیەك دەورێکی زۆر گرنگ دەبینێت. دکتۆر ریڤز کۆتایی بە قسەکانی هێنا.

من بێدەنگ بووم و هیچم نەدەووت.

دکتۆر ریڤز وتی: "وا باشترە چەند خولەکێك ئەو دووانەتان بە تەنیا جێبهێڵم."

تەنیا من و ریك ماینەوە.. سەرم خستە سەر مێزەکە و وتم: "ناتوانم باوەڕ بکەم.." بەڵام دەبوو قبوڵی بکەم، من نەخۆش بووم. ژانە سەرەکان، کۆکە و خوێن هێنانەوە، هەوکردنی قورگ، فێ لێهاتن و لەهۆش خۆ چوون لەسەر قەنەفەکان... هەموو ئەمانە پێشاندەری ئەوە بوون کە من نەخۆشم. من هەر بەڕاستی هەستم بە نەخۆشی دەکرد و زۆر لەمێژیش بوو ئەم هەستەم هەبوو.

"لانس! کەمێك گوێم بۆ بگرە.. شێوازەکانی چارەسەر کردنی شێرپەنجە، پێشکەوتنی زۆریان بەخۆیانەوە بینیوە. لەم بوارەدا، خەریکە لێکۆڵینەوەی زۆر دەکرێت و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش لە فراوانبووندایە.. هەر جۆر و لە هەر قۆناغێکدا بێت، چارەسەری هەیە. ئێمە ڕووبەڕووی دەبینەوە، پەلاماری دەدەین و دواجار شکستی پێدەهێنین."

ریك، بانگی دکتۆر ریڤزی کرد.

لێم پرسی: "ئێمە چی بکەین؟ وەرن دەست پێبکەین. هەرچی پێویستە بیکەن."

دەمویست خێرا چارەسەری بۆ بدۆزنەوە. بە پەلە و بێ دواکەوتن! حەزم دەکرد هەر ئەو شەوە، نەشتەرگەریم بۆ بکرێت. گەوجانە هەڵسوکەوتم دەکرد و دەمەویست خێرا کۆتایی بە هەموو ئەو ڕووداوانە بێنم. بەڵام ریڤز بە حەوسەڵە و پشوو درێژییەکی تەواوەوە، قۆناغەکانی سبەینێی ڕوون کردەوە: دەبوو بۆ ئەنجامدانی کۆمەڵێك پشکنین، کەمێك زووتر بچوومایە بۆ نەخۆشخانە تا لەسەر بنەمای ئەنجامەکان، پزیشکی پسپۆڕی

شێرپەنجە بۆی دەرکەوتبایە کە شێرپەنجەکە چەندە بە لەشمدا بڵاو بۆتەوە و پاشان نەشتەرگەریم بۆ بکرێت و گونم دەربێنن.

هەستام بڕۆم. دەبوو پەیوەندی بە زۆر کەسەوە بکەم. یەکێك لەو کەسانە دایکم بوو. دەبوو هەر چۆنێك بووە، پێمبووتبایە کە کوڕەکەی، تاقە منداڵەکەی، تووشی شێرپەنجە بووە.

سوار ئوتۆمبێلەکەم بووم و بەرەو ماڵەوە کەوتمە رێ کە لەسەر رۆخی رووبار بوو. ئەمە لە هەموو تەمەنمدا یەکەم جار بوو کە بەهێواشی ئوتۆمبێلم لێدەخوڕی. زۆر تاسابووم. ئەی خوایە! من بەم زووانە دەمرم، من هەرگیز ناتوانم ببمە خاوەنی خێزان.. ئەمانە ئەو خەیاڵانە بوون کە لەو دۆخە پەریشان و ئاڵۆزەدا بە بیرمدا دەهاتن. بەڵام ناخۆشترینی ئەو خەیاڵاتە کە وەك پیکێك بەر تەپلی سەرم دکەوت، ئەوە بوو کە چیدی ناتوانم بەشداری پێشبڕکێکان بکەم. تەلەفۆنی ئوتۆمبێلەکەم هەڵگرت و پەیوەندیم بە "بیل ستاپیلتۆن"ەوە کرد.

وتم: "بیل، من هەواڵی ناخۆشم لایە.."

بە نیگەرانییەوە پرسی: "چی روویداوە؟"

"من نەخۆشم.. ئیدی هاتوومەتە کۆتایی ریگاکە."

"چی؟!"

"هەموو شتەکە ئەوەیە و تەواو. من نەخۆشم.. ئیدی هیچ کات ناتوانم لە پێشبڕکێکاندا بەشداری بکەم. خەریکە هەموو ژیانم دەفەوتێت، خەریکە هەموو شتێك لەدەست دەدەم.."

وڕ و گێژ، بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت، بە گێژی یەك دەڕۆشتم، تەنانەت بێ ئەوەی وزەی ئەوەم تێدا بێت کە پێ بە بەنزینیشدا بنێم. لەکاتی لێخوڕیندا، لەنێو مێشکە ئاڵۆزەکەمدا، هەموو شتێکم دەخستە ژێر پرسیارەوە: دنیا جوانەکەم، پیشەکەم، بوونم. کاتێك لە ماڵ چوومە دەر، لاوێکی تەمەن بیست و پێنج ساڵی بەوزە و بەهێز بووم، بەڵام ئێستا! شێرپەنجە هەموو شتەکانی گۆڕیوم.. دەمزانی. تەنیا نابێتە هۆی ئەوەی کە من نەتوانم ببمە پاڵەوان، بەڵکو پێناسەی ئەوەش دەگوڕێت کە هەبووم. من لە هیچەوە دەستم پێکرد تا گەیشتمە ئێرە. دایکم لە شاری پلانۆی تەکساس سکتێرەیەك بوو، ژیانێکی سادەمان هەبوو.. بە پاسکیلسواری بەم ئاستە گەیشتم. دوای قوتابخانە، کاتێك کە هەموو هاوڕێکانم بۆ مەلەکردن دەچوونە یانەی شار، من بەسەر پاسکیلەوە، چەندین میل، پایدەرم لێدەدا، چونکە وەك شانس و هەلێکی تایبەت لە ژیانمدا لەوم دەڕوانی. بۆ هەر سەرکەوتنێك، چەندەم هەوڵ دەدا و چەندەم ئارەقە دەڕشت، چ بیرەوەری گەلێکی شیرین و خۆش لە بیرەوەریمدا دەمانەوە و چ ماڵ و سامانێکم پێکەوە دەنا.. بەڵام ئێستا دەبێت چی بکەم؟ ئەگەر "لانس ئارمسترانگ" پاسکیلسواری ناوداری جیهان، نەبم، ئەی کێ بم؟

کەسێکی نەخۆش.

گەیشتمە ماڵەوە. دەنگی زەنگی تەلەفۆنەکە دەهات. تەلەفۆنەکەم بەرز کردەوە، هاوڕێکەم، سکۆت میکچێرن (Scott Maceach-ern) نوێنەری کۆمپانیای نایك (Nike Co)، بوو.

"لانس، چۆنی، باس و خەبەر؟"

به توڕەییەوە وتم: "هەواڵی خۆشم لا نییە.. ڕووداوی زۆرم بەسەر هاتووە."

"مەبەستت چییە؟"

"من،..."

.

نەمتوانی درێژە بە قسەکانم بدەم.

بە مەبەستی قسەکردن دەمم کردەوە، بەڵام هەر بەڕاستی نەمدەتوانی. دووبارە هەڵمدایەوە، دواجار وتم: "من شێرپەنجەمە."

دەنگی هەنیسکی گریانم، پەیتا پەیتا بوغزی قورسی بیدەنگی تێکدەشکاند. پاشان لەو کاتەدا، وەك بڵێی لە ئاوەزی ناوشیاوە پێم دەووترا: نەك هەر وەرزش و پاڵەوانەتییەکەم، بەڵکو ڕەنگە هەموو ژیانیشم لەدەست بدەم!

ژیانی دوێنێ، چوارچێوەی ئەمڕۆت دیاری دەکات. رابووردوو، ئێوە دروست دەکات، چ بتانەوێ و چ نەتانەوێ، ئەزموونەکان هەمیشە کاریگەری ئەفسووناوی خۆیان هەیە...

گرنگترین شتی سەردەمی منداڵیم کە حەز دەکەم بۆ ئێوەی باس بکەم، ئەوەیە کە من هەرگیز لە ژیانمدا باوکێکی راستەقینەم نەبووە. تا ئەمڕۆش ئاواتی ئەو شتەم نەبووە. دایکم تەمەنی تەنیا ١٧ ساڵ بووە کە منی بووە. هەر لە رۆژی یەکەمەوە، هەمووان دەیانووت، ئێمە هیچمان نابێت بە هیچ. بەڵام ئەو بەشێوەیەکی دیکە بیری دەکردەوە و باوەڕێکی دیکەی هەبوو، منی بە یاسا گەلێکی زۆر باش پەروەردە کرد: "هەموو لەمپەرەکان بکە بە دەرفەت." ئەمە ئەو یاسا بێ وێنەیە بوو کە بەدرێژایی ژیانمان کارمان پێکرد. بەسەرهاتی پڕ هەوراز و نشێوی ژیانم، ئەم قسەیەم دەسەلمێنێت، چونکە بڕوابوون و پابەند بوون بەو بنەما پەروەردەییە بێ وێنەیە بووە هۆی ئەوەی کە بتوانم شێرپەنجە، کە بە بۆچوونی هەندێك کەس ژیان لەنێو دەبات، بگۆڕم بۆ باشترین رووداو و پڕ شانازیترین دەرفەتی ژیانم.

دایکم لە سەردەمی کچێنیدا ناوی، "لیندا مونیهام" ( Linda Mooneyham) بوو. بوونی منداڵێکی وەك من، بەو لەشە گەورەوە، بۆ خاتوونێکی لەش ناسکی تەمەن ١٧ ساڵان، بە شتێکی سەیر و گاڵتەجارانە سەیر دەکرا. ئەو باڵای نزیکەی مەتر و نیوێك و کێشیشی ٤٨

کیلۆ بوو. ناتوانم لەوە تێبگەم کە چۆن کەسێکی ئاوا وردیلە، کەسێکی وەك منی بووە؟ ئاخر لەو کاتەدا، کێشم نزیکەی چوار کیلۆ و نیو بووە. لەدایکبوونم بۆ دایکم هێندە قورس و گران بووە کە دوای ئەوە، دایکم بۆ ماوەی رۆژێك تووشی تایەکی قورس بوو. تاکەی هێندە بەرز بووە کە پەرستارەکان رێی ئەوەیان پێنەدابوو من لای خۆی رابگرێت.

هەرگیز ئەو باوکە وەها وەهایەم بیر نایاتەوە. ئەو هیچ رۆڵێکی لە ژیانی مندا نییە، مەگەر ئەوەی کە بکرێت نەبوونەکەی وەك رۆڵێك سەیر بکرێت. تەنیا لەبەر ئەوەی کە ماددەی بۆماوەیی پێویستی بۆ دروست بوونی من دابین کردووە، ناکرێت ئەو بە باوك بزانم. تا ئەو شوێنەی پەیوەندی بە منەوە هەیە، هیچ پەیوەندییەك لە نێوانماندا نییە. هیچ لەبارەی ئەوەوە نازانم، لە حەز و خواستەکانیشی بێئاگام. تا ساڵی رابووردوو، تەنانەت بە شوێنی کار و ژیانی ئەویشم نەدەزانی.

تا ئێستا هەرگیز سەبارەت بەو پرسیارم نەکردووە.. تەنانەت سەبارەت بەو هیچ قسەیەکم لەگەڵ دایکمدا نەکردووە. دایکیشم لە ماوەی ئەم بیست و هەشت ساڵەدا، هیچ کات باسی ئەوی نەکردووە. رەنگە سەیر بێت، بەڵام راستە. نە من و نە دایکم، گرنگی بەم بابەتە نادەین. ئەو دەڵێت ئەگەر سەبارەت بە باوکت پرسیارت بکردبایە، وەڵامم دەدایەوە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە پرسینی ئەمجۆرە پرسیارانە بەلای من پووچ و بێبەها بوون. دایکم لەناخی دڵەوە خۆشی دەویستم. منیش بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو بۆشاییە سۆزدارییەی کە بەهۆی نەبوونی

باوکمەوە تووشی بووبوو، بەڕادەی ئەو خۆشم دەویست، ئەم پەیوەندییە دوو لایەنەیە بۆ هەردووکمان، هەم بەس بوو هەمیش باش بوو.

مخابن ساڵی رابووردوو، ڕۆژنامەیەك، شوێنپێی باوکمی هەڵگرتبوو، پاش دۆزینەوەی ئەو، وتارێکی بەم ناوەڕۆکەوە لەبارەی ئەوەوە چاپ و بڵاو کردەوە: ناوی "گاندرسن" (Gunderson)ە و لە ڕۆژنامەی بەیانیانی دالاسدا وەك بەڕێوەبەری دارایی کار دەکات. ئەو لە شاری تەکساس و لە نزێك گۆلاوی سیدار کریك (Ceda Creek Lake) دەژی و باوکی دوو منداڵە. دایکم لە سەردەمی دووگیانیدا شووی بەو کردبوو، بەڵام پێش ئەوەی کە من بگەمە تەمەنی دوو ساڵی، لە یەکتر جیا بوونەوە. گاندرسن لەو وتارەدا، شانازی بەوەوە کردبوو کە باوکی منە و هەروەها ئاماژەی بەوەش کردبوو کە منداڵەکانی من بە برای خۆیانی دەزانن. بەڵام ئەو بە باسکردنی ئەم قسە و باسانە، دەیویست کەڵکی خراپ لە پێگەوە و ناوبانگی من وەربگرێت. من هیچ جەز ناکەم بیبینم و پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبێت.

دایکم تەنیا بوو.. دایك و باوکی لە یەکتر جیا بووبوونەوە. لەو کاتەدا باوکی، واتە پاول مونیهام (Paul Mooneyham)، پزیشکێکی بەیتەری ڤێتنامی بوو، کە بەقورسی خووی بە خواردنەوەی کحولەوە گرتبوو، لە نوسینگەیەکی پۆستەدا کاری دەکرد و لە ماڵێکی گەڕۆکدا دەژیا. لەبەر ئەم هۆکارە، "ئەلیزابێت"ی نەنکم ناچاربوو بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە ئاگاداری منداڵەکانی بێت و پەروەردەیان بکات.

لەنێو خزم و ناسیاوەکانماندا، کەس نەیدەتوانی یارمەتییەکی ئەوتۆی دایکم بدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەردەوام هەوڵیان دەدا یارمەتی بدەن. کاتێك لەدایك بووم، باپیرم، بەتەواوی وازی لە مەی خواردنەوە هێنا و تا ئێستاش ماوەی ٢٨ ساڵە دەمی بۆ نەبردۆتەوە. خاڵم کە لە دایکم بچووکترە چاودێری دەکردم. ئەو دواتر وەك نەریتی کۆنی پیاوانی خێزانەکەمان، چووە نێو سوپا و لەو رێگایەوە بژێوی خۆی بەدەست دەهێنا. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا پلەی بەرز بۆوە و بوو بە نەقیب. نیشانەی زۆری بە سنگدا هەڵواسراوە. ئەو و هاوسەرەکەی کوڕێکیان هەیە ناوی "جێسی"(Jesse)یە، من هێندەم خۆش دەوێ هەر لەباس نایات. ئێمە شانازی بە یەکتر دەکەین و هەر بەراستی خۆشحاڵین لەوەی کە سەر بە یەك خێزانین.

ئێمە لە یەکێك لە شارەکانی دەوروبەری دالاس بەناوی ئۆك کلیف (Oak Cliff) لە شوقەیەکی خنجیلە و خۆشدا دەژیاین کە یەك ژووری خەوی هەبوو. لەو کاتەدا دایکم سەرقاڵی تەواو کردنی خوێندنەکەی بوو، بەشێوەی نیو دەوامیش کاری دەکرد. ئەو لە فرۆشگای مریشکی کنتاکی بەرپرسی وەرگرتنی داوا و راسپاردەکان بوو، لەوێ یۆنیفۆرمێکی رەنگ پەمەیی رێ رێی لەبەر دەکرد. هەروەها لەو بەر جادەکەوە، لە سۆپەرمارکێتی کیرۆگر، کاری فرۆشتنی دەکرد. دواتر کارێکی کاتی لە نوسینگەی پۆستەدا پەیدا کرد. بەرپرسی ئەرشیفی پەراوەکان و رێکخستنی نامە گەڕاوەکان بوو. هەر لەو کاتەدا کە دەیخوێند و بە منیش رادەگەیشت، تێکڕای ئەم کارانەی دەکرد. داهاتی ماناگانەی چوارسەد

دۆلار بوو، دوو سەد دۆلاری بۆ کرێی خانوو دادەنا. تێچووی ڕاگرتنی منیش هەموو هەفتەیەك بیست و پێنج دۆلار بوو، بەڵام بە هەموو ئەمانەشەوە، ئەو هەموو پێویستییەکانی من و تەنانەت زیاتر لە پێویستییەکانیشی بۆ دابین دەکردم. دایکم چێژی لە سات بە ساتی ژیان وەردەگرت و لەو باوەڕەدابوو کە ژیان کورتە، کەواتە ئەوەندەی دەکرێت دەبێ دەوڵەمەند و بایەخدار بکرێت.

هەموو شەوێك کتێبی بۆ دەخوێندمەوە. هەرچەند من منداڵ بووم و تەنانەت یەك وشەش لەو کتێبانە تێنەدەگەیشتم، ئەو بە حەز و تاسەیەکی تایبەتەوە ئەم کارەی دەکرد. هیچکات لەوە ماندوو نەدەبوو کە کتێب بۆ من بخوێنێتەوە. دەیووت: "من ناتوانم چاوەڕوان بم تا تۆ کتێب بۆ من بخوێنیتەوە.." بۆیە سەیر نییە کە من لە تەمەنی نۆ مانگیدا دەمتوانی بڕۆم، هەموو کارێکم بەخێرایی ئەنجام دەدا. لە تەمەنی دوو ساڵیدا، شیعرم لەبەر دەخوێندەوە!

دواجار دایکم وەك سکرتێرە و بە مووچەی ساڵانەی دوانزە هەزار دۆلار دامەزرا و توانیمان بگوازینەوە بۆ باڵەخانەیەکی جوان، لە شاری ریچاردسن (Richardson) لە باکوری دالاس. دوای ماوەیەك، دایکم لە کۆمپانیای تەلەفۆناتی ئەریکسۆن دەستبەکار بوو. یەك لەدوای یەك پلەکانی پەیژەی بەختەوەری دەبڕی. ئیدی ئەو تەنیا یەك سکرتێرە نەبوو، بەڕێوەبەرێکی چاودێری بوو، لە هەمووشی گرنگتر ئەوەی کە، ئەو توانی مۆڵەتی کارکردن لە بواری زەوی و زار و خانووبەرەدا بەدەست

بهێنێت. ئەمانە هەمووی ئەو راستیانە بوون کە دەمتوانی لەم کتێبەدا سەبارەت بەو باسیان بکەم. ئەو زۆر چوست و چالاك بوو، هەموانیشی بۆ چالاکی و هەوڵدان هان دەدا. کەچی هێندە لاو دیارە دەڵێی خوشکی منە!

دوای ئۆك کلیف، هەموو لاکانی دیکەی شار بۆ ئەو وەك بەهەشت وابوون. باکووری دالاس بە کۆمەڵەیەکی پێکەوە گرێدارو لە چەندین لادێ و شاری بچووك، تا سنووری ئۆکلاهۆما (Oklahoma) درێژ دەبۆوە. ئەم ناوچانە لە زۆر ڕووەوە، تەواو هاوشێوەی یەکتر بوون. شاری تەکساس، پڕ بوو لە سەیرانگا و شوێنی جوان، بەڵام قوتابخانەی زۆر باشیشی هەبوو، هەروەها ژمارەیەکی زۆر شوێنی کات بەسەربردنی منداڵان و تازە لاوانی لێبوو.

لەوبەر باڵەخانەکەی ئێمەوە، بازارێکی بچووکی لێبوو کە لە کۆتایی ئەو بازارەدا دووکانێکی پاسکیل فرۆشتن بەناوی "ریچارد سن" هەبوو. خاوەنی فرۆشگاکە، ناوی جیم هۆیت (Jim Hoyt) بوو، لاوێکی وردیلە بەڵام قۆز بوو، چاوەکانی زۆر روون و گەش بوون. جیم زۆری حەز دەکرد لە رووی داراییەوە پشتیوانی ئەو پاسکیلسوارانە بکات کە لە چواردەوری دووکانەکەی دەخولانەوە و چاویان دەبڕیە پاسکیلەکانی نێو دووکانەکەی. ئەو هەمیشە بەشوێن ئەو منداڵ و تازە لاوە بەتوانایانەدا دەگەڕا کە تازە دەیانویست بێنە نێو دنیای وەرزشەوە. دایکم هەفتەی جارێك، دەمەو بەیانی، منی دەبردە بازاڕی گەڕەك و کێکی شێوە بازنەی

(دونات)ی گەرم و تازەی بۆ دەکڕیم. ئێمە لە بەرامبەر فرۆشگاکەی "ریچارد سن"دا دەرۆشتین. جیم دەیزانی کە دایکم بە رەنج و مەینەتییەکی زۆرەوە هەوڵ دەدات تا ژیانمان دابین بکات. هەر بۆیە، بەلایەوە سەرنجڕاکێش بوو کە ئەو هەمیشە ڕێك و جوان دەرەکەوێت و جلەکانی منیش هەمیشە جوان و خاوێنن! ئەو ڕێزێکی تایبەتی لە ئێمە دەگرت و لە کڕینی یەکەم پاسکیلیشدا داشکاندنێکی باشی بۆ کردین. ئەو پاسکیلە لە جۆری "شوین ماگ سکرمبلەر" ( Schwinn Mag Scrambler) بوو کە دایکم لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بۆی کڕیم. پاسکیلێکی ناشیرینی قاوەی کە تایەکانی رەنگ زەرد بوو، بەڵام سەرەڕای هەمووی ئەمانە، بەڕاستی ئاشقی بووم. بۆچی هەموو منداڵێکی بچوك، حەز دەکات پاسیکیلی هەبێت؟ لەبەر ئەو ئازادی و سەربەخۆییەی لەودا هەیە. پاسکیل واتە گەڕانی سەربەستانە، بەدوور لە یاسا و چوارچێوەکان و بەدوور لە ئەبێ و نابێی گەورەکان.

دایکم لە ژیانمدا تەنیا یەك شتی پێدام کە زۆرم بەدڵ نەبوو... ئەویش باوەپیارەیەك بوو. ئەو کاتەی تەمەنم سێ ساڵان بوو، دایکم دووبارە لەگەڵ پیاوێك بەناوی "تێری ئارمسترانگ" (Terry Armstrong)دا هاوسەرگیری کرد. تێری، پیاوێکی وردیلانەی سمێڵ پان و درێژ بوو.. هەمیشە راهاتبوو بەوەی کە خۆی لەوەی کە هەیە، بە سەرکەوتووتر پیشان بدات. ئەو ماددە خۆراکی بە سۆپەرمارکێتەکان دەفرۆشت و نموونەی فرۆشیارێکی گەڕۆکی پرۆفیشناڵ بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، لە دابینکردنی خەرجییەکانی ژیاندا یارمەتی دەداین.

ئەو کاتەی کە تێری، بە شێوەی یاسایی منی وەك منداڵی خۆی قبوڵ کرد و ناوی خێزانیمی گۆڕی بۆ ئارمسترانگ، زۆر بچووك بووم. باش ئەو سەردەمەم بیر نایاتەوە. تەنیا ئەوەندە دەزانم کە باوکە ئەسڵییەکەی خۆم، واتە گاندرسن، ئێمەی جێهێشت و ئەرکی باوکایەتی خۆی لەئاست مندا جێبەجێ نەکرد. بۆ ئەوەی تێری بتوانێت قۆناغە یاساییەکانی قبوڵ کردنی من وەك "منداڵی خۆی" ببڕێت، دەبوو ڕەزامەندی گاندرسن بەدەست بهێنێت.. ئەو ڕەزامەندی دەربڕی، هەموو کاغەزەکانی واژۆ کرد و بە هەموو شتێك رازی بوو.

تێری ئارمسترانگ، مەسیحییەکی توندڕەو بوو. خێزانەکەی زۆر حەزیان دەکرد لە چۆنێتی پەروەدەکردن و گەورەکردنی مندا ڕێنمایی دایکم بکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، تێری خۆی ڕەچاوی بابەتە پەروەردەییەکانی نەدەکرد. تووڕە و تەوسن بوو، هەمیشە بە تەمێ کردنی جەستەیی ڕاهاتبوو. ئەو لەبەر شتانێکی بێبەها لێی دەدام. لەبەر کاری منداڵانە، هاروهاجی و دەنگەدەنگ و....

جارێکیان، لە ژووری نوستنەکەم، یەکێك لە چەکمەجەی کەنتۆرەکەم بە کراوەیی جێهێشتبوو، تاکە گۆرەوییەکیشی لێهاتبووە دەر.. کە تێری ئەو دیمەنەی بینی، شووڵە ئەستوور و کۆنەکەی هەڵگرت، منی وەرسووڕاند و چەندانەی قایمی پێداکێشام. بە بڕوای من، بۆ پەروەردە کردن و سزادانی منداڵ، بەکارهێنانی ئەمجۆرە شێوازانە ڕەوا نییە.

بەکارهێنانی شووڵ، شێوازێك بوو کە ئەو بۆ جێخستنی نەزم و نەسەق

و ڕێکوپێکی سوودی لێوەردەگرت. ئەگەر لەکاتی خۆی درەنگتر بهاتبامایەوە بۆ ماڵەوە، شووڵەکەی هەڵدەگرت و بەردەبووە گیانم. ئەم کارە تەنیا لە رووی جەستەییەوە زیانی پێنەدەگەیاندم، بەڵکو لە رووی رۆحی و سۆزداریشەوە منی زۆر ئازار دەدا. هەر لەبەر ئەم هۆکارە، خۆشم نەدەویست.

وەرزشکارە پیشەییەکان، زۆر حەزیان بەوە نییە کە بیر لە رووداوەکانی رابووردوو بکەنەوە، چونکە گەڕانەوە بۆ رابووردوو، لە هەموو پێشبڕکێیەکدا ڕێ لە سەرکەوتن دەگرێت. مادام بە ئامادە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە رکابەرانی ئیتالی و ئیسپانی، خەریکی هەوڵ دەدەیت بە بەرزاییەکی ٦٥٠٠ فوتیدا سەرکەوی، نابێت بیر لە شکستەکانی سەردەمی تازە لاوی بکەیتەوە، بەڵکو پێویستت بە تەرکیز کردنێکی قووڵ و بێگەردە.. دەبێت بە خۆت بڵێی: ئاگرێك بڵێسەی سەندووە کە بۆ هێشتنەوەی پێویستە سووتەمەنی پێویستی بۆ دابین بکەم. "هەر هێزێکی نەرێنی بگۆڕە بۆ هێزێکی ئەرێنی." ئەمە رستەیەك بوو کە هەمیشە دایکم بیری دەهێنامەوە. نابێت هیچ هێزێك بە فیڕۆ بچێت و هیچ هۆکارێك نابێت پشتگوێ بخرێت. پێویستە هەموو گەردوون وەگەڕ بخەیت تا بە کۆتا ئامانجت بگەیت. لەو کاتەدا، تەنانەت ئازاری برینە کۆنەکان یان شوێنەواری شکاوییە کۆنەکانیش دەبنە ئیمتیازێك لە پێشبڕکێدا!

با بگەڕێینەوە سەردەمی تازە لاوێتی. پلانۆ، لە ژیانی منیشدا کاریگەری خۆی هەبوو. پلانۆ، بە یەکێك لە شارە رەسەن و پەراوێزەکانی ئەمریکا

دادەندرا کە خاوەنی چەندین بازارچەی باریک، شەقام گەلی هێڵکاری کرا و جوان و چەندین یانەی خۆجێی لەنێو زەوییە بەیارە رەنگ قاوەییەکاندابوو. ئەم شارە پڕبوو لە پیاوانێك کە کراسی گۆڵف و پانتۆڵ گەلی "سانزابلێت" (Sansabelts Pants)یان لەبەردا بوو، ژنانی رازاوە بە ئاڵتوون، خشڵ و زێر و زیوی ساختە و تازەلاوانی بەلارێدا چوو. هیچ شتێك رەنگی کۆنبوونی پێوە دیار نەبوو، بەڵام هیچ راستییەکیشی تێدا بەدی نەدەکرا.. زۆرتر درۆینە و ناڕاست دەردەکەوت. بە بۆچوونی من شوێنێکی زۆر وەرزکەر و ئازاردەر بوو، پێموابێت هەر ئەم شتە، هۆکاری بڵاوبوونەوەی لەڕادەبەدەری ئالودەبوون بە ماددە هۆشبەرەکان و خۆکوژی لە نێو لاوانی ئەم شارەدا بوو.

من لە یەکێك لە گەورەترین دواناوەندییەکانی پلانۆی ڕۆژهەڵات دەمخوێند. شێوە و ئەندازیارییەکی زۆر مۆدێرنی هەبوو، زیاتر لە دامەزراوەیەکی دەوڵەتی دەچوو تا قوتابخانە. لەوێ هەموو ئاشقی تۆپی پێی ئەمریکی بوون و لەبنەڕەتدا ئەگەر کەسێك ئەمجۆرە یاری تۆپی پێیەی نەزانیبایە، یان لە توێژی مامناوەند و خوارەوەی کۆمەڵگا بایە، دەتووت هەر بوونیشی نییە! دایکی منیش تەنیا سکرتێرەیەکی سادە بوو، هەر لەبەر ئەم هۆکارە، هەوڵمدەدا بە باشی فێری یاری تۆپی پێ ببم.. بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی بۆ فێربوونی ئەو یارییە دام، سەرکەوتوو نەبووم، چونکە بۆ یاری تۆپی پێ دروست نەکرابووم. بەگشتی لە هەر کارێکدا کە پێویستی بە راکردن بەملا و ئەولا و هەماهەنگی ماسولکەکانی چاو و دەست هەبوو یان سەروکاری لەگەڵ

تۆپدا هەبوو، سەرکەوتوو نەبووم.

بڕیارمدا بوارێك هەڵبژێرم کە تیایدا باشتر بم و هەمیشە هەست بە خۆشبەختی بکەم. پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم، قوتابخانەکەمان پێشبڕکێیەکی ڕاکردنی ساز کرد. شەوی بەر لە پێشبڕکێکە، بە دایکمم وت: "دەبمە پاڵەوانی ئەم پێشبڕکێیە." ئەو سەیرێکی کردم و بەو سەیرکردنە، هەموو قسەی دڵی خۆی تێگەیاندم. پاشان چووە لای کەرەستەکان یان هەمان شڕو شیتاڵە شەخسییەکانی خۆی و لەنێو ئەواندا، دراوێکی زیوی هەڵگرت و وتی: "ئەمە دراوی شانسە.." من لەو پێشبڕکێیەدا سەرکەوتنم بەدەست هێنا.

چەند مانگ دواتر چوومە یانەی مەلەکردنی گەرەك تا بتوانم زیاتر لەگەڵ منداڵانی دیکەی گەرەکدا سازگارتر بم. ڕۆژانی هەوڵ، هێندە دەست و پێ سپیلکە بووم کە منیان لەنێو منداڵانی تەمەن حەوت ساڵدا دادەنا. زۆرم شەرم دەکرد کە خوشکی بچووکی یەکێك لە هاوڕێکانم لە تەنیشت خۆمەوە دەبینی. لە تۆپی پێدا هەر هیچ سەرکەوتوو نەبووم، بەرەبەرە خەریکبوو تێدەگەیشتم کە لە مەلەکردنیشدا هێندە باش نیم.

بەڵام هیوا بڕاو نەبووم و دیسان لە هەوڵەکانی خۆم بەردەوا بووم. لەگەڵ خۆمدا ڕێکەوتم کە ئەگەر بۆ فێربوونی مەلە ناچار بم لەگەڵ منداڵانیشدا ڕاهێنان بکەم، دیسان لەم کارە بەردەوام بم. ئێستاش هەر کات دایکم ئەو ڕۆژانەی بیر دێتەوە، جۆش و خرۆش دەیگرێت و دەڵێت: "زۆرت هەوڵدا تا سەرکەوتن بەدەست بهێنیت.." لە ئاوی مەلەوانگەکەدا

دەست و پێکانم دەجووڵاند، کۆششم دەکرد و هەموو هەوڵی خۆم دەخستە کار تا بتوانم ئەم سەرو ئەو سەری مەلەوانگەکە ببڕم و بگەڕێمەوە. سەردەمی هاوگرووپ بوون لەگەڵ منداڵاندا، زۆری نەخایاند و پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم، پێشکەوتنم بە خۆمەوە بینی و توانیم بچمە نێو گرووپێکی باشترەوە.

مەلە، بۆ تازە لاوێکی تەمەن دوانزە ساڵ بە وەرزشێکی باش و چێژبەخش دادەندرێت. یانەی مەلەی پلانۆش لایەنگری زۆری هەبوو. من مەلەم بۆ پیاوێك دەکرد کە ناوی "کریس مەکاردی" ( Chris MacCurdy) بوو کە هێشتا و هەمیشە ئەو بە یەکێك لە باشترین راهێنەرەکان دەزانم.. کریس لە ماوەی ساڵێکدا منی کرد بە کەسێکی دیکە. من لە پێشبڕکێی مەلەی کراوەی هەزار و پێنحسەد مەتریدا لەسەر ئاستی شاردا پلەی چوارەمم بەدەستهێنا. ئەو بەوپەڕی جدیبوونەوە، راهێنانی بە گرووپەکەمان دەکرد: هەموو رۆژێك بەیانیان لە کاتژمێر پێنج و نیو بۆ حەوت راهێنانمان هەبوو. کەمێك دواتر، دەستمکرد بە پاسکیلسواری.. هەموو رۆژێك بەیانیان زوو، لە شەقامە نیوە تاریك و کەشی بومەلێڵدا، مەودای دە میل پایدەرم لێدەدا تا بگەمە شوێنی راهێنانەکەمان. پێش ئەوەی بچم بۆ قوتابخانە، بەگشتی چوار هەزار مەتر مەلەم دەکرد، دوای ئەوە، شەش هەزار مەتری دیکە. رۆژانە بەشێوەی مامناوەند، شەش میل مەلەم دەکرد و بیست میل پایدەرم لێدەدا. دایکم لەبەر دوو هۆکار، رێی دەدا لەم کارە بەردەوام بم: ئەو ئوتۆمبێلی نەبوو تا خۆی بتوانێت من بگەیەنێت، لە لایەکی دیکەشەوە دەیویست من

سەربەست بم تا بە کەیفی خۆم، توانا شاراوەکانم وەگەڕ بخەم و پەروەردەیان بکەم.

دوانیوەڕۆیەك کە تەمەنم سێزدە ساڵ بوو، کاتێك لە دەوروبەری دووکانەکەی ریچارد سن پیاسەم دەکرد، ریکلامی پێشبڕکێیەك بە ناونیشانی "مندالە ئاسنینەکان" سەرنجی راکێشام. بانگەوازی پێشبڕکێیەکی سیانی یان "تری ئەتلۆن" (Triathlon) بوو کە پاسکیلسواری و مەلە و راکردنی لەخۆ دەگرت. تا ئەو کاتە هیچم لەبارەی "تری ئەتلۆن"ەوە نەدەزانی، بەلام لە هەموو یارییەکانی ئەودا شارەزا و لێهاتوو بووم. بۆیە ناوی خۆم نووسی. دایکم بردمی بۆ فرۆشگایەك تا جلوبەرگی پێویستی بەشداری لە پێشبڕکێکانم بۆ بکڕێت. لەیادمە، بۆ بەشداری کردن لەو پێشبڕکێیانەدا یەکەم پاسکیلی سیباقی خۆم کڕی. پاسکیلێك لە جۆری مێرسر (Mercier)، باریك بەلام زۆر جوان و نایاب بوو.

لەو پێشبڕکێیەشدا براوە بووم و زۆر جاری دیکەش و لە ناوچە جۆراوجۆرەکان بۆ وێنە لە هۆستۆن (Houston)، ئەم سەرکەوتنە دووبارە بۆوە، بەبێ ئەوەی کە بچووکترین راهێنانم بۆ ئەو مەبەستە کردبێت.. کاتی گەڕانەوە لە هۆستۆن، ورەیەکی بەرز و متمانە بەخۆبوونێکی سەیرم هەبوو. تازەکارێك یان جونیۆرێکی پلەبەرزی مەلە بووم، بەلام هەرگیز لەودا باشترین نەبووم و نەشبووم. شارەزایی و لێزانی سەرەکی من لە سێ یارییەکەی (تری ئەتلۆن)دا بوو، بۆیە لەو

پێشبڕکێیانەدا، لە هەموو تازە لاوەکانی دیکەی شار و هەرێمەکەمان باشتر بووم. هەر لەبەر ئەمەش هەستێکی زۆر باشم هەبوو.

ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی دروستبوون و سەر ڕێکەوتنی وەرزشکارێك و بەردەوامی ئەو، توانای ئەوە لە کەمکردنەوە و نەهێشتنی هۆکارە پەراوێزەکانی وەك شەرم کردن.

ئەو پێویستە بۆ ئەوەی بچوکترین سکاڵا بکات، توانای بەرگەگرتنی ئازار و مەینەتییەکانی هەبێت. من تازە تێگەیشتبووم کە ئەگەر لە حاڵەتێکدا ناچار بم بەتوندی ددانەجیرە بکەم، هیچ گوێ بەوە نەدەم کە ڕواڵەتم چی لێدێت و تەنیا دەبێت بیر لەوە بکەمەوە کە پێش ئەوانی دیکە بدەمەوە تا براوە بم.

گرنگ نەبوو چ وەرزشێك بێت، لە هەر چەشنە پێشبڕکێیەکی مەودا درێژ و بۆ پێشەوە، دەمتوانی بۆڕی هەموو کەس بدەم. لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەر کار یان شتێکیشدا کە بە جۆرێك لە جۆرەکان بە خۆڕاگری لەهەمبەر ئازار و مەینەتی دادەندرا، سەرکەوتوو بووم وەك ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شووڵ لێدانەکەی تری ئارمسترانگی باوەپیارەمدا.. بەڵام شتانێکی دیکەش هەبوون کە توانای خۆ خەریککردن لەگەڵ ئەوانمدا نەبوو...

تەمەنم چواردە ساڵان بوو کە دایکم بە مەبەستی ئەنجامدانی نەشتەرگەری دەرهێنانی منداڵدان –هیسترکتۆمی (Hysterechtomy)– چوو بۆ نەخۆشخانە. ئەم نەشتەرگەرییە بۆ

ژنان دەکرێت و بەهۆیەوە منداڵدان لادەبرێت. ئەم نەشتەرگەرییە بۆ هەموو ژنێك هەم لە ڕووی جەستەییەوە و هەمیش لە ڕووی دەروونییەوە زۆر قورس و تاقەت پڕوکێنە. دایکم کاتێك ئەم نەشتەرگەرییەی بۆ کرا کە هێشتا لاو و کەم تەمەن بوو. من ناچار بووم واز لە دایکم بێنم لە کاتێکدا کە هێشتا بەتەواوی چاك نەبوو بۆوە. لەبەر ئەوەی دەبوو بۆ بەشداریکردن لە پێشبڕکێکانی مەلەدا بچم بۆ سان ئانتۆنیۆ (San Antonio). تێری بڕیاریدا هاوڕێیەتیم بکات و ئاگای لە کارەکانم بێت. من هیچ حەزم نەدەکرد لە گەڵم بێت. بێزار بووم لەوەی کە هەوڵی دەدا ڕۆڵی باوکێك باش بگێڕێت، لەو بڕوایەدا بووم کە لە دۆخێکی لەو شێوەیەدا دەبوو ئەو لە نەخۆشخانە بێت. بەڵام تێری پێداگری دەکرد کە دەبێت لە گەڵم بێت.

کاتێك کە لە فڕۆکەخانە چاوەڕوانی فڕۆکەم دەکرد، سەیری تێریم کرد. لە دڵی خۆمدا پێم وت: "تۆ لێرە چی دەکەیت؟" لەو کاتەدا کە ئەم بیرانە بە مێشکمدا گوزەریان دەکرد و سەیری ئەوم دەکرد، دەستیکرد بە شت نووسین. ئەو دەینووسی، پاشان کاغەزەکەی گرمۆڵە دەکرد و فڕێی دەدایە نێو تەنەکە خۆڵەوە و دووبارە سەرلەنوێ دەینووسیەوە. گومانای دیار بوو.

کەمێك دواتر، تێری لە شوێنەکەی هەستا و بەرەو لای توالێت چوو. من چوومە گیان سەتڵە خۆڵەکە. کاغەزە گرمۆڵەکانم هەڵگرت و لە جانتاکەم هاویشتن. پاشان کە بەتەنیا بووم، ئەوانم لە جانتاکەم دەرهێنان و

خوێندمنەوە. ئەو کاغەزە گرمۆلانە نامە بوون بۆ ژنێکی دیکە. من هەموویانم یەك بە یەك خوێندەوە. تێری لە کاتێکدا نامەی بۆ ژنێکی دیکە دەنووسی کە دایکم لە نەخۆشخانە، لەژێر نەشتەرگەریدا بوو!

نامەکانم لە بن جانتاکەدا شاردەوە و بە فڕۆکە گەڕامەوە بۆ دالاس. کە گەیشتمەوە ماڵەوە، چوومە ژوورەکەم و کتێبی "ریکۆردە جیهانییەکانی گینس"م لە رەفەی کتێبەکان دەرهێنا. بە مەقەست ناوەڕاستەکەیم هەڵکۆڵی، نامەکانم لەوێدا شاردنەوە و کتێبەکەم لە شوێنی خۆی دانایەوە. حەزم دەکرد نامەکان راگرم.. نازانم بۆچی؟ رەنگبوو بۆ دڵنیایی، رەنگ بوو بۆ کاتێك کە دەشیا پێویستم پێیان بێت. بۆ ئەوەی ئەگەر تێری دیسان بڕیاری بدایە شوولەکەی بەکار بهێنێت، ئەو نامانە پارێزگاریم لێبکەن.

ئەگەر لە رابووردوودا، باوەپیارەکەم خۆشم نەدەویست، لەو رۆژە بەدواوە ئیدی تەنانەت بچووکترین رێزیشم بۆ دانەدەنا و بێگوێم دەکرد.

با بەکورتی باسی سەردەمی ئالۆزی لاوێتیم بکەم. کە مێرمنداڵ بووم، وازییەکم بەناوی رۆمانە داهێنا. لەم وازییەدا، تۆپێکی تێنسم لە رۆن هەڵدەکێشا و ئاگرم تێبەردەدا، پاشان دەستکێشە باخەوانییەکانم دەکردە دەست و یاریم بە تۆپەکە دەکرد. تەشتێکی پلاستیکیم پڕ دەکرد لە بەنزین و کارتۆنێك تۆپی تێنسیشم دەکردە نێوی. دانێکم دەردەهێنا، بە شقارتە گرم تێبەردەدا و لەگەڵ باشترین هاوڕێم واتە "ستیۆ لویس"دا یاریم دەکرد. تۆپە گڕدارەکەمان بۆ یەکتر هەڵدەدا تا

ئەوەی کە دەستکێشەکانمان دووکەڵی لێ بەرز دەبۆوە. تەسەور بکەن! دوو کوڕی کەم تەمەن لە گۆڕەپانێکی یاری کردن، لە شنە بای گەرمی تەکساسدا وەستاون و تۆپە ئاگرینەکان بۆ یەکتر هەڵدەدن. هەندێکجار دەستکێشە باخەوانییەکان ئاگریان دەگرت. ئێمە ئەوانمان رادەوەشاند و بە پانتۆڵەمانماندا دەکێشا تا ئەوەی کە دواجار خۆڵەمێش و بریسکەکانی ئاگر وەك گوڵەستێرە، بە چوار دەوری سەرماندا بەرز دەبوونەوە بۆ ئاسمان.

جارێکیان بەرێکەوت تۆپەکەم هەڵدایە بن میچەکە. چەند دانە لە تەلاشە دارەکان گڕیان گرت و من ناچار بووم بە هەر زەحمەتێك بووە هەڵگەڕێم و پێش ئەوەی هەموو خانووەکە ئاگر بگرێت و ماڵە دراوسێکەش بگرێتەوە، کارێك بکەم. جاروباریش تۆپەکە، ڕێك دەکەوتە ناوەڕاستی تەشتە پڕ لە بەنزینەکەوە و گڵپەی دەکرد. بەمجۆرە، کێوێك ئاگر و تۆپەڵێك دووکەڵ دروست دەبوو، من دەترسام و هەوڵم دەدا هەر چۆنێك بووە ئاگرەکە بکوژێنمەوە، بەڵام بارودۆخەکە خراپتر دەبوو، بەنزینی نێو تەشتەکە دەرژایە سەر زەوی.

زیاتر بۆیە ئەمجۆرە کارانەم دەکرد، چونکە دەمزانی دایکم خۆشبەخت نییە، نەمدەزانی بۆچی لە تێری جیا نابێتەوە. رەنگبێ بە بۆچوونی ئەو، ژیان لەگەڵ تێریدا، باشتر بوو لەوەی کە بەو مووچە کەمەی هەیەتی، من بە تەنیایی بەخێو بکات..

دواجار، چەند مانگ دوای چوونەکەم بۆ سان ئەنتۆنیۆ، دایکم لە تێری

جیا بۆوه. ئەو رۆژه تەلەفۆنم بۆ دایکم کرد تا پێی بڵێم کە درەنگتر دەگەڕێمەوه بۆ ماڵەوه، ئەو وتی:

"کوڕم، زوو وەرەوه بۆ ماڵەوه."

وتم: "شتێك روویداوه؟"

– "پێویسته قسەت لە گەڵ بکەم."

سوار پاسکیلەکەم بووم و گەڕامەوه بۆ ماڵەوه، ئەو لە ژووری میوان دانیشتبوو.

وتی: "بە تێریم وتووه لێره بڕوات، دەمەوێ داوای جیابوونەوه بکەم."

خەیاڵم ئاسوودە بوو، خۆشحاڵ بووم و ئەمەشم لە دایکم نەشاردەوه.

وتم: "ئەمە زۆر باشه."

"بەڵام کوڕم، من نامەوێت تۆ کێشەم بۆ دروست بکەیت، بهێڵە با خۆم بەم کاره رابگەم، تکایه کێشه مەنێرەوه."

"بەڵێن دەدەم."

ماوەی چەند هەفتەیەك، هیچ قسەیەکم لەم بارەوه نەکرد تا ئەوەی رۆژێك، کە لە چێشتخانە لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتبووم، بە دایکم وت: "ئەو هەر هیچ کەسێکی باش نەبوو."

سەبارەت بە نامەکان هیچم بە دایکم نەوتبوو، لەبەر ئەوەی ئەو وەك پێویست هەستی بە بەدبەختی دەکرد. بەڵام چەند ساڵ دواتر و لەکاتی

تۆزتەکێن(ماڵ خاوێنکردنەوە)دا، نامەکانی دۆزیبۆوە و بینینی ئەوان هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو.

تا ماوەیەك، تێری دەیویست بە ناردنی کارتی پیرۆزبایی لەدایکبوون و شتانی لەو بابەتە، پەیوەندییەکەی لەگەڵ مندا بهێڵێتەوە. ئەو هەموو مانگێك زەرفێکی بۆ دەناردم کە چەکێکی ١٠٠ دۆلاریی تێدابوو، منیش هەموو جارێك ئەوم دەبردە لای دایکم و داوام لێدەکرد چەکەکەی بۆ بنێرێتەوە. ئاخرەکەی نامەیەکم بۆ نووسی و وتم، ئەگەر بمتوانیبایە ناوی خۆم دەگۆڕی، چونکە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان خۆم و کەس و کاری ئەودا نابینم.

دوای جیابوونەوەکەیان، من و دایکم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لە یەکتر نزیك بووینەوە. بە بۆچوونی من، ئەو بۆ ماوەیەك خۆشبەخت نەبوو، کاتێك کە کەسێك خۆشبەخت نییە، ناتوانێت خۆی بێت. ئەویش دوای جیابوونەوەکەی گۆڕا، هێورتر بۆوە، وەك بڵێی فشارێکی قورسی لەسەر هەڵگیرابێت. بەڵام ڕۆشتنی تێری بە واتای کۆتایی هاتنی سەختی و مەینەتییەکانی دایکم نەبوو.. چونکە ئەو دیسان ببۆوە بە ژنێکی تەنیا کە هەوڵی دەدا بتوانێت خەرجییەکانی من و خۆی دابین بکات، بەڵام ئەو پێشتریش باروڕۆخێکی لەم چەشنەی تاقی کردبۆوە.

هەوڵمدەدا لە ڕووی دەروونییەوە یارمەتی بدەم. کە لە کار دەگەڕایەوە، پێکەوە لەسەر مێزی نانخواردنی ئێوارە دادەنیشتین، تەلەفزیۆنەکەمان دەکوژاندەوە و پێکەوە قسەمان دەکرد. لەکاتی شێو

کردندا، ئەو ئادابی نانخواردنی فێری من دەکرد، سەبارەت بە کارەکەی قسەی بۆ دەکردم و دەیووت هەندێکجار لەبەر ئەوەی کە سکرتێرەیە، چەند سووکایەتی پێدەکرێت.

"ئەی باشە بۆ واز لەم کارە ناهێنیت."

"چونکە دەزانم ئەگەر واز لەم کارە بێنم. تووشی چ بارودۆخێك دەبین."

هەندێك جار کە لە کار دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بە باشی هەستم بەوە دەکرد کە چ ڕۆژێکی ناخۆش و خراپی تێپەڕاندووە. بۆیە ئەگەر دەنگی بڵێنگۆکە زۆر بایە، کەمم دەکرد و گۆرانییەکی خاوم دەخستە سەر و دەمووت: "دایکە، ئەمە بۆ تۆیە." هەوڵم دەدا لە ڕووی سۆزدارییە پشتیوانی ئەو بم، چونکە ئەویش ئاگای لە من بوو. هەموو شەممەیەك، پێنج کراسی بۆ دەشتم و ئوتوی دەکرد بۆ ئەوەی هەر ڕۆژێك بمویستبایە بچم بۆ قوتابخانە، کراسی پاك و ئوتو کراوم هەبێت. ئەو دەیزانی کاتێك لە قوتابخانە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، برسیمە و ماکاڕۆنی دروست دەکرد و دەیخستە سەلاجەکەوە.

لە تەمەنی پانزە ساڵی و لە ساڵی ١٩٨٧ەوە بەشداریم لە پێشبڕکێی سیانییەکە(تری ئەتلۆن)ی لیك لاڤۆن (Lake Lavon)دا کرد و سەرچاوەیەکی داهاتم دەستکەوت. لەم پێشبڕکێیەدا، زۆر وەرزشکاری بەئەزموون بەشدار بوون. من پلەی سی و دووهەمم بەدەست هێنا و ڕکابەر و تماشاچییەکانم تووشی حەپەسان کرد. ئەوان باوەڕیان نەدەکرد

کوڕێکی تەمەن پانزە ساڵ بتوانێت ئەو پلەیە بەدەست بهێنێت. ڕۆژنامەکان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردم. من بە یەکێك لە هەواڵنێرانم وت: "پێموایە لە پێنج ساڵی داهاتوودا دەتوانم لە یەکەمەکان و لە دە ساڵی داهاتووشدا ، باشترین بم." هاوڕێکانم و یەك لەوان "ستیڤ لویس" وایان بیر دەکردەوە کە من کەسێکی زۆر لەخۆ ڕازی و خۆ دەرخەرم، بەڵام ساڵی دواتر، من لە پێشبڕکێکاندا پلەی پێنجەمم بە دەستهێنا و بەوانم سەلماند کە بەو شێوەیە نییە.

لە پێشبڕکێ سیانییەکەدا، پارەی باشیان دەدا. لە پڕ گیرفانم پڕ بوو بوو لە پارە، بۆیە لە هەر شوێنێك پێشبڕکێ هەبایە، بەشداریم دەکرد. لە پێشبڕکێ ئاست بەرزەکاندا، ڕەچاوی تەمەنیان دەکرد و دەبوو بەشداربوو لانی کەم تەمەنی شانزە ساڵ بێت. هەر بۆیە لەبەر ئەوەی بتوانم لە پێشبڕکێکەدا بەشداری بکەم، لە فۆڕمی ناو تۆمار کردندا، ڕێکەوتی لەدایکبوونەکەم دەگۆڕی. لە قۆناغی بەراییدا براوە نەدەبووم، بەڵام هەمیشە لە ریزی پێنچ کەسی یەکەمدا بووم و بەرەبەرە، ڕکابەرەکانی دیکە بە "پاڵەوانی بچووك" بانگیان دەکردم. بەدەستهێنانی پلە لەم پێشبڕکێیانەدا کارێکی هێندە ئاسان نەبوو. لە یەکێك لە یەکەم پێشبڕکێ سییانییەکاندا کە بەشداریم کرد، خواردنێکی گونجاوم بۆ بەشداریکردن لە پێشبڕکێکەدا نەخواردبوو، باجەکەشیم دا، چونکە هەر لە سەرەتاوە چیتر ئەوەندەم وزە تێدا نەبوو کە بتوانم لە پێشبڕکێکە بەردەوام بم. هێندەم ئاو خواردبۆوە کە بتڵە ئاوەکەم تەواو بوو، وای لێهات چیتر نەمتوانی بەردەوام بم و لەنێو ڕێدا، لە پاسکیلەکە بەربوومەوە. دایکم لە هێڵی

کۆتایی چاوەڕوانم بوو، چونکە ڕاهاتبوو من لەوێ ببینێت، نەیدەزانی چی ڕوویداوە، بۆیە هاتە لام و وتی: "هەستە کوڕم، تۆ دەتوانیت."

– "ناتوانم."

"زۆر باشە، بەڵام تۆ نابێت واز لە پێشبڕکێکە بهێنیت، تەنانەت ئەگەر بڕیار بێت تا هێڵی کۆتاییش بە پێ بڕۆیت."

هەستام و تا هێڵی کۆتایی بە پێ ڕۆشتم.

بەرەبەرە لە پێشبڕکێ ناوچەییەکانی پاسکیلسواریدا، ناو و ناوبانگێکم پەیدا کرد. شەوانی سێ شەممە، کۆمەڵێك پێشبڕکێی لە جادەکانی نێو زەوییە بەیارەکانی "ریچاردسون"دا ساز دەکرا. ئەم پێشبڕکێیانە لە نێو پاسکیلسوارەکانی ناوچەکەدا بە ڕکابەرییەکی جددی دادەندرا. من پاسکیلم بۆ هویت لیدەخوڕی کە لەلایەن "ریچاردسون بایك مارت"ەوە سپۆنسەری گرووپێکی ئەو ناوچەی دەکرد و دایکم سندوقێکی کەلوپەلی لەوێ بۆ کڕیبوم کە ئەشیای پاسکیلسوارییەکەم تیایدا هەڵدەگرت. دایکم دەڵێت، هێشتاش باش پایدەر لێدانە بەهێزەکەی منی لەو پێشبڕکێیانەدا لەبیرە کە چۆن پێش هەموو منداڵەکانی دیکەم دەدایەوە. بەلامەوە گرنگ نەبوو کە خەڵاتەکە تەنیا سەد دۆلارە، هەر چۆنێك بایە بەدەستم دەهێنا.

بەگشتی چوار گرووپی پێشبڕکێ هەبوون. گرووپی یەکەم، باشترین و گرووپی چوارەم، خراپترینیان بوو. من کاری خۆم لە پێشبڕکێکانی شەوانی سێ شەممەدا لە گرووپی چوارەمەوە دەست پێکرد، بەڵام بەو پەڕی تواناوە هەوڵم دەدا تا بگەمە گرووپەکانی سەروتر، ئەمەش

پێویستی بەوە بوو کە لە ژمارەیەکی دیاریکراو لە پێشبڕکێکاندا براوە بێت. بەڵام من ئۆقرەم لەبەر بڕابوو بۆ ئەوەی بگەمە گرووپەکانی سەروتر، هەر بۆیە قەناعەتم بە بەرپرسی پێشبڕکێکان کرد کە لە گرووپی سێیەمدا، لە پاڵ کەسانی بەئەزموونی پاسکیل لێبخوڕم. ئەو وتی: "باشە، بەڵام بەڵێنم پێبدە کە براوە نابیت." نیگەرانییەکەی ئەو لەبەر ئەوە بوو کە ئەگەر من سەرنجێکی زۆرم بەرەو لای خۆم راکێشابایە، ئەوانی دیکە نارەزایەتییان دەردەبڕی کە بۆچی رێیان بە من داوە هەر لە هەوەڵەوە بچمە گرووپی سێیەم. بەڵام بەدەست خۆم نەبوو، من براوە دەبووم و پێش هەموویانم دەدایەوە. ئەم بابەتە مشتومڕی زۆری دروست کرد. رێگایەك، ئەوە بوو کە من هەڵپەسێرن و نەهێڵن بۆ ماوەیەك لە پێشبڕکێکاندا بەشداری بکەم. بەڵام لەباتی ئەم کارە، منیان ناردە گرووپی سەروتر. تەنیا سێ یام چوار کەس لە گرووپی یەکدا بوون کە وەك پاڵەوانی ناوچەکە ناسرابوون و هەموشیان بۆ تیمی ریچارسون بایك مارت، پایدەریان لێدەدا. بۆیە لەگەڵ ئەواندا دەستم بە راهێنان کرد. راهێنانی کورێکی تەمەن شانزە ساڵ لەگەڵ پاسکیلسوارانی بەئەزموندا کە تەمەنیان نزیکەی سی ساڵ دەبوو!

ئێستا ئیدی لە پێشبڕکێ سیانییەکاندا، تازە کارێکی نیشتمانی ساڵ بووم و من و دایکم لەوە گەیشتبووین کە وەك وەرزشکارێك داهاتوویەکی رووناك، چاوەڕوانم دەکات. لە ماوەی ساڵێکدا، بیست هەزار دۆلارم دەستکەوتبوو، هەروەها پەیوەندییەکی کاری باشم هەبوو. پێویستم بە چەند سپۆنسەرێك بوو کە تێچووی بەشداریکردن لە پێشبڕکێ

جۆراوجۆرەکانم بۆ دابین بکەن.

دایکم وتی: "سەیر کە لانس، ئەگەر بڕیارە بگەیت بە شوێنێك، پێویستە خۆت هەوڵ بدەیت، چونکە کەس لەباتی تۆ ئەم کارە ناکات."

دایکم باشترین و بەوەفاترین هاوڕێی وپاڵنەری من بوو، وزەی پێدەدام، دەیووت: "ئەگەر بیر لە ١٢٠ نەکەیتەوە، بە ١٠٠ ناگەیت.."

ئەو راهێنانەکانی منی رێکخستبوو، دەیووت: "سەیرکە، من نازانم تۆ پێویستت بە چی هەیە، بەڵام ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە کە دابنیشیت و بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەیتەوە کە دەتەوێت پێیان بگەیت. خۆ تۆ ناتەوێت هەوڵ بدەیت بەڵام بە ئامانجەکەت نەگەیت؟ شانازیم بەوەوە دەکرد، ئێمە زۆر لە یەك دەچووین. تەواو لە یەکتر تێدەگەیشتین و کە لای یەکتر دەبووین، بۆ تێگەیشتن لە هەستەکانی یەکدی، پێویستمان بە قسەکردن نەبوو. ئەو هەمیشە رێگایەکی دەدۆزییەوە تا دوایین مۆدیلی پاسکیلم بۆ بکرێت. پاسکیلەکان نرخەکەیان هێندە گران بوو کە ئەو هێشتاش نەیتوانیوە فرێیان بدات.

لە هەموو گەشت و پێشبڕکێکاندا لە تەنیشتم بوو. تەنانەت من و دایکم پێمانوابوو کە دەتوانم بەشداری لە پێشبڕکێکانی ئۆلۆمپیکدا بکەم. هێشتاش ئەو دراوە زیوییە بەبەختەم بە ملەوە بوو کە ئەو زنجیرێکی پێدام کە ژمارەی "١٩٩٨" لەسەر هەڵکەندرابوو (هاوینی ئەو ساڵە، پێشبڕکێکانی ئۆلمپیك بەڕێوە دەچوو).

هەموو رۆژێك، کاتی گەڕانەوە لە قوتابخانە، شەش میل رام دەکرد و

پاشان تا دەمەو ئێوارە پاسکیلم لێدەخوڕی. هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە لەگەڵ تەکساس راهاتبووم و ئاشقی ئەم شارە بوم. دەورووبەری ئەم شارە، بەشێوەیەکی غەریب و گژمین(خەمهێنەر)، جوان بوو. تا چاو بڕی دەکرد، لەوەڕگە و کێڵگەی پەمۆ بوو کە مەڕ و ماڵات گژوگیاکەیان خواردبوو. هەندێکجار لەکاتی پاسکیل سواریدا، دەشتی پڕ لە گوڵی کێوی و درەختەکانی کهورم دەبینی کە با شێوەی سەیر و سەمەرەی لێ دروست کردبوون، و هەندێك جاریش زەوییە بەیارە رەنگ زەرد و قاوەیەکانم دەبینی کە بایەکی توند لێوە دەهات، شاری دالاس، سێهەم شاری باگری وڵات بوو، بەڵام من حەزم لە با بوو، چونکە وەك نموونە و هێمای خۆڕاگری لێم دەڕوانی.

دوانیوەڕۆی رۆژێك، بەهۆی خۆپێداکێشان بە لۆرییەکەدا، چوومە دەرەوەی جادەکە و کەوتم. جنێوێکم بە شۆفێری لۆرییەکە دا و ئەویش دەبە بەنزینەکەی بۆ فڕێ دام و شوێنم کەوت. رامکرد و پاسکیلە خنجیلانەکەم لە قەراغ جادەکە جێهێشت، کاکی شۆفێریش بە لۆرییەکەی بە سەریدا رۆشت.. قسەیەکی ناشیرینم کردبوو، بۆیە ئەویش زۆر تووڕە بوو. منیش ژمارەی ئوتۆمبێلەکەم یادداشت کرد. دایکم ئەوی دا بە دادگا و سزای پاسیکلەکەی لەو وەرگرتەوە، پاسکیلێکی پێشبڕکێی بۆ کڕیم و بیمەی کرد.

پاسکیلەکەی پێشووم ئامێری کیلۆمەتر ژمێری نەبوو، بۆیە ئەگەر بمویستبایە بزانم چەند کیلۆمەتر پاسیکیلم لێخوڕیووە، دەبوو دایکم بە ئوتۆمبێل بە دوامدا هاتبایە. بێگومان سی میل بۆ من هیچ نەبوو، بەڵام بۆ

دایکم کە ماندوو لە کار دەگەڕایەوە، زۆر زۆر بوو، بەڵام هیچ سکاڵا و گلەییەکی نەدەکرد.

من و دایکم پێکەوە زۆر ئاسوودە بووین. ئەو متمانەی تەواوی بە من هەبوو. هەر کارێکم بویستبایە دەمکرد و سەیرەکەش لەوەدا بوو کە لە هەموو کارەکانم ئاگادارم دەکردەوە. هەرگیز درۆم لەگەڵ نەدەکرد. ئەگەر بمویستبایە بچمە دەر، کەس ڕێی لێ نەدەگرتم. منداڵەکانی دیکە شەوانە بە دزییەوە دەهاتنە دەرەوە، بەڵام من زۆر ئاسایی و بە پێش چاوی دایکمەوە دەهاتمە دەر.

من منداڵێکی بزۆز بووم و ئەگەری ئەوە هەبوو کە زیان بەخۆم بگەیەنم، چونکە چێژم لە پێشبڕکێ لە شەقام و ترافیك و بەزاندنی گڵۆپی سوور، وەردەگرت. زۆری نەخایاند پاسکیلە جوان و نوێکەم بوو بە سکراب و هێندەی نەمابوو خۆم بە کوشت بدەم. ئەو ڕووداوە دوانیوەڕۆی ڕۆژێك ڕوویدا کە هەوڵم دا گڵۆپی سووری ترافیك ببەزێنم. ئۆتۆمبیلێك کە شۆفێرەکەی ژن بوو، منی نەبینی و ڕاستەخۆ لێی دام. بەسەرەوە کەوتم و کڵاویشم لەسەردا نەبوو. تەنیا بووم و هیچ پێناسێکیشم پێنەبوو، خەڵك لە دەورم کۆبوونەوە. یەکێك وتی: "نا، نا، کەس خۆی تێهەڵنەقورتێنێت." لەسەر پشت کەوتبووم و چاوەڕوانی ئەمبولانس بووم. دواجار ئەمبولانس گەیشت و منی برد بۆ نەخۆشخانە، هێندەم هۆش هەبوو کە بتوانم ژمارە تەلەفۆنی ماڵەوە بڵێم. دایکمیان ئاگادار کردەوە و ئەویش بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە نەخۆشخانە. سەر و قاچم چەندین تەقەڵی لێدرابوو، پاسکیلەکەشم تێکوپێك درابوو. بۆ پزیشکەکەم

باس دەکرد کە خەریکی ڕاهێنان بووم بۆ بەشداری کردن لە پێبشرکێیەکدا کە شەش ڕۆژی دیکە لە لیك دالاس، لە لویزیانا بەڕێوە دەچوو. ئەو لە وەڵامدا وتی: "بێگومان تا سێ هەفتەی دیکە، تەنانەت ناتوانی هەر بە ڕێشدا بڕۆیت." ڕۆژی دواتر، بە شەلەشەل و برینداری لە نەخۆشخانە ئیزن درام، بەڵام دوای ئەوەی کە چەند ڕۆژێك لە ماڵەوە مامەوە، وەڕزبووم و هاتمەدەر تا لە یانەی گەڕەکدا کەمێك یاری گۆلف بکەم. هەر ئەوەندەی کە دەمتوانی بە قاچی تەلبەندکراوەوە بە ڕێدا بڕۆم و پیاسە بکەم، زۆر بوو. ڕۆژی چوارەم باشتر بوو بووم، ناوی خۆم بۆ پێشبڕکێکە تۆمار کرد و بە دایکمم وت: "لە پێشبڕکێکەدا بەشداری دەکەم."

"زۆر باشە، زۆر زۆریش."

پەیوەندیم بە یەکێك لە هاوڕێیانمەوە کرد و وتم: "پاسکیلەکەتم بە قەرز پێ دەدەیتێ؟" پاشان چووم بۆ حەمام و تەقەڵەکانی قاچم دەرهێنان. زۆر باش دەمزانی بە نینۆککەر ئەم کارە بکەم. کارم بە تەقەڵەکانی سەرم نەبوو، چونکە لە ژێر کڵاوەکەدا بوون. کونێکم لە پێڵاوی ڕاکردنەکەم و کونێکیشم لە پێڵاوی پاسکیلسوارییەکەم کرد، تا برینی قاچم نەکولێتەوە.

سەر لەبەیانی ڕۆژی دواتر، لە تەنیشت ڕکابەرەکانی دیکەوە، لە هێڵی دەستپێکی پێشبڕکێکەدا وەستابووم و توانیم پلەی سێیەم بەدەست بهێنم. ڕۆژی دواتر، ڕۆژنامەکان بە خەتێکی گەورە نووسیان، من دوای ئەو پێکدادانە قورسە، واش پلەی سێیەمم بەدەست هێناوە. هەفتەیەك دوای

پێشبڕکێکە، نامەیەکمان لە پزیشکەکەوە پێگەیشت کە تیایدا نووسرابوو: "باوەڕ ناکەم!" هیچ شتێك نەیدەتوانی ڕێم لێ بگرێت. بۆ بەدەست هێنانی هەر شتێك کە بمویستبایە، پەلەم بوو. بۆ نموونە ئاشقی ئوتۆمبێل بووم، هەر بۆیە بە یەکەم خەلاتم، فیاتێکی سوورم کڕی و بێ هەبوونی ئیجازەی شۆفێری، لە دەوروبەری پلانۆ پێشبڕکێم دەکرد و هەندێکجار کارگەلێکم دەکرد کە هاوڕێیانم ئێستاش کە بیریان دێتەوە، سەریان سوڕ دەمێنێت.

شەوانە بە ئوتۆمبێل دەچوومە دەر. ئەم کارە نایاسای بوو، تەنانەت ئەگەر گەورەیەکیشم لەگەڵدا بووایە. لە ڕۆژانی کریسمسدا، کارێکی نیودەوامم لە فرۆشگایەکی فرۆشتنی یاری منداڵان هەبوو، یارییەکانم دەخستە نێو ئوتۆمبێلی مشتەرییەکانەوە. "ئێستیو لویس"یش کارێکی نیو دەوامی هەبوو، پێکەوە شەفتمان دانابوو. بۆیە دەمتوانی بە ئوتۆمبێل بچمە شوێنی کارەکەم. دوای جێهێشتنی شوێنی کارەکەم، تا دەگەیشتمەوە ماڵەوە، بە خێراییەکی زۆر پێشبڕکێم دەکرد، هەڵبەت ئەمە کارێکی مەترسیدار بوو.

ئێستیو، پۆنتیاك (Pontiac)ی کڕیبوو، منیش کامارۆ (Camaro)یەکم کڕی، ئەو شتەی کە زیاتر لە هەر شتێکی دیکە حەزم لێی بوو. هویت بە زەمانەت کردنی من، بۆ وەرگرتنی سولفە یارمەتیدام تا بە خواستەکەم بگەم. ئوتۆمبێلێکی پڕکێش بوو، هەندێکجار پێی دەچووم بۆ ناوچەی فارست لین (Forest Lane) کە شوێنی پێشبڕکێی ئوتۆمبێل بوو، لەوێ بە خێرایی ١١٥ و تەنانەت ١٢٠ کیلۆمەتر ئوتۆمبێلم

لێدەخوری.

هاوڕێیانم دوو گرووپ بوون: گرووپێکیان، هاوڕێیانی دواناوەندی کە لەگەڵیان دەچوومە سەیران و گەشت و گرووپی دووەم، هاوڕێیانی وەرزشکارم بوون کە هەندێکیان، زۆر لە من گەورەتر بوون. منداڵانی هاوتەمەنی من، هەموویان سوار ئەو ئوتۆمبێلانە دەبوون کە باوانیان بە دیاری پێیان دابوون، بەڵام من سوار ئوتۆمبێلێك دەبووم کە بە پارەی خۆم کڕیبووم. هەندێکجار بەتەواوی لێیان دوور دەکەوتمەوە، لەبەر ئەوەی وەرزش گەلێکی سەیر و سەمەرەم دەکرد و جلو بەرگەکانم وەك ئەوان نەبوو. لەڕاستیدا، کەسانێك کە سەر بە چینێکی کۆمەڵایەتی بوون، تەنانەت لە ڕووی جلوبەرگەکانیانەوە لە یەکتر جیا دەکرانەوە. جارێك، یەکێك لە هاوڕێیانم پێی وتم: "ئەگەر لەباتی تۆ بوومایە، شەرمم لەم جۆرە جلوبەرگ لەبەرکرنە دەکرد." هیچ گرنگیم پێنەدا و شانم بۆ هەڵتەکاند. تەنانەت جلوبەرگ لەبەرکردنەکەشیان بەپێی یاسا و ڕێسا بوو، یۆنیفۆڕمی مارکەی "پولۆ"یان لەبەر دەکرد، پانتۆلەکان، جزمەکان، پشتێنەکان، جانتای پارەکانیان و کڵاوەکانیشان یەك شێوە بوو.. ئەمە بە واتای یەکجۆری و یەك ریتمی تەواو بوو کە من دژی ئەوە بووم.

پاییزی ئەو ساڵە (دوایین ساڵی دواناوەندی)، بەشداریم لە پێشبڕکێیەکی گرنگ لە مۆریارتی نیومەکزیکۆ ( Moriarty, New Mexico) کرد. ئەم پێشبڕکێیە، تایبەت بوو بە تازە لاوان و لە ڕێگایەکدا بەڕێوە دەچوو کە بایەکی هێواشی هەبوو و مەوداکەشی ١٢ میل بوو. لەبەر ئەوەی پێشبڕکێکە لە بەشێکی شارێیەکدا بوو، هاتوچۆی

لۆری گەورە، دەبووە هۆی ئەوەی کە بایەکی توند بێت کە هاوسەنگی پاسکیلسوارەکانی تێك دەدا. ئامانجی لاوان بۆ بەشداری کردن لەم پێشبڕکێیەدا ئەوە بوو کە ریکۆرد تۆمار بکەن و سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆیان رابکێشن.

لەگەڵ ئەوەی کە لە مانگی سێپتەمبەردا بووین، کاتێك تەکساسمان جێهێشت، هێشتا هەوا هەر گەرم بوو، هەر لەبەر ئەم هۆکارە،جلی ئەستوورم لەگەڵ خۆم نەبرد. رۆژی پێشبڕکێکە، کاتژمێر شەش لەخەو هەستام و هەوای پاکی سەر لەبەیانی کێوانم هەڵمژی. جلوبەرگێکی تەنکم لەبەردا بوو، پێنج خولەکێك بەرەو خوارەوەی جادەکە پیاسەم کرد، بەڵام هەستم کرد هەوا زۆر ساردە و ناتوانم لەوە زیاتر بەردەوام بم. گەڕامەوە ژوورەکەم و وتم: "دایکە، هەوای دەرەوە زۆر ساردە و بەم جلوبەرگانەوە ناتوانم پێشبڕکێ بکەم، پێویستم بە چاکەت یان جلێکی گەرمی دیکە هەیە." سەیرێکی نێو جانتاکەم کرد و بینیم کە هیچ جلێکی گەرمم پێنییە، هیچ ئامادەییەکم نەبوو، ئەم کارە تەنیا لە کەسێکی پیشەیی (ئاماتۆر) دەوەشایەوە. دایکم وتی: "باشە من چاکەتێکی تەنکم لەگەڵ خۆم هێناوە" و ئەوی لە جانتاکەی دەرهێنا. پێشتر باسی ئەوەم کردبوو کە دایکم چەندە لەڕ و لاواز بوو، چاکەتەکەی دەتووت چاکەتی بوکەڵەیە. وتم: "باشە، لەبەری دەکەم." دووبارە چوومە دەرەوە، قۆڵی چاکەتەکە تا سەر ئەنیشکم دەهاتن و تەواو بە لەشمەوە چەسپابوو. بەو حاڵەوە لە ماوەی چل و پێنج خولەك خۆ گەرم کردن بۆ پێشبڕکێکە، ئەوم لەبەر کرد و کە گەیشتمە هێڵی دەستپێکردنی پێشبڕکێکەش، هەر لەبەرمدا بوو. لە

پێشبڕکێیەکدا کە لەودا کات بایەخی هەیە، گەرم ڕاگرتنی لەش زۆر گرنگە، چونکە کاتێك کە دەستپێکردنی پێشبڕکێکە ڕادەگەیەندرێت، پێویستە تەواو ئامادە بین تا بتوانین دوانزە میل پێشبڕکێ بدەین. بەڵام من هێشتا هەر سەرمام بوو.

بە نائومێدییەکەوە وتم: "دایکە، بچۆ سوار ئوتۆمبێلە بە و گەرمییەکەی هەڵکە و تا دوا پلە تینی بدەرێ." ئەو ئوتۆمبێلەکەی هەڵکرد و گەرمییەکەی تەواو تین دایە، سوار بووم و خۆم گەرم کردەوە. بە دایکمم وت: "تەنیا ئەو کاتەی کە سەرەم هات، پێمبڵێ."

ئاخرەکەی سەرەم هات، خێرا لە ئوتۆمبێلەکە دابەزیم و پەڕیمە سەر پاسکیلەکە، چوومە هێڵی دەستپێکردن و پێشبڕکێکەم دەست پێکرد، ریکۆردەکەم چل و پێنج خولەك کەم کردەوە.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو شتەی بۆ خەڵکی پلانۆ گرنگ بوو، بایەخی لای من لەدەست دەدا. قوتابخانە و جۆری ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان، لای من لە پلەی دووەمی گرنگیدا بوون و گرنگترین بابەت لای من ئەوە بوو کە لەسەر ئاستی جیهانیدا ببمە قارەمان. ئاواتم ئەوە بوو، لە نزیك بازاری گەورە خانوێکی جوانم هەبێت. ئوتۆمبێلێکی باش و پارەی پێویستم هەبێت، بەڵام ئەمانەشم بەهۆی سەرکەوتنم لەو پێشبڕکێ وەرزشییانەدا بەدەست هێنابوون کە هاوڕێکانم، هێندە گرنگیان بەوان و بەشداری کردن تیایاندا، نەدەدا.

بە تەنیا دەچووم بۆ ڕاهێنان و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، ڕاهێنانەکانم زیاتر دەکرد. هەندێکجاریش لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێکانم دەچووین بۆ گەشت و

سکی (خزانی سەر سەهۆڵ) و لە گەڕانەوەدا، لەباتی ئەوەی کە لەگەڵ ئەوانی دیدا بە ئوتۆمبێل بگەڕێمەوە، بەتەنیا و بە پاسکیل دەگەڕامەوە، تەنانەت جارێکیان کە بۆ گەشت چووبووین بۆ تکسۆما، لە گەڕانەوەدا نزیکەی ٦٠ میل پاسکیلم لێخوڕی.

تەنانەت وادیار نەبوو کە مامۆستاکانی قوتابخانەش لەوە تێبگەن کە من چ ئامانج گەلێکم هەیە. نیوەی دووەمی دواین ساڵی دواناوەندی بوو کە لە لایەن فیدراسیۆنی پاسکیلسواری ئەمریکاوە بانگهێشت کرام بۆ راهێنان، تا هاوڕێ لەگەڵ تیپی نیشتمانی لاواندا بچم بۆ کلۆرادۆ سپرینگ و پاشان دەبوو بۆ بەشداری لە یەکەم پێشبڕکێی نێودەوڵەتی خۆم – پێشبڕکێی پاڵەوانێتی لاوان لە ساڵی ١٩٩٠دا– بچم بۆ مۆسکۆ. هەموو ئەمانە بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانی من لە نیۆمەکزیکۆ بوو، بەڵام بەڕێوەبەرانی قوتابخانە رازی نەبوون. ئەوان سیاسەتێکی سەختگیرانەیان هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە ئیزنیان نەدەدا بەبێ پاساوێکی رەوا نەچیتەوە بۆ قوتابخانە. ئەوان گرنگیان بەوە نەدەدا کە قوتابییەکی قوتابخانەکە لە دۆسیەی رابووردووی خۆیدا، بەشداری کردن لە پێشبڕکێکانی ئۆلۆمپیکی هەبێت.

هەرچۆنێك بێت، من سەرەتا چووم بۆ کلۆرادۆ سپرینگ و پاشانیش بۆ مۆسکۆ. لە پێشبڕکێی مۆسکۆدا، بێ هیچ تەکنیکێك و تاکتیکێك، وزەیەکی سەیرم هەبوو، بۆیە بەر لە ئەوەی وزەکەم تەواو ببێت لە چەند خولی یەکەمی پێشبڕکێکەدا، لە پێشەوە بووم. ئەم بابەتە، کاری لە بەرپرسانی فیدراسیۆنی ئەمریکا کرد و راهێنەری سۆڤێتی تیپەکە بە

هەمووانی وتبوو، من باشترین پاسکیلسواری لاوم کە لەم چەند ساڵەی دواییدا بینیویەتی.

ماوەی شەش هەفتە لە قوتابخانە دوور بووم و کاتێك گەڕامەوە، بەهۆی ئامادە نەبوونم لە وانەکاندا، لە هەموو وانەکاندا سفریان بۆ دانابووم. بەڕێوەبەرانی قوتابخانە بە من و دایکمیان وت، ئەگەر نەتوانم لە ماوەی چەند هەفتەدا هەموو ئەو وانانە قەرەبوو بکەمەوە کە دواکەوتووم تیایاندا، دەمێنیتەوە و لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا دەرناچیت. ئێمە هەر بەڕاستی حەپەسابووین.

بەوانم وت: "بەڵام من ناتوانم ئەم کارە بکەم." ئەوان تەنیا سەیرێکیان کردم و یەکێك لەوان وتی: "خۆ ناتەوێت واز لە خوێندن بهێنیت؟"

لە وەڵامدا تەنیا سەیریم کردن. باش دەمزانی ئەگەر یاری تۆپی پێم بکردبایە و بلوزی مارك پۆلۆم لەبەر بکردبایە و دایك و باوکیشم ئەندامی یانەی لاس ریۆس بوونایە، دۆخەکە جیاواز دەبوو.

بۆیە وتم: "کۆبوونەوەکە کۆتایی هات."

هەستاین و لە ژوورەکە چووینە دەر. ئێمە تەنانەت تێچووی ڕێورەسمی کۆتایی خوێندنیشمان دابوو. دایکم وتی: "تۆ لێرە بمێنەرەوە. تا بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە من ئەم کێشەیە چارەسەر دەکەم."

ئەو چووبۆوە بۆ نوسینگەکەی خۆی و تەلەفۆنی بۆ تێکڕای ئەو قوتابخانە ئەهلیانە کردبوو کە ناویان لە دەفتەری تەلەفۆندا بوو. داوای لێکردبوون کە من لە قوتابخانەکەیان وەرگرن و ڕاستگۆیانە دانی بەوەدا نابوو کە ناتوانێت پارەی خوێندنەکەشی بدات. بەوانی وتبوو: "باوەڕ

بکەن ئەو کوڕێکی خراپ نییە، ئالوودەی ماددە هۆشبەرەکانیش نییە.
بەڵێنتان پێدەدەم کە گرفت و کێشەتان بۆ دروست نەکات."

لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا، پەیمانگەیەکی ئەهلی بەناوی "بندینگ ئۆکس" (Bending Oaks)ی پەیدا کردبوو کە بە مەرجی خوێندنی چەند وانەیەکی وەك قەرەبوو کردنەوە، ئامادە بوون من وەرگرن. داوای گواستنەوەم لە قوتابخانەکەم کرد و دواجار توانیم لەکاتی خۆیدا، بڕوانامەکەم وەرگرم. لە ڕێوڕەسمی کۆتایی خوێندندا، کڵاوەکەی من لەگەڵ ئەوانی دیکەدا جیاواز بوو، بەڵام ئەم بابەتە لای من هەر هیچ گرنگ نەبوو. ئێمە تێچووی ڕێوڕەسمەکانی کۆتاییهاتنی خوێندنمان دابوو، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبووین لەکیسی بدەین. ئەوەی بۆ بەشداری لە ڕێوڕەسمەکەدا پێویست بوو، وەك جلوبەرگ، گوڵ، ئوتۆمبێل، ئامادەم کرد. دەمویست بەمشێوەیە سوپاسی دایکم بکەم. ئەو زۆر بە منەوە هیلاك بووبوو، لەم ساڵانەدا لەبەر من بەرگەی زۆر ناخۆشی و سەختڵەتی گرتبوو. ژنێکی تەنیا لەگەڵ کوڕێکی لاو و موچەیەکی کەم. ئاواتەخواز بووم کە بوێری و ئارامگرتنی ئەوم هەبێت. ئەو دەیزانی کە هەوڵ و کۆششە ڕاستگۆیانەکانی، ڕۆژێك بەر دەگرن و هەموو جارێك دەیووت: "هەوڵ بدە، وەك هەلێك لە لەمپەرەکان بڕوانی." دەمزانی کە خۆیشی لە گەورەکردنی مندا، هەر ئەم کارەی کردووە.

ئەو شەوەمان کردە جەژن و تەواو بە خۆشی ڕامانبوارد.

دایکم دووبارە هەستی بە خۆشبەختی دەکرد. کاتێك تەمەنم ١٧ ساڵ بوو، ئەو پیاوێکی بە ناوی "جان والینگ" (John Walling) ناسی.

پیاوێکی باش بوو، دواجار دایکم هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا کرد. ئەوم خۆش دەویست و پێکەوە بووبووینە هاورێ، بەڵام کە ساڵی ١٩٩٨ لە یەکتر جیا بوونەوە، من پێم ناخۆش بوو.

پێکەنیناوی بوو، خەڵك پێیان دەوتم: "ئەمڕۆ باوکتمان بینی" و من نەمدەزانی مەبەستیان کام یەك لەو سێ پیاوەیە! ڕاستگۆیانە بڵێم: باوکمم نەدەناسی، لەگەڵ "تێری"شدا قسەم نەدەکرد، جاروبار هەندێك کەسی بنەماڵەی ئارمێسترانگ هەوڵیان دەدا پەیوەندیم لەگەڵدا دامەزرێنن، بەڵام من هیچ پەیوەندییەکم بەوانەوە نەبوو، پێمخۆش بوو لەم بوارەدا ڕێز لە هەستەکانم بگرن. ئارمێسترانگم بە خزمێکی ساختە دەزانی. هەڵبەت ئارمێسترانگەکان هەزاران بەڵگەیان دەهێنایەوە کە من پێویستم بە باوکە و هەروەها ئەوەشیان بیر دەهێنامەوە کە تێری کاری زۆری بۆ من کردووە، بەڵام بە بۆچوونی من، دایکم هەموو شتێکی دابوو بە من و هیچ هەستێکم لە ئاست ئەواندا نەبوو.

زۆربەی هاورێکانم دوای تەواو کردنی دواناوەندی، چوونە زانکۆی هەرێمایەتی، بۆ نموونە "ئێستیو" ساڵی ١٩٩٣ زانکۆی تەکساسی تەواو کرد. لە ڕاستیدا، پلانو دوای چەند ساڵ، دیداری سەر لەنوێی هاورێیانی بەخۆیەوە بینی، بەڵام من -لەبەر ئەوەی نەچووبووم بۆ زانکو- بۆ ئەم ڕێورەسمە بانگ نەکرام.

لە ژیانی پلانۆ وەڕز بووبووم. بە سپۆنسەری گرووپێکی بازرگانی نێوخۆیی بەناوی "سوبارو مۆنتگۆمێری" ( Subaru Montgomery)، بەشداریم لە پێشبڕکێکانی نێوخۆی وڵاتدا کرد.

بەڵام دەمزانی کە گۆڕەپانی سەرەکی ڕکەبەرییەکان لە ئەورووپایە و هەستم دەکرد هەر چۆنێك بووە دەبێت بچم بۆ ئەوێ.

ئێستا ئیدی لە پێشبڕکێی جۆراوجۆردا بەشداریم دەکرد، گەورە ساڵانم شکست دەدا و بۆ کات بەسەربردن، دەچووم بۆ فرۆشگای ریچاردسون بایك مارت کە هی جیم هۆیت بوو. جیم لە سەردەمی لاوێتیدا، پاسکیلسوارێکی بەتەماع بوو، پاشان بۆ سەربازی کردن چوو بۆ خراپترین شوێن کە ئەویش ڤێتنام بوو. کە سەربازییەکەی تەواو کرد و هاتبووەوە بۆ ماڵەوە، دیسان شوێن حەز و خولیاکەی خۆی کەوتبووەوە. لە هەوەڵەوە کارەکەی وەك دابەشکاری بەرهەمەکانی "کۆمپانیای شوین" دەست پێکردبوو، پاشان لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، فرۆشگای خۆیان دانابوو. ئەوان ماوەی چەندین ساڵ بە پێدانی پاسکیل، کەل وپەل و مووچە پشتیوانی پاسکیلسوارە لاوەکانی "دالاس"یان دەکرد. ئەو باوەڕی بەم کارە بوو، بۆیە لاوان بۆ وەرگرتنی خەڵات و کەل وپەل لەوان، پێکەوە ڕکابەریان دەکرد. لە دوایین ساڵی خوێندنی دواناوەندیدا، مانگانە مووچەیەکی ٥٠٠ دۆلاریم لە جیم وەردەگرت. ئەو نووسینگەیەکی لە پشت فرۆشگاکەی خۆیەوە هەبوو، لەوێ لە دەوری یەکتر کۆدەبووینەوە و پێکەوە قسەمان دەکرد. من گرنگیم بە قسەکانی بەڕێوەبەران و مامۆستایان قوتابخانە و باوەپیارەکانم نەدەدا، بەڵام حەزم دەکرد لەگەڵ جیم قسە بکەم. ئەو دەیووت: "ئەگەر پێوەرت لە پەیوەندی کردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا، پارەیە، زۆر شت هەن کە پێویستە فێریان ببیت. من دۆستانێکم هەن کە خاوەنی کۆمپانیای گەورە گەورەن و لە بەرامبەریشدا، دۆستانێکم هەن

که کاریان تەنیا بڕینی چیمەنی بەردەم ماڵانە." پیاوێکی جددی بوو، بۆیە لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەودا هەولّم دەدا حورمەتی بگرم.

جارێکیان لە پێشبڕکێکانی شەوانی سی شەممە لەسەر چوار شەممەدا، لەگەڵ یەکێك لە پاسکیلسوارە گەورەکاندا کە زۆریشم خۆش نەدەویست، تێك گیراین. لە کۆتایی ڕێگای پێشبڕکێکەدا، پاسکیلەکانمان بەر یەکتر کەوتن و لە حاڵێکدا کە خەریکبوو خۆمان بەیەکتردا دەکێشا، لە هێڵی کۆتایی پەڕینەوە و دەستمانکرد بە شەڕکردن. دواجار چەند هاوڕێیەك، ئێمەیان لە یەکتر دوور خستەوە، بەڵام من هەروا جنێوم بەو دەدا و هەمووان گاڵتەیان بە من دەکرد. جیم زۆر لە من تووڕە و دڵگران بوو، هەر بۆیە سوار پاسکیلەکەی من بوو و ڕۆشت. زۆرم ئەو پاسکیلە خۆش دەویست، لەبەر ئەوەی بەو پاسکیلە بەشداریم لە پێشبڕکێکانی مۆسکۆدا کرد و بڕیار بوو هەفتەی دواتر، هەر بەو پاسکیلە بەشداری لە پێشبڕکێیەکی دیکەدا بکەم، بۆیە ڕۆشتم بۆ ماڵی ئەوان و وتم: "دەکرێت پاسکیلەکەم پی بدەیتەوە؟"

وتی: "نا، ئەگەر قسەیەکت هەیە، سبەینێ وەرە بۆ ژووری کارەکەم."

ڕۆشتم، لەبەر ئەوەی زۆر تووڕە بوو، دەترسام تێك بگیرێین.. بابەتێکی دیکە کە جیمی نیگەران دەکرد، ئەوە بوو کە من بەخێراییەکی زۆر ئۆتۆمبێلم لێدەخوڕی.

چەند ڕۆژ دواتر، ئۆتۆمبێلەکەشمی لێسەندم. هەموو پارەکەیم –واتە ٥٠٠٠ دۆلارم– دابوو، بەڵام بەشێکی لەو مووچەیە بوو کە ئەو بۆ پاسکیلسواری لە تیپەکەیدا پێی دەدام. لە تووڕەییدا، شێت بوو بووم،

بیهێننه پێش چاوی خۆتان کاتێك کەسێك ئەو ئوتۆمبێله له کوڕێکی هەڤدە ساڵان وەرگرێتەوە کە زۆری حەز لێیەتی، چی روو دەدا. بێگومان ئەو کەسە دەچێتە لیستی رەشی ئەو کوڕەوە. بۆیە چیتر سەردانی "جیم"م نەکردەوە، لەبەر ئەوەی هەم تووڕە بووم و هەمیش لێی دەترسام. کاتێك کە دووبارە یەکترمان بینییەوە، چەندین ساڵ بە سەر ئەو رووداوەدا تێپەڕیبوو.

دوای ئەوە، شاربەدەر بووم. دوای پێشبڕکێکانی کلۆرادۆ سپرینگ و مۆسکۆ، چوومە تیپی هەڵبژاردەی پاسکیلسواری ئەمریکاوە و کریس مایکل، راهێنەری نوێی تیپەکە، پەیوەندی پێوەکردم. ئەو وەسفی منی بیستبوو، دەیزانی کە زۆر بەهێزم، بەڵام تەکنیکە پێویستەکان نازانم. ئەو بە منی وت، دەیەوێت گرووپێك لە پاسکیسوارە لاوەکانی ئەمریکا پێکبهێنێت. بارودۆخی وەرزش لە ئەمریکا باش نەبوو، ئەو بەشوێن لاوانێکی پڕ لە وزەدا دەگەڕا تا دووبارە بیبووژێنێتەوە. ناوی ئەو لاوانەی دیکەی هێنا کە بە بۆچوونی ئەو توانای شاراوەی پێویستیان هەبوو، کەسانێکی وەك بابی جولیچ و جۆرج هینکاپی، پاشان وتی دەمەوێ تۆش یەکێك لە ئەندامانی ئەو گرووپە بیت. حەزم دەکرد لە پێشبڕکێکانی ئەورووپادا بەشدار بم، ئەمەش دەیتوانی بۆ من خاڵی دەستپێك بێت.

پاسکیلسواری واتە قاچەکان توند بە پایدەرەوە بەستن و چەندین کاتژمێر یان تەنانەت چەندین ڕۆژ بێ پشوو و بە خێرایی ۲۰ بۆ ٤٠ میل لە کاتژمێردا پایدەر لێدان. پاسکیلسوارێك لە دۆخێکی لەو شێوەدا، هەندێك جار ناچارە بتڵە ئاوەکە بە پەلە بخواتەوە، جارجارەش چکلێتێك لەژێر کورسییەکەی دەربێنێت و بیخوات، چونکە پایدەر لێدانی ئاوا خێرا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەش ۱۰ بۆ ۱۲ لیتر شلەمەنیەکان لەدەست بدات، هەروەها دەبێتە مایەی ئەوەی کە ٦٠٠٠ کالۆری وزە بسوتێنێت. ئەو بۆ ئەنجامدانی هیچ کارێك، تەنانەت چوونە سەرئاو یان لەبەرکردنی جلوبەرکی گەرمیش، ناوەستێت! هیچ شتێك گرووپی پاسکیسوارانی جادە (Peloton) ناوەستێنێت. ئەوان لەژێر باران، بەنێو داوێنی کوێستانە ساردەکاندا ڕێدەکەن، لەسەر زەویە خزەکان و بەردە لارو گێڕەکاندا بەرز دەبنەوە و دەکەونەوە سەر زەوی، باش ئەوە دەزانن کە ستۆپی ڕەق یان جوولەی توندی سوکانەکە، خۆیان و پاسکیلەکەشیان پارچە پارچە دەکات.

نەمدەزانی ئامانجی سەرەکیم چییە و دەمەوێت بگەمە کوێ. لە تەمەنی ۱۸ ساڵیدا کاتێك کە ماڵەوەم جێهێشت، پێموابوو پێشبڕکێ، تەنیا سوار بوونی پاسکیل و پایدەر لێدانە. ئەو ڕۆژانە هەمووان منیان وەك کەسێکی "بزۆز" دەناسی و ئەم ناتۆرەیە، هەر لەو کاتەوە تا ئێستاش لێم نەبۆتەوە. هەڵبەت ڕەنگە راستیش بێت.. من زۆر لاو بووم و

دەبوو فێری شتانێکی زۆر بوومایە. کار گەلێکم دەکرد و شتانێکم دەووت کە رەنگە راست نەبووبن.. بەلاَم بەڕاستی هیچ مەبەستێکیشم نەبوو، حزم نەدەکرد وەك کەسانی نەزان هەڵسوکەوت بکەم.

لە یەکەم پێشبڕکێی گەورەی نێودەوڵەتیمدا، رێك پێچەوانەی قسەکانی راهێنەرەکەم جوولاَمەوە! ئەم رکابەرییە، پێشبڕکێی پاڵەوانی یاریزانە ناپیشەییەکانی دنیا بوو، کە ساڵی ۱۹۹۰ لە شاری ئوتسانۆمیا (Utsunomiya)ی ژاپۆن بەڕێوەچوو. مەودای پێشبڕکێکە ۱۱۵ میل بوو، هەورازێکی کورر و دوور و درێژیشی تێدابوو. ئەوەی کە دۆخەکەی قورستر دەکرد ئەوە بوو کە رۆژی پێشبڕکێکە، هەوا زۆر گەرم بوو، دەتووت پلەی گەرما بۆ بەرزترین پلە لە سەدەی نۆزدەدا بەرز بۆتەوە! من ئەندامی تیپی هەڵبژاردەی ئەمریکا بووم کە "کریس کارمایکل" (Chris Carmichael) راهێنەرمان بوو. کریس راهێنەرێکی لاو بوو، قژێکی خەنەیی و دەموچاوێکی خالاَوی هەبوو. تا ئەو کاتە ئەوم بە باشی نەدەناسی، بۆیە زۆرم گوێ بە قسەکانی نەدەدا.

ئەو بەوردی رێنوێنی من کرد و داوای لێکردم لە ماوەی پێشبڕکێکەدا، لە پشت گرووپێك لە پاسکیلسوارانەوە برۆم و پێش هەر جووڵەیەك، چاوەڕوانی ئاماژەی ئەو بم. هەوا زۆر گەرم و رێڕەوی پێشرکێکەش هێندە تاقەت پڕوکێن بوو، بە پێچەوانەشەوە بای دەهات، بۆیە بواری ئەوە نەبوو لە پێشەوەی گرووپەکەوە برۆم. ژیرانەترین کار ئەوە بوو کە وزە و توانام بپارێزم و ئامادە بم.

کریس وتی: "دەبێ چاوەڕوان بیت. نامەوێ لە پێشیانەوە بڕۆیت، تا باکە لێتدات.."

من وەك نیشانەی گوێرایەڵ بوون، سەرێکم بۆ لەقاند و بەرەو هێڵی دەستپێك ڕۆشتم. لە گەڕی یەکەمدا بە قسەم کرد و تاڕادەیەك لە کۆتایی گرووپەکەوە پایدەرم لێدەدا، بەڵام دوای ماوەیەك، چیتر نەمتوانی پێش بە خۆم بگرم. حەزم دەکرد قاچەکانم تاقی بکەمەوە، هەر بۆیە دەستمکرد بە خێرا پایدەر لێدان و لانسم وەرگرت. لە گەڕی دووەمدا من لە پێشەوە بووم، کاتێك کە بە نیشانەی[٢] یەکەم گەیشتمە شوێنی دیاریکراو، هیچ پاسکیلسوارێکی دیکەم لە تەنیشتەوە نەبوو.. وەك بروسکە بە پێش "کریس"دا تێپەڕیم. هەروا کە دەڕوشتم، سەیرێکی ئەوم کرد. کریس دەستەکانی کردبۆوە، وەك بڵێی دەیویست پێم بڵێت: "خەریکی چیت؟"

بزەیەکم بۆ کرد و تێپەڕیم.

کریس ڕووی کردە تیمی هونەری تیپەکە و دەستی بە هاوار هاوار کرد: "ئەو کوڕە بۆ وا دەکات؟!"

خەریك بوو چیم دەکرد؟ تەنیا خەریکی پایدەر لێدان بووم. کارێکی تەواو نەگونجاو! من هەروا لە ماوەی سێ گەڕی دواتردا، پێشەنگ و نزیکەی خولەك و نیوێك، لە پێش ئەوانی دیکەوە بووم. هەستێکی زۆر باشم هەبوو، کە لەناکاو گەرمایەکی توند بەسەرمدا زاڵ بوو. هەر لەو

[٢]– مەبەست لە نیشانە، هەمان "چێك پۆینت"ە کە لە پێشبڕکێ وەرزشییەکاندا بەکار دەهێندرێت.

کاتەدا زانیم کە نزیکەی ٣٠ کەس لە پاسکیلسوارەکان پێم گەیشتوونەوە. هێشتا پێشبڕکێکە نەگەیشتبووە نیوە کە ماندوو بووم.. هەوڵم دەدا پێش ئەوانی دیکە بکەوم، بەڵام وزەی ئەوەم تێدا نەبوو. گەرمای هەوا و هەورازە کورەکان، هێزیان لەبەر بڕیم و دواجار پلەی یازدەهەمم بەدەست هێنا.

هەرچۆنێك بیت، ئەم پلەیە، لە مێژووی پێشبڕکێکانی ئەمریکادا، باشترین ئەنجام بوو، بۆیە کریس زیاتر لەوەی کە تووڕە بێت، خۆشحاڵ دەبیندرا!

چوینە کافتریای هوتێلەکە، پێکەوە شتێکمان خواردەوە و کەمێك قسەمان کرد. من بەتەواوی نەمدەزانی چ هەستێکم لەئاست "کریس"دا هەیە. کاتێك کە بۆ یەکەم جار لە پلانۆ هاتمە دەر، کریس تیپی هەڵبژاردەکەی کرد بە دوو گروپ، منی لە گرووپی "ب" دانابوو. هێشتاش من لەسەر ئەم کارەی لەو خۆش نەبوو بووم.. سەرەڕای هەموو ئەمانە، کریس تەحەمولێکی زۆری هەبوو، رەفتاری دۆستانە بوو. وێڕای ئەوەی کە ئەزموونێکی زۆری لە بواری پاسکیلسواریدا هەبوو، لە پاڵەوانە کۆنەکانی ئۆلۆمپیك بوو، لەگەڵ "گێرگ لیمۆند"دا پێشبڕکێی کردبوو.

من و کریس، هێواش هێواش شەربەتمان دەخواردەوە و سەبارەت بە رووداوەکانی ئەو رۆژە قسەمان دەکرد و پێدەکەنین. لەپڕ کریس، خۆی جددی کرد و پیرۆزبایی بەدەستهێنانی پلەی یازدەهەمی لێکردم. ئەو وتی بە کارەکەی من دڵخۆش بووە: "تۆ نیگەرانی ئەوە نەبووی بدۆڕێیت..

هیچ بیرت لەوە نەدەکردەوە ئەگەر ئەوانی دی پێت بگەنەوە، چی ڕوو دەدات؟!" من بە خۆشحاڵییەوە گوێم بۆ ستایشەکانی ئەو گرتبوو.

بەڵام دوایی وتی: "هەڵبەت ئەگەر بتزانیبایە چی بکەیت، وزەی خۆت پاشەکەوت بکردبایە، بەدڵنیاییەوە مەدالیات وەردەگرت."

من لەم پێشبڕکییەدا، باشتر لە بەشداربووانی پێشووی ئەمریکا، پاسکیلم ئاژووتبوو، بەڵام کریس لەو باوەڕەدا بوو کە ئەنجامەکە زۆریش باش نەبووە. لەڕاستیدا ئەو بە شێوەیەکی جوان و گوفتێکی شیرین، تێیگەیاندم کە پێشبڕکێکەم تێکداوە. ئەو بەمشێوەیە درێژەی بە قسەکانی دا: "من دڵنیام تۆ دەتوانی زۆر لەوە باشتر بیت. من باوەڕم بەوەیە کە تۆ لە داهاتوودا دەبیتە پاڵەوانی جیهان.. بەڵام زۆر کار هەن کە پێویستە بیانکەیت."

کریس وتی: "پاسکیلسوارە یەکەمەکان، وەك "مارکۆ پانتانی" (Marco Pantani) و میگۆئیل ئیندۆراین، وەك تۆ بەتوانا و تەنانەت لە تۆش بەتواناتر بوون. هەروەها هەمووی ئەو کەسانەی لەم پێشبڕکێیەدا، لەگەڵ تۆدا ڕکابەریان دەکرد، وەك تۆ بەهێز یان تەنانەت بەهێزتر لە تۆ بوون."

ئەو شتەی منی لەوانی دیکە جیا دەکردەوە، فەن و تاکتیك بوو. دەبوو فێر ببم کە چۆن پێشبڕکێ ئەنجام بدەم. تەنیا شوێنێکیش کە دەمتوانی ئەم شتانە لەوێ فێر ببم، سەر پاسکیل بوو.. لەو ساڵەدا، دەبوو ٢٠٠ ڕۆژ لە دەرەوەی وڵات بم، دەوران دەوری ئەورووپا بە پاسکیل ببڕم، لەبەر

ئەوەی کە پاسکیلسوار دەبێ لە جادەدا خۆی تاقی بکاتەوە. سەد و شەست میل پاسکیل لێخوڕین هەموو شتێکی دیاری دەکرد. بردنەوە و دۆڕاندن واتایەکی نەبوو. لە کۆتاییدا یان دەتبردەوە یان دەدۆڕای. پلەبەندییەك لەگۆڕێ نەبوو.

کە گەڕامەوە لە ئاستین نیشتەجێ بووم. ئاستین، یەکێك لە شارەکانی تەکساسە، کە لێوارە رەنگ سەوز و پڕ لە بەردەکەی، دەوری دەریاچەی شاری داوە. بەشێك لە ئاوی خوڕی روباری کۆلۆڕادۆ (Colorado) دەرژێتە ئەم دەریاچەوە. لە ئاستین کەس سەرنجی جلوبەرگەکانی منی نەدەدا. یان بۆ کەس گرنگ نەبوو کە من خەڵکی ئەوێم یان لە شوێنێکی دیکەوە هاتووم.. هەر لە بنەڕەتدا لەوێ دوو کەست نەدەدۆزییەوە کە هاوشێوەی یەکتر جلیان لەبەر کردبێت! بۆ نموونە هەندێك لە دەوڵەمەندترین کەسانی ئەو شوێنە، شرپۆش بوون.

دەتووت ئەم شارەیان بەتایبەت بۆ لاوان دروست کردووە، ئەمسەر بۆ ئەو سەری شەقامی شەشەم، پڕ بوو لە کافێ شۆپ و کلوپی شەوانە.

لە هەمان کاتدا شوێنێکی باشیش بوو بۆ ئەوەی فێری پاسکیلسواری ببیت، لەبەر ئەوەی جادەی لاوەکی دووردورێژی زۆر تێدابوو کە دەکرا چەندین میل پاسکیلسواریان تێدا بکرێت. من لە نزیك زانکۆی تەکساس خانوێکی یەك نهۆمیم بەکرێ گرت. ئەم خانووە بۆ من بەس بوو، چونکە لەو کاتەدا من خوێندکاری زانکۆ بووم. هەڵبەت نەك لە پۆلی وانە خوێندندا، بەڵکو لەسەر پاسکیل!

وەك ئەوەی من تێگەیشتبووم، پاسکیلسواری وەرزشێکی ئاڵۆز بوو کە تێکەڵ بە سیاسەت بووبوو، بەپێچەوانەی تەسەوری تەماشاچییەکان، زیاتر لە ئاستی وەرزشێکی گروپی بوو. ئەم وەرزشە زمانێکی تایبەت بەخۆی هەیە، کە لە کۆمەڵێك وشە و دەستەواژەی ئەورووپی پێکهاتووە. هەروەها سیستمێکی ئەخلاقی سەیریشی هەیە. هەر پاسکیلسوارێك لە تیمەکەدا ئەرکێکی لە ئەستۆیە و بەرپرسیارێتی بەشێك لە پێشبڕکێکەی لەسەر شانە. ئەو پاسکیلسوارانەی لەوانی دیکە خاوترن، خزمەتکار (Domestiques -- Servant)یان پێدەوترێت. ئەمانە کاریان ئەوەیە کە نەهێڵن با لە پاسکیلسوارەکانی دیکە بدات و هەروەها ڕێبەری تیمەکەش لە مەترسییەکان دەپارێزن. ڕێبەری تیم، پاسکلیسواری سەرەکییە. واتە کەسێك کە دەتوانێ بەخێرایی ١٥٠ میل بەرەو هێڵی کۆتایی پایدەر لێبدات.

من لە هەوەڵەوە، ئەم ئەرکەم لەسەر شان بوو، بەڵام بەرەبەرە بۆ گەیشتن بە پلەی ڕێبەری ڕاهێنانم پێکرا. سەبارەت بە گرووپی سەرەکی پاسکیلسواران کە لەڕاستیدا هەیکەلی سەرەکی تیمەکە بوون، هەندێك شت فێربووم. لە ڕوانگەی تەماشچییەکانەوە، ئەم گرووپە، وەك پەڵەیەکی ڕەشە کە بە تەنیشت ئەواندا تێدەپەڕێت. ئەوان پێیانوایە ئەم پەڵەیە وەستاوە، بەڵام ڕاستییەکە شتێکی دیکە. ئەم پەڵە ڕەنگاوڕەنگە، ئارام و قەراری نییە و پڕ ئاڵۆزییە.. سوکانی پاسکیلەکان، ئەنیشك و ئەژنۆی پاسکیلسوارەکان، بەردەوام بەر یەکتر دەکەون، پاسکیلسوارەکان بەردەوام پێکەوە قسە دەکەن.. خێرایی ئەم گرووپە، جیاوازە.

هەندێکجار خێراییەکەیان ٢٠ میله و پاسکیلسوارەکان بەهێواشی پایدەر لێدەدەن. هەندێکجاریش بە جادەکەدا بڵاو دەبنەوە و بە خێرایی ٤٠ میل دەئاژوون. لەم کاتەدا هەندێك قسە لە نێوان رکابەرەکاندا دەکرێت: "ئەمڕۆ رێمْ پێبدە، سبەینێ من رێت پێدەدەم... رێم پێبدە، لە بەرامبەردا هاوڕێیەکی هەمیشەیت هەبێت.." بێگومان تۆ کارێك ناکەیت کە پێگەی خۆتان یان تیمەکەتان بخەیتە مەترسییەوە، بەڵام ئەوەندەی بتوانی یارمەتی پاسکیلسوارەکانی دیکە دەدەی، بۆ ئەوەی ئەوانیش رۆژێك ئەم مەحەبتە قەرەبوو بکەنەوە.

هەندێکجار ئەم سیاسەتانە بۆ پاسکیلسوارە لاوەکان، ناڕوونە و تەنانەت نیگەرانیان دەکات. سەرەتای ساڵی ١٩٩١، وانەیەکی قورسم لەوان وەرگرت. بەرنامەی من ئەوە بوو لە ئۆلۆمپیکی ٩١ی بەرشەلۆنە(Barcelona)دا، وەك ناپیشەیی(ئاماتۆر)ێك بەشداری بکەم و دوای ئەوە ببمە یاریزانێکی پیشەیی. ئەو سەردەمە، هاوکات، بۆ یانەی سوبار و یانەی مۆنتگومری، پێشبڕکێم ئەنجام دەدا. لە رووی هونەری(فەنی)یەوە من ئەندامی دوو یانەی جیاواز بووم: لەسەر ئاستی نیشتمانی، ئەندامی تیمی هەڵبژاردەی ئەمریکا، بە راهێنەرایەتی کریس کارمایکل بووم و لەسەر ئاستی یانەکاشدا، ئەندامی یانەی سوبارو مۆنتگومری بووم.

ساڵی ١٩٩١ کە لەگەڵ تیمی هەڵبژاردەی ئەمریکادا چووبووینە دەرەوەی وڵات، لە ئیتالیا بەشداریی پێشبڕکێی ستیمانا برگاماسکا

(Settimana Bergamasca)مان کرد کە پێشبڕکێیەکی بەناوبانگە. ئەم پێشبڕکێیە، پێشبڕکێیەکی پیشەیی – ناپیشە(ئاماتۆر)یی بوو کە پاسیکسوارەکان لە ماوەی ١٠ ڕۆژدا، بە پاسکیل هەموو باکوری ئیتاڵیایان دەبڕی. ژمارەیەك لە بەناوبانگترین پاسکیلسوارانی دنیا لەم پێشبڕکێیەدا بەشداری بوون. تا ئەو ڕۆژە هیچ پاسکیلسوارێکی ئەمریکی لەم پێشبڕکێیانەدا هیچ پلەیەکی بەدەست نەهێنابوو، بەڵام تیمەکەی ئێمە بە ڕاهێنەرایەتی کریس، هەم ورەیەکی بەرزی هەبوو، هەمیش لە ڕووی کاری بەکۆمەڵ(هەرەوەزی)دا لە ئاستێکی باشدا بوو. لەبەر ئەم هۆکارانە، هەستمان دەکرد لەم پێشبڕکێیانەدا سەرکەوتوو دەبین.

بەڵام کێشەیەك هەبوو. یانەی "سوبارو مونتگومری"ش لەم پێشبڕکێیانەدا بەشدار بوو، من دەبوو بە ترێسی تیمی هەڵبژاردەوە لە بەرامبەر ئەواندا پێشبڕکێم بکردبایە. من لەگەڵ ئەواندا ئەندامی یەك یانە بووم، بەڵام لەم پێشبڕکێیانەدا، بە ڕکابەری من دادەندران. هەر لەسەرەتای پێشبڕکێکەدا، یەکێك لە پاسکیلسوارەکانی سوبارو مونتگومری بەناوی "نێت ریس" (Nate Reese)، کە یەکێك لە هاوڕێیانی من بوو، پێش هەمووانی دایەوە. منیش باش پایدەرم لێدەدا و کەسی دووەم بووم. لەوەی کە هەردووکمان لە پێش هەموانەوە بووین لە خۆشیان لە کەوڵی خۆماندا جێمان نەدەبۆوە.. بەڵام بەڕێوەبەری تیمی سوبارو مونتگومری، هەستێکی دیکەی هەبوو. ئەو بە بینینی من زۆر خۆشحاڵ نەبوو، ئەم هەستەشی لە من گەیاند. لە نێوان دوو قۆناغدا بانگی کردم و وتی: "تۆ لە بەرژەوەندی نێت کار دەکەی" من حەپەسا

بووم و زەق زەق سەیرم دەکرد و نەمدەزانی مەبەستی چییە. بێگومان مەبەستی ئەوە نەبوو کە من بکشێمە دواوە و ڕۆڵی خزمەتکاری بۆ نێت ببینم.. بەڵام ڕێك هەر ئەو مەبەستەی هەبوو! ئەو فەرمانی بە من کرد: "مافی خۆکوژمدانت نییە" و پاشان ڕاشکاوانە پێی وتم کە: "دەبێت نێت براوە بێت."

من دەرهەق بە هەڵبژاردەی وڵاتەکەم تەواو بەئەمەك بووم. دۆخی ئێمە لەچاو بەشداربووەکانی دیکەدا، زۆر خراپ بوو. لە هوتێلێکی بچووك لاماندابوو کە لە هەر ژوورێکیدا سێ کەسی تێدابوو. هیچ پارەیەکیشمان پێنەبوو.. دۆخی داراییمان بەشێوەیەك بوو کە، کریس هەموو شەوێك بتڵە ئاوەکانی ئێمەی دەشۆرد تا دووبارە بەکاریان بهێنینەوە. لە کاتێکدا کە تیمە پیشەییەکانی وەك سوبارو مونتگومری، دوای خواردنەوەی ئاوەکە بتڵەکانیان فڕێ دەدا. ئەگەر ئەم پێشبڕکێیەم ببردبایەوە، سەرکەوتنێکی گەورە بۆ پاسکیلسوارەکانی ئەمریکا تۆمار دەکرا.. بەڵام بەڕێوەبەری تیمی بازرگانییەکەم، فەرمانی پێکردبووم بکشێمەوە.

چوومە لای کریس و بابەتەکەم بۆ باس کرد. کریس وتی: "لانس! ئەم پێشبڕکێیە هی تۆیە، تۆ ناتوانی گوژم بەر خۆت نەدەیت... ئەمە مافی خۆتە.." ڕۆژی دواتر، بەوپەڕی تواناوە پایدەرم لێدەدا. بیهێننە پێش چاوی خۆتان: سەد کەس پێکەوە پایدەر لێدەدەن، بە هەورازێکدا سەردەکەون. بەرەبەرە ٥٠ کەس دوا دەکەون، کەمێك دواتر ٢٠ کەسی دیکە و پاشان ١٠ کەس... ئێستا تەنیا ١٥ یان ٢٠ کەس ماونەتەوە.

ئەم پێشبڕکێیە، وەهایە کە تا دێت کەسەکان کەم دەبنەوە. بۆ لاواز کردنی ورەی ڕکابەرەکان، خۆت گوژم دەدەیت و خێراتر لێدەخوڕیت. ئەوانەشی کە ماون ، وەلا دەنرێن. ئەمە خەسڵەتی پاسکیلسوارییە. بەڵام ئێستا داوایان لە من کردبوو لە بەرژەوەندی نێت، بکشێمەوە.. تا زیاتر بیرم دەکردەوە، زیاتر بە گاڵتەجاڕانە دەهاتە پێش چاوم!

بە خۆم وت: "ئەگەر نێت هێندە بەهێزە کە دەتوانێ براوە بێت، من هیچ قسەیەکم نییە، بەڵام ئەگەر نەیتوانی، من چاوەڕوانی ئەو نابم." نێت ئەم توانایە نەبوو، منیش چاوەڕێم نەکرد.

من لەگەڵ پاسکیلسوارە پێشەنگەکاندا پایدەرم لێدەدا، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە نێت بیست خولەك دوا کەوتبوو. سەرپەرشتیاری سوبارو مونتگومری، لەوپەڕی ڕق و توڕەییدا، ڕەفتاری لەگەڵ من و کریس کرد. ئەو وتی: "دەزانن چی دەکەن؟!" کریس بەرگری لە من کرد و وتی: "ئەمە پێشبڕکێی پاسکیلسوارییە و ئەویش پایدەر لێدەدات تا براوە بێت."

کاتێك خەریك بوو لەوان دوور دەکەوتینەوە، من زۆر نیگەران بووم. لە لایەکەوە پێموابوو چیتر ڕێ نادەن لە یانەکەیاندا بم و لە لایەکی دیکەشەوە، بیری و ئەندێشەی ئەمەکداری بۆ تیمی هەڵبژاردەی وڵاتەکەم وازی لێنەدەهێنام.. ئەو شەوە، من و کریس دووبارە پێکەوە قسەمان کرد. ئەو وتی: "گوێ بگرە، ئەگەر کەسێك پێت بڵێ نابێ لە پێشبڕکێدا خۆت گوژم بدەی، ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە ئەو لە چاکەی تۆ ئەم قسەیە

دەکات. ئەم پێشبڕکێیە زۆر گرنگە، تا ئێستا هیچ ئەمریکییەك نەیتوانییوە تیایدا براوە بێت. ئەگەر لەم پێشبڕکییەدا براوە بیت، بۆ داهاتووت زۆر باش دەبێت. سەرەڕای ئەوە، تۆ بۆ تیمی هەڵبژاردەی ئەمریکا پایدەر لێدەدەیت، بۆیە ئەگەر ئەوپەڕی هەوڵی خۆت نەدەی ئەمە چی دەگەیەنێت؟"

ئەو راستی دەکرد. ئەم کارە خراپترین واتای هەبوو: "بەداخم، سەرەڕای ئەوەی لە پێش هەمووانەوەم، دەبێ رێ بە کەسێکی دیکە بدەم کە پێشبڕکێکە بباتەوە." من نەمدەتوانی ئەم کارە بکەم، بەڵام نیگەرانی ئەوە بووم کە سەرپەرشتی ئەو تیمە بە قسە خراپەکانی، ناوم بزڕێنێت و داهاتووم خراپ بکات.

کریس وتی: "نیگەران مەبە. ئەو کارە بکە کە پێتوایە راستە. ئەگەر پێشبڕکێکە ببەیتەوە، داهاتووت گەش و روون دەبێت."

دەمویست لەگەڵ دایکم قسە بکەم، بەڵام نەمدەزانی لەو دۆخەدا دەتوانم ئەم کارە بکەم یان نا.. دواجار پەیوەندیم پێوە کرد.

ئەو وتی: "کوڕم، بارودۆخ چۆنە؟"

بە نیگەرانییەوە، بارودۆخەکەم بۆ باس کرد و وتم: "دایکە، نازانم چی بکەم. ئێستا لە پێشبڕکێکەدا پێگەیەکی باشم هەیە، بەڵام سەرپەرشتیاری تیمی سوبارو مونتگومری دەڵێ، دەبێ نێت ریس براوە بێت و من دەبێت یارمەتی ئەو بدەم."

لە وەڵامدا وتی: "لانس ئەگەر پێتوایە دەتوانی پێشبڕکێکە ببەیتەوە، ئەم کارە بکە."

"پێموایە دەتوانم."

"کەواتە بیر لەوان مەکەرەوە، تۆ براوە دەبیت. ری بە کەس مەدە هەڕەشەت لێبکات... سەرت دادەخەیت و پێشبڕکێکەت ئەنجام دەدەیت."

منیش سەرم داخست و پێشبڕکیم کرد.. لە پێش هەمووانەوە بووم، بەڵام لە پاسکیلسوارە خۆشەویستەکان نەبووم. لایەنگرانی تیمی سوبارو مونتگومری و ئیتاڵییەکان، تووڕە بوون لەوەی کە ئەمریکییەك لەپێشەوەیە. لەبەر ئەوە، وردە شوشە و کلێپسیان هەڵدەدایە سەر جادەکە، پاسکیلەکەم پەنچەر بوو. بەرەبەرە ئیتاڵییەکان لەگەڵ مندا میهرەبانتر بوون. ئەم رەوتە بەرەبەرە درێژەی هەبوو، گەیشتە ئەوە کە کاتێك لە هێڵی کۆتایی تێپەڕیم، ئەوان زۆر خۆشحاڵ بوون.

من توانیم پێشبڕکێکە ببەمەوە. سەرکەوتنێکی شیرین بۆ تیمی هەڵبژاردەی ئەمریکا تۆمار کرابوو. کریس و ئەندامانی هەڵبژاردەکەمان، هەموویان لە خۆشیان زەوق گرتبوونی. ئەو شەوە کاتێك لەسەر سەکۆکە هاتمەخوار، کریس قسەیەکی پێووتم کە هەرگیز لەبیری ناکەم.

ئەو پێی وتم: "تۆ رۆژێك دەبێت بە پاڵەوانی تۆردۆفرانس.."

پاسکیلسواری وەرزشێکە کە زیاتر لەوەی کە کەسەکە خۆشحاڵ بکات،

ئەو تووشی دڵەڕاوکێ دەکات. هەر بەو شێوەی کە پێشتر بەرنامەڕێژیم کردبوو، دوای پێشبڕکێکانی ئۆڵۆمپیک چوومە ریزی یاریزانە پیشەییەکانەوە.

لە ئۆڵۆمپیکی بەرشەلۆنا لاواز دەرکەوتم و پلەی ١٤ی پێشبڕکێی جادەییم بەدەستهێنا. بەڵام هەوڵی من ئەوە بوو کە یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی مێژووی پاسکیلسواری ئەمریکا بخەمە ژێر کاریگەری خۆمەوە.. ئەم پیاوەش، ناوی "جیم ئۆچۆویز (Jim Ochowicz) بوو، هاوڕێیانی بە "ئۆچ" بانگیان دەکرد. ئێمە پێکەوە گرێبەستێکی پیشەییمان واژۆ کرد. ئۆچ سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی یانەیەکی لە ئەستۆ بوو کە لە لایەن کۆمپانیای مۆتۆرۆلا (Motorola)وە سپۆنسەر (پشتیوانی دارایی) دەکرا. ناوبراو لە بەرپرسانی پاسکلیسواری ئەمریکا بوو. ساڵی ١٩٨٥، یەکەم کاروانی وەرزشی ئەمریکای پێکهێنا تا لە دەرەوەی وڵات پێشبڕکێ بکەن. ئەو سەلماندی کە پاسکلیسوارە ئەمریکییەکان دەتوانن لە پێشبڕکێکانی ئەوروپادا رکابەری بکەن (یەکێك لەو پاسکیلسوارانەی لەو هەڵبژاردەیەدا بوو، کریس کارمایکل بوو.) ساڵێك دواتر، واتە ساڵی ١٩٨٦، "گێرگ لێمۆند" بوو بەبراوەی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس و سەرنجی ئەمریکییەکان بۆ ئەم پێشبڕکێیانە راکێشرا.

ئۆچ هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە توانای لاوەکانی ئەمریکا گەشە پێبدات. هەر بۆیە کریس منی بەو ناساند.. شەوێك لەکاتی پێشبڕکێکانی تۆردۆپۆنتدا، کریس ئێمەی پێك ناساند. تۆردۆپۆنت گەورەترین

پێشبڕکێیەکە کە لە ئەمریکادا بەڕێوە دەچێت. من بۆ وتووێژ کردن، چوومە ئەو هۆتێلەی کە "ئۆچ" لەوێ دەمایەوە. لە راستیدا ئەو شەوە من جێگری باوکمم دەبینی، بەڵام خۆشم ئەوەم نەدەزانی!

(دوای دەزانن کە بۆچی نازناوی "جێگری باوکم"م بۆ ئەو بەکارهێنا.)

لە یەکەم نیگادا، وام هاتە پێش چاو کە پیاوێکی خۆش قسەی تەمەن نزیکەو ٤٠ ساڵ دەبێت. کە پێدەکەنی، ددانەکانی دەردەکەوتن.. ئێمە لە دەروی یەکتر دانیشتین و پێکەوە کەمێك قسەمان کرد. من بۆ ئەوم روون کردەوە کە لە کوێوە هاتووم و "ئۆچ"یش بە ئێمەی وت کە چ شتانێکی لە پاسکیلسوارێك دەوێت: ئۆچ بەدوای پاسکیلسوارێکدا دەگەڕا کە درێژە بە رێگای گێرگ لیمۆند بدات و ببێتە براوەی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس. تیمەکەی ئەو لە چەند پێشبڕکێیەکدا پلەیان بەدەست هێنابوو، بەڵام هەرگیز پلەی پاڵەوانێتیان بەدەست نەهێنابوو.

ئۆچ پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ئاوات و ئامانجەکانم چین. لە وەڵامدا وتم: "حەز دەکەم ببمە باشترین پاسکیلسواری دنیا. دەمەوێ بچم بۆ ئەورووپا و ببمە وەرزشکارێکی پیشەیی. من نامەوێت تەنیا پاسکیلسوارێکی باش بم، بەڵکو دەمەوێ باشترین بم.." هەر ئەم قسانە بۆ ئۆچ بەس بوون. ئەو گرێبەستێکی لەگەڵ مندا واژۆ کرد و منی نارد بۆ ئەورووپا.

یەکەم پێشبڕکێی من، کلاسیکا سان سباستیەن ( Clasica San Sebastian) بوو. پێشبڕکێیەکی یەك رۆژە کە تیایدا، بەشداربووان لە

کەش و هەوایەکی زۆر خراپدا، مەودای زیاتر لە سەد میل پایدەر لێدەدەن. ئەم پێشبڕکێیە، پێسشرکێیەکی مێژوویی و لە هەمان کاتدا تاقەت پڕوکێنە. شوێنی بەرێوەچوونەکەشی، ئاوایی باسک (Basque)ە کە شوێنێکی زۆر جوانی سەر رۆخی دەریایە.

رۆژی پێشبڕکێکە، کەش و هەوا باراناوی و کەمێك سارد بوو.. بۆ پاسکیلسوارێك هیچ شتێك لەوە قورستر نییە کە لە کەش و هەوای باراناویدا پاسکیل لێبخورێت، چونکە بەهیچ شێوەیەك ناتوانیّ لەشی گەرم بکات. هەموو جلوبەرگەکانی تەڕ دەبن و وەك پێست بە لەشەوە دەنووسێن. سەرما و ئارەقەی لەش تێکەڵ دەبن و تا مۆخی ئێسقانەکان رۆدەچن. ماسولکەکان توانای جووڵەیان نامێنێت و قورس دەبن.

ئەو رۆژە بەشێوەیەك باران دەباری کە مرۆڤی ئازار دەدا. پێشبڕکێکە لەو بارانە توندەدا دەستی پێکرد.. زۆر زوو لەوانی دی دوا کەوتم. تا کات زیاتر دەڕۆشت، زیاتر دوا دەکەوتم و لە کاتێکدا کە لە سەرمان هەڵدەلەرزیم، بەزەحمەت پایدەرم لێدەدا. ئیدی کەسم لە دەورو بەر نەبوو. تا دەهات ئەو کۆمەڵە پاسکیلسوارەی لە پێش منەوە دەڕۆشتن، کەمتر دەبۆوە. هەموو چەند خولەکێك یەکێك لەوان دەکشایەوە و درێژەی بە پێشبڕکێکە نەدەدا. منیش خەیاڵی ئەوەم کرد کە هەر ئەم کارە بکەم، ستۆپ بکەم و هێواش لادەمە قەراغ جادەکە. بە کارێکی سادە دەهاتە پێش چاو بەڵام من نەمدەتوانی لە یەکەم پێشبڕکێی پیشەییمدا، ئەم کارە بکەم. زۆر جێگەی شەرم بوو.. یاریزانەکانی دیکەی هاوڕێم چۆن بیریان

دەکردەوە؟

من پاشگەز نەدەبوومەوە.

لەبەر خۆمەوە وتم: بۆ ناکشێیتەوە؟

-نا، پیاو. تۆ هەرگیز خۆبەدەستەوە نادەیت...

پەنجا پاسکیلسوار کشانەوە، بەڵام من هەر وا پایدەرم لێدەدا. لە نێو ۱۱۱ پاسکیلسواردا، دوایین کەس بووم. من نزیکەی نیو کاتژمێر دوای یەکەم کەس، لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە. کاتێك بە دوایین هەورازدا هەڵدەگەڕام، تەماشاچییە ئیسپانییەکان پێم پێدەکەنین و هۆی هۆیان لێدەکردم. یەکێکیان بە گاڵتەپێکردنەوە وتی: "سەیری ئەو داماوە بکەن، دوایین کەسە.."

چەند کاتژمێر دواتر، لە فڕۆکەخانەی مەدرید (Madrid Airport) لەسەر کورسییەك کەوتبووم. دەمویست بۆ هەمیشە واز لە پاسکیلسواری بێنم. ئەم پێشبڕکییە، جددیترین پێشبڕکێی ژیانم بوو. کاتێك بەرەو سان سباستیەن بەڕێکەوتم، پێموابوو براوە دەبم، بەڵام ئێستا حەزم دەکرد واز لە پاسکیلسواری بێنم.. ئەوان پێم پێدەکەنین.

پاسکیلسواری کارێکی زۆر قورستر لەوە بوو کە من بیرم لێدەکردەوە. خێرایی پێشبڕکێکە زۆر لەوە زیاتر بوو کە من بیرم لێدەکردەوە، ڕێگاکە زۆر قورستر و ئاستی پێشبڕکێکەش زۆر لەسەرەوە بوو. دەستەیەك بلیتی تەیارەم لە گیرفانم دەرهێنا. لە نێو بلیتەکاندا، بلیتی گەڕانەوە بۆ

ئەمریکاشی تێدا بوو. بەخۆم وت یەکێك لە بلیتەکان هەڵگرم. رەنگە واباشتر بێت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و شوێن کارێکی دیکە بکەوم.. کارێك کە بتوانم بیکەم.

بەرەو لایّ باجەیەکی تەلەفۆن چووم و تەلەفۆنم بۆ کریس کارمایکل کرد. پێموت، بەڕاستی نیگەرانم و بیر لەوە دەکەمەوە واز لە پاسکیلسواری بێنم. کریس تەنیا گوێی بۆ قسەکانم گرت و پاشان وتی: "تۆ لەم ئەزموونە، زیاتر لە هەر پێشبڕکێیەکی دیکە، فێری وانەی ژیان دەبێت." من کارێکی باشم کردبوو کە تا کۆتایی پێشبڕکێکە خۆم نەدۆڕاندبوو. بەم کارەم بۆ هاوڕێ پاسکیلسوارەکانم سەلماندبوو کە پاسکیلسوارێکی کەلەڕەقم. ئەوان دەبوو لەوە دڵنیا بن کە من لە هیچ هەلومەرجێکدا، پاشگەز نابمەوە. ئێستا ئیتر باش لەوە تێگەیشتبوون و دڵنیا بوون.

لە وەڵامدا وتم: "زۆر باشە، بەردەوام دەبم." تەلەفۆنەکەم دانایەوە و بە مەبەستی بەشداریکردن لە پێشبڕکێی دواتر، سواری تەیارە بووم. تەنیا دوو رۆژم بەدەستەوە بوو، دوای ئەوە دەبوو بەشداریم لە پێشبڕکێکانی پاڵەوانێتی زوریخدا بکردبایە. من دەبوو زۆر شت بە خۆم و بەوانی دی بسەلمێنم. چیتر بەهیچ نرخێك نەدەبوو بدۆڕێم.

لە پێشبڕکێکانی زۆریخدا پلەی دووەمم بەدەستهێنا. هەر لە سەرەتای پێشبڕکێکەوە خۆم تاودا و تارادەیەك لە هەموو ماوەی پێشبڕکێکەدا ئەم حاڵەتەم پاراست. من تاکتیکێکی تایبەتم نەبوو.. تەنیا سەرم داخستبوو و

پایدەرم لێدەدا. بۆیە، کاتێك کە لەسەر سەکۆی پلەی دووەم وەستابووم، زیاتر لەوەی کە هەست بە خۆشحاڵی بکەم هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد. بۆیە بە خۆمم وت، من دەتوانم. پەیوەندیم بە "کریس"ەوە کرد. کریس وتی: "بینیت؟". لە ماوەی چەند رۆژدا، لە پاسکلیسوارێکی تازەکارەوە بووبووم بە وەرزشکارێك کە شانازیم پێوە بکرێت. دوای بەدەستهێنانی ئەم پلەیە، لەملا و لاوە ورتە ورت سەبارەت بەوە دەبیسترا کە: "ئەم یاریزانە کێیە.. بەشوێن چییەوەیە؟"

ئەمە پرسیارێك بوو کە دەبوو خۆشم وەڵامی بدەمەوە. تا ئەو دەم، ئامادەبوونی پاسکیلسوارێکی ئەمریکی لە پێشبڕکێ جیهانییەکاندا، وەك ئەوە وابوو کە هەڵبژاردەی فەرەنسا لە پێشبڕکێکانی "بەیس باڵ"دا بەشدار بێت و ئەمەش شتێکی زۆر سەیر بوو.. من وەك میوانێکی ناوەخت، لە وەرزشێکی خۆشەویستدا بووم، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هیچ زانیارییەکم لە بارەی یاسا نووسراو و نەنووسراوەکان و رێسا ئەخلاقییەکانی ئەو وەرزشەوە نەبوو. لە راستیدا دەبێ بڵێم کە رەفتارە تەکساسییەکانی من، بەرواڵەت هیچ لای ئەورووپییەکان پەسند نەبوو. جیاوازییەکی زۆر لە نێوان رەفتاری خۆپارێزانەی ئەورووپییەکان و روانگەی پڕ لە فیز و بەخۆنازینی ئەمریکییەکان لە ئاست پێشبڕکێدا هەیە و منیش بە وەها روانگەیەکەوە گەورە بوو بووم.

منیش وەك زۆرینەی ئەمریکییەکان، گرنگیم بە پاسکیلسواری نەدەدا تا ئەوەی کە لیمۆند لە پێشبڕکێکانی ساڵی ١٩٨٦دا بردیەوە و لەپڕ

پاسکیلسواری سەرنجی منی بۆ لای خۆی راکێشا. لە ئەوروپا، هەموو کارەکان بەپێی پرنسیپێکی دیاریکراو ئەنجام دەدرا و کۆمەڵێك روانگەی تایبەت هەبوو کە من هیچ سەرم لێیان دەرنەدەچوو.. تازە ئەگەر فێریشیان بوومایە، هیچ بە پێویستم نەدەزانی کە جێبەجێیان بکەم!

کاتی پێشبڕکێ، گوێم بە هیچ شتێك نەدەدا. هیچ شتێك یان هیچ کەس، بەلامەوە گرنگ نەبوو... بە سەرکەوتنەکەمەوە دەنازیم و مشتم گرێ دەدا و بەرزم دەکردەوە و رام دەوەشاند. من هیچ کات شکستم قبوڵ نەدەکرد.. هەواڵنێرەکان خۆشیان دەویستم. لەوانی دیکە جیاواز بووم، بابەتێکی سەرنجڕاکێش بووم، بەڵام لە راستیدا خەریك بووم دوژمنم بۆ خۆم دروست دەکرد.

جادەکە پانە.. پاسکیلسوارەکان بەردەوام ئەملاو ئەو لا دەکەن، بۆ ئەوەی رێگایەك بدۆزنەوە و زۆر جار کاری ژیرانە و سیاسەتمەدارنە ئەوەیە کە رێیان بدەی. لە پێشبڕکێ چەند قۆناغی و دوور و درێژەکاندا، دەبێ رێ بەوانی دیکە بدەیت، چونکە رەنگە دواتر پێویستت بە یارمەتی ئەوان بێت. بستێك رێگا بکەرەوە و دۆستێك پەیدا بکە.. بەڵام من ئەم کارەم نەدەکرد. ئەم رەفتارە، تارادەیەك بەهۆی کەسایەتی منەوە بوو لەو سەردەمەدا: من کەسایەتییەکی نیگەران و بەرگریکارانەم هەبوو، نەمدەزانی توانام چەندە. من هێشتا هەر ئەو مندالە دڵناسکەی شاری پلانۆ بووم کە بە پەلە و تووڕە پایدەرم لێدەدا.. نەمدەزانی کە دەتوانم ئەم بستە رێیە قەرەبوو بکەمەوە!

هەندێکجار بە تووڕەییەوە هاوارم بە سەر پاسکیلسوارەکانی دیکەدا دەکرد و دەمووت: "یان بچۆرە پێش یان برۆ ئەو لاوە!" من نەمدەزانی کە پاسکیلسوارێك، بەهۆکاری جیاواز ڕەنگە بەهێواشی پایدەر لێبدات. بۆ نموونە ڕەنگە ڕاهێنەرەکەی، ناچاری بکات ئەم کارە بکات یان بەهۆی ماندووبوونەوە ناچار بێت.. یان ڕەنگە زیانێکی پێگەیشتبێت. کەواتە ئەرکی ئەو نەبوو کە بەردەمم چۆڵ بکات، یان ئەوەی کە توندتر پایدەر لێبدات تا من بتوانم بە خێراییەکی زۆرترەوە لێبخورم. (من چیتر بەم کارانە تورە نابم، زۆر جار خۆشم لەو کەسانەم کە ئارام و بەهێواشی پایدەر لێدەدەن.)

لە وەرزشی پاسکیلسواریدا، هەندێك جار پاسکیلسوارەکانی دیکە، دەتخافڵێنن تا تۆ براوە نەبیت. بەشێوەی جۆراوجۆر ئەم کارە دەکەن. ئەم کۆمەڵە پاسکیلسوارە تەنیا لەبەر ئەوە بەشداری پێشبڕکێ دەکەن کە ڕێ لەسەرکەوتنی تۆ بگرن، تەنیا و تەنیا لەبەر ئەوەی کە ڕقیان لێتە. ئەوان دەتوانن ڕێ لەوە بگرن کە تۆ پەیوەندی بە ئەندامانی دیکەوە بکەیت، یان کارێك بکەن کە ناچار بی هێواشتر پایدەر لێبدەیت، یان ئەوەی کە بە پێچەوانەوە، خێرایی پێشبڕکێکە زیاتر بکەن، تا تۆ خێراتر لە ئاستی چاوەڕوانی پایدەر لێبدەی و وزەت لەدەست بدەیت. بەخۆشییەوە من، هاوکارانێکی زۆر باشم هەیە. بۆ نموونە دەتوانم ئاماژە بە سین یاتس (Sean Yates)، ستیڤ بوێر (Steve Bauer) و فرانکی ئەندرۆ (Frankie Andreu) بکەم، ئەوان هەوڵیان دەدا بەسۆز و میهرەبانییەوە تێمبگەیەنن کە کارەکانم لە قازانجی خۆم و ئەوانی دیکە

نییه. فرانکی هەمیشە پێی دەوتم: "لانس، پێویستە هەوڵ بدەی خۆت کۆنترۆڵ بکەیت، بەم کارانەت، دوژمن بۆ خۆت دروست دەکەیت.." ئەوان دەیانزانی من کەسێکی خاراو و پێگەیشتوو نیم و ئەگەر بەشێوەیەکی توندوتیژانە رەفتار لەگەڵ مندا بکەن، هیچ ئەنجامێکیان دەست ناکەوێت، لەبەر ئەوە بە حەوسەڵە و بە دان بەخۆداگرتنەوە رێنماییان دەکردم.

لە وەرزشی پاسکیلسواریدا، ئەندامانی تیم، رۆڵی گرنگ و چارەنووسسازیان هەیە. لە یانەی مۆتۆرلا، من هەشت هاو گرووپم هەبوو، پێویستم بە تاك بە تاکی ئەوان بوو. لە هەورازە کورەکاندا، کەسێك لە پێشەوە دەرۆشت و من لە پشت ئەوەوە درۆشتم. بەم کارە، ٣٠٪ی وزەکەم بۆ دەگەرایەوە. یان ئەو رۆژانەی بای بهاتبایە، هاوگرووپەکانم وەك قەڵغانێك لە پێشمەوە دەرۆشتن و بەم کارەیان، ٥٠٪ی وزەم بۆ دەگەرایەوە. لە راستیدا لە هەر تیمێکدا، دەبێت کەسانێك هەبن کە بەرپرسیارێتی سەرکەوتن بە هەورازەکان و کارە دژوار و پڕ زەحمەتەکانی دیکە لەئەستۆ بگرن. کەواتە یەك پاسکیلسوار دەبێت درك بە هەوڵی و کۆششی تاك تاکی کەسەکان بکات و بەفیڕۆی نەدات. ئۆج وتەنی: "کێ ئامادەیە لە پێناو کەسێکدا پایدەر لێبدات کە براوە نابێت؟" بەڕاستیش پرسیارێکی باش بوو.. هیچ کەس ناتوانێت بەتەنیا، پێشبڕکێیەك بباتەوە. هاوکاری هەموو ئەندامانی دیکەی تیم و نیازپاکی و هاوکاری رکابەرەکان پێویستە تا براوە بیت. ئەوان دەبێ بیانەوێ کە بۆ تۆ و لەگەڵ تۆدا پایدەر لێبدەن.

لە مانگەکانی هەوڵی کارەکەمدا، یەك دوو کەس لە رکابەرەکانم هەر بەڕاستی دەیانەویست من لە بازنەکە بکەنە دەر. من سوکایەتیم بە قارەمانە گەورەکانی ئەورووپا دەکرد. لە هەوەڵەوە لە یەکێك لە پێشبڕکێکاندا، مۆرێنۆ ئەرجنتین (Moreno Argentin)یش بەشدار بوو. ئەو یەکێکە لە پێشەنگانی وەرزشی پاسکلیسواری و پلەی پاڵەوانێتی جیهانیشی هەیە. بەڵام من چوومە پێش و داوای ململانێم لێکرد. ئەو رۆژە، ١٥٠ پاسکلیسوار لە تەنیشت یەکترەوە پایدەریان لێدەدا، هەندێکجار یەکتریان دەخافڵاند، دەهاتنە بەردەم یەکتر و پاڵیان بە یەکترەوە دەنا.

من خۆم گەیاندە ئەرجنتین. ئەرجنتین بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم و وتی: "تۆ لێرە چی دەکەیت، بیشۆپ (Bishop)؟ بەو قسەیە زۆر تووڕە بووم. ئەو ناوی منی نەدەزانی و منی لەگەڵ یەکێك لە ئەندمانی هەڵبژاردەی ئەمریکا بەناوی "ئەندی بیشۆپ"دا لێ تێکچووبوو. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە: *ئەم پیاوە ناوی من نازانێت*. منیش ئەوم بە ناوی یەکێك لە ئەندامانی هەڵبژاردەکەیان بانگ کردو و وتم: "بێتاقەتت دەکەم، کیاپوسی (Chiapucci)!"

ئەرجنتین بەم قسەی من راچەنی. ئەو یەکێك لە پێشەنگانی ئەو بوارە بوو، منیش لاوێکی بێناوبانگی ئەمریکی بووم کە تا بردنەوە، رێگایەکی دوور و درێژم لەبەر بوو، کەچی ئێستا خەریکبوو سووکایەتیم بەو دەکرد. بەڵام لای خۆم وام بیر دەکردەوە کە ژمارەیەك سەرکەوتنی مژدەبەخشم

بەدەست هێناوە و پێویستە ئەو ناوم بزانێت. بەوم وت: "هۆی کیاپوسی! ناوم لانس ئارمێسترانگە. بێگومان تا کۆتایی پێشبڕکێکە تێدەگەی.." تا کۆتایی پێشبڕکێکە، تەنیا ئامانجم ئەوە بوو کە ڕێ نەدەم ئەو براوە بێت. بەڵام لە کۆتاییدا وزەم پێنەما. ئەم پێشبڕکێیە، پێشبڕکێیەکی پێنج ڕۆژە بوو، من نەمتوانی تا کۆتایی بەردەوام بم. من لەو کاتەدا زۆر بێ ئەزموون بووم. دوای کۆتاییهاتنی پێشبڕکێکە، ئەرجنتین هاتە کەمپەکەی ئێمە و هات و هاواری نایەوە. ئەو لە ڕەفتاری من نیگەران بوو، لای ئەندامانی دیکەی هەڵبژاردەکەمان سکاڵای دەکرد.

ئەمەش نەریتێکی دیکە ئەوان بوو کە ئەگەر پاسکیلسوارێکی لاو، هەڵسوکەوتی شیاوی نەبوو، ئەرکی گەورەترەکان (کەسانی بەئەزموون)ی تیمەکە بوو کە وریای بکەنەوە. بە دەربڕینێکی دی مەبەستی ئەرجنتین ئەوە بوو کە "ئێوە دەبێ شێوەی هەڵسوکەوتی دروست و جوان فێر ئەو بکەن."

چەند ڕۆژ دواتر، لە ئیتاڵیا پێشبڕکێم هەبوو. ئەم پێشبڕکێیە، پێشبڕکێیەکی کلاسیکیی یەك ڕۆژە بوو. وەك هەمیشە، هەمووان "ئەرجنتین"یان بە براوەی ئەم پێشبڕکێیە دەزانی.

لەبەر ئەوەی پێشبڕکێکە لە ئیتاڵیا بوو، هەمووان لایەنگیری یاریزانەکانی ئیتاڵیا و بەتایبەت پێشەنگی ئەوان واتە "ئەرجنتین" بوون. بێ ڕێزی کردن بە یاریزانێکی بەئەزموون لە وڵاتەکەی خۆیدا و بە پێش چاوی لایەنگران و سپۆنسەرەکانی، کارێکی ژیرانە نییە. من دووبارە

داوای ململانێم لەو کرد، بەڵام ئەمجارە ئەنجامەکە شتێکی دیکە بوو. لەم ململانێیەدا، من بردمەوە.

لە کۆتایی پێشبڕکێکەدا، چوار پاسیکیلسوار لەوانی دی لەپێشتر بوون. ئەرجنتین، کیاپوسی، پاسکیلسوارێکی نیوزلەندیی بەناوی سیرا (Sierra) و من، لە پێش هەمووانەوە دەڕۆشتم. من پێش ئەم سێ کەسەیشم دایەوە. ئەرجنتین باوەڕی نەدەکرد بە ئەمریکییەکی دەمشڕ بدۆڕێنێت.

بەڵام ئەو کارێکی کرد کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە. ئەرجنتین پێنج مەتری مابوو بۆ هێڵی کۆتایی، ستۆپی کرد. ئەو بە ئەنقەست تایەکانی قفڵ کرد. من پێشبڕکێکەم بردەوە، ئەو پلەی چوارەمی بەدەستهێنا و مەدالیاشی وەرنەگرت.

لەسەر سەکۆی خەڵات وەرگرتنەکە، سێ پلە هەیە و ئەرجنتین نەیدەویست لە تەنیشت منەوە بوەستێت. ئەم کارەی ئەو لە هەموو وتار و ئامۆژگارییەك زیاتر کاری تێکردم. لە راستیدا ئەو دەیەویست بەم کارەی تێمبگەیەنێ کە هیچ ڕێزێکی بۆ من نییە. لە راستیدا ئەو زۆر بەجوانی سوکایەتی بە من کرد.

لەو ساتە بەدواوە، من ڕێزێکی زۆرم بۆ ڕەوشت، هونەر، خۆراك، ئەدەبیات و سەد هێندەش بۆ پاسکیلسواری گەورەی ئیتاڵی، واتە مۆرۆنۆ ئەرجنتین، هەیە. من ڕێزێکی تایبەتم بۆ ئەو هەیە و کە یەکتر دەبینین، یەکتر لە ئامێز دەگرین و پێدەکەنین.

من شێتانه به نێو ئەو هەموو پاسكلیسوارەدا پایدەرم لێدەدا. هەندێكجار خۆم گوژم دەدا. تەنیا دەڕۆشتم.. هەر ئەوەندە بەس بوو كەسێك، پێشبڕكێكەی خێرا بكردبایە، منیش وەك ئەوم دەكرد، هەڵبەت ستراتیژییەكی تایبەتم نەبوو، تەنیا بەم كارەم دەمویست پێی بڵێم: "تەنیا هەر ئەوەندەت هێز و توانا هەبوو؟"

ئەنجام گەلی باشیشم بەدەست دەهێنا، لەبەر ئەوەی كە توانایەكی زۆرم هەبوو، هەروەها تەكنیكەكانی ئەوانی دیكەم بەكاردەهێنا، بەڵام زۆربەی كات، پەلاماردەرانە دەجووڵامەوە و دیسان هەمان ئەو هەڵەیەم دەكردەوە كە لە وڵاتی ژاپۆن كردبووم: بەهەموو هێز و تواناموە، بە تەنیا بۆ پێشەوە دەچووم و پاشان، وزەم لەبەر دەبڕا. هەندێك جار تەنانەت لە ریزی ٢٠ كەسی یەكەمیشدا نەبووم. دوای ئەوە یەكێك لە ئەندامانی هەڵبژاردەكەمان لێی پرسیم: "چ غەڵەتێكت دەكرد؟" و منیش بە دڕدۆنگییەوە دەمووت: "رازی بووم."

تەنیا شانسێك كە هەمبوو ئەوە بوو كە یاریم بۆ دوو راهێنەری ژیر و هەستیار دەكرد: لە هەڵبژاردەی ئەمریكادا، لەژێر دەستی "كریس"دا راهێنانم پێدەكرا و هاوكات لەگەڵ ئەوەدا، ئوچ و هەنی كیۆپەر، پێشبڕكێ رۆژانەكانی منیان بۆ تۆتۆرلا رێك دەخست. ئەوان چەندین كاتژمێر، بە تەلەفۆن پێكەوە قسەیان دەكرد و بیرو بۆچوونەكانیان پێكەوە دەگۆڕییەوە.

دواجار لەسەر بابەتێكی گرنگ رێكەوتن: توانای من، لەڕێی فێركردنەوە

کۆنترۆڵ نەدەکرا. راهێنەرێك دەتوانێ فێری قوتابییەکانی بکات کە چۆن توانای خۆیان کۆنترۆل بکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانێ ئەوان فێری بەتوانایی بکات.

ئەوان دەیانزانی کە کارە توند و تیژەکانی من، دوژمنم بۆ دروست دەکات، بەڵام رەنگە هەر ئەم توندوتیژییە رۆژێك بەهرەیەکی بەنرخی لێ دروست ببێت. بە بڕوای کریس و ئۆچ، پێشبڕکێکانی خێرایی، تەنیا بۆ تەحەمول کردنی ئازار نییە، بەڵکو بۆ سەپاندنی ئازاریشە و ئەوان لە سروشتی پەلاماردەرانەی مندا، جۆرێك راوچێتیان دەبینی. جارێك، ئۆچ پێی وتم: "هەرگیز ناتوانین کەسێك فێری ئەوە بکەین کە چۆن چەقۆ راکێشێت، چونکە ئەم بابەتە بابەتێکی تەواو زاتییە. پێشبڕکێکانی پاسکیلسواریش هەر بەو جۆرەیە، خۆت هەڵمەخەڵەتێنە.."

ئۆچ و کریس، پێیان وابوو ئەگەر من بتوانم هەڵسوکەوتی خۆم کۆنترۆڵ بکەم، پاسکیلسوارێکی شیاوم لێدەردەچێت. بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر بە وریایی و بە پارێزەوە کۆنترۆڵیان دەکردم، چونکە دەیانزانی ئەگەر هاوار هاوار وەڕێ بخەن، یان دەکشێمەوە، یان بێگوێی دەکەم. ئەوان بڕیاریان دا هێواش هێواش فێرم کەن.

هەنێك شت هەن کە پێویستە لەڕێی ئەزموونەوە، فێریان ببیت. "ئۆچ و کریس"یش ئەو بوارەیان بۆ من رەخساند. لە هەوەڵەوە، من هیچ کات پێشبڕکێکانم هەڵنەدەسەنگاند. لای خۆم دەموت: "من بەهێزترین پاسکیلسوارم و هیچ کەس، بە قولاپەشم ناگاتەوە.." بەڵام دوای ئەوەی

لە چەند پێشبڕکێدا شکستم خوارد، دیسان بیرم کردەوە و ڕۆژێکیان بە خۆم وت: "ساتێك ئارام بگرە.. ئەگەر من بەهێزترین پیاوم، کەواتە بۆ نەمبردەوە؟"

بەرەبەرە، ئوچ و کریس زانین و زانیارییەکانی خۆیان سەبارەت بە تایبەتمەندیی پێشبڕکێ جیاوازەکان و چۆنێتی ئەنجامدانی ئەو پێشبڕکێیانەیان فێری من دەکرد. ئوچ دەیووت: "جار هەیە تۆ دەتوانی وزەکەت لە سودی خۆت بەکار بهێنی، بەڵام جاریش هەیە کە بەکارهێنانی وزە هیچ سودێکت پێناگەیەنێت."

بەرەبەرە گوێم بۆ قسەی پاسکیلسوارەکانی دیکە دەگرت و ڕێم دەدات کە کۆنترۆڵم بکەن. لەگەڵ دوو پاسکیلسواری بەئەزموون، بە ناوەکانی "سین ییتس" و "ستیڤ بۆیر"دا لە ژوورێکدا بووین. ئەم دوو کەسە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر من هەبوو. من لەسەر مێزی نانخواردنی شێواندا زۆر شتیان لێوە فێر بووم. ئەوان فێریان کردم کە کەسێکی ماقوڵ، واقیعبین و بەسوود بم. من تەژی لە وزە بووم، هەڵبەز و دابەزم دەکرد و ئەوان منیان کۆنترۆڵ دەکرد.

ئوچ نەك هەر منی کۆنترۆڵ دەکرد، بەڵکو لەوەش گرنگتر، فێری دەکردم. بۆ من زۆر قورس بوو لەساڵدا حەوت مانگی لە ئەورووپا بم. بیری خواردنە مەکسیکییەکان، زەوییە گەرم و وشکەکانی تەکساس، باڵەخانەکەم لە ئاستین و پەیکەری سەر شومینەکەم دەکرد. من گلەییم لە ئوتۆمبێلەکان، هوتێل و خواردنەکان هەبوو. بەردەوام دەمووت: "بۆ

لەم زیندانانانەدا بژین؟" بەڵام لە راستیدا خەریکبوو فێری یەکێك لە بنەماکانی پاسیکیلسواری دەبووم: بەڵاکانی وەرزشی پاسکیلسواری پەیوەندی بە شوێنی ژیانی پاسکیلسواریشەوە هەبوو. هەندێك لەو هوتێلانەی لێی دەماینەوە لە مسافیرخانەیەکیش خراپتر بوون. نانەوردە لە راڕەوەکاندا رژابوون، چەرچەفەکانیان مووی پێوەبوو. ئەو گۆشتەی لە رێستورانتەکاندا لێدەندرا وەك لاستیك وابوو، ماکارۆنییەکەی هەویر و قاوەیی بوو، تامی ئاوی رەنگ قاوەیی دەدا! بەڵام بەرەبەرە بەم دۆخە راهاتم و بەیارمەتی یاریزانەکانی هاوڕێم، ئەم کێشانە دەبوونە مایەی پێکەنین و جەفەنگ. هەموومان لە پێش دەرکی هۆتیل دەوەستان و چاوەڕوان بوون تا من دەست بە پرتە و بۆڵە بکەم.

کاتێك ئاوڕ لە رابووردوو دەدەمەوە و بیر لە "لانس"ی لاو و کاڵفام دەکەمەوە، تووڕە دەبم، بەڵام لە لایەکیشەوە بەزەیم پێیدا دێتەوە. لەژێر هەموو ئەو پێهەڵپرژان و بۆڵەبۆڵانەدا، من هەمیشە نیگەران بووم. نیگەرانی بەرنامەی دەرچوونی شەمەندەفەر، فرۆکە، پاس و هەروەها تەلەفۆنەکان بووم.. ئاخر نەمدەزانی بەو تەلەفۆنانە پەیوەندی بکەم. تەنانەت لە رێستورانتیشدا پەرێشان بووم، لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی لیستی خوارنەکان بخوێنمەوە.

جارێك ئۆچ، چەند ژاپۆنییەکی بۆ نانی شێوان دەعوەت کردبوو، من لەو دانیشتنەدا خراپەکاریم کرد. ئۆچ داوای لە پاسکیلسوارەکان کرد خۆیان بناسێنن. من لە شوێنی خۆم بەرز بوومەوە و بە دەنگێکی بەرز وتم:

"سڵاو، من لانسم لە تەکساسەوە." هەمووان پێکەنین. ئەوان هەروا بە من پێدەکەنین.

بەڵام ژیانی ئەورووپا منی خاراو کرد. لە "لیک کۆکۆ" ( Lake Komo)ی ئیتالیا باڵەخانەیەکم بەکرێ گرت. ئەم ئاوایییە تەمومژاوی و غوبار گرتووە کە لە داوێنی زنجیرە کێوی ئالپ هەڵکەوتووە، هەموو بینەرێك دەتاسێنێت. بەرەبەرە تێگەیشتم کە توانایەکی باشم هەیە بۆ فێربوونی زمانە بیانییەکان. تارادەیەك زمانەکانی ئیسپانی، ئیتاڵی و فەرەنیسم دەزانی و لە حاڵەتی پێویستدا دەمتوانی کەمێکیش بە ئەڵمانی بدوێن. هەموو ڕۆژێك سەیری جامخانەی دوکانەکانی میلانم دەکرد. تازە خەریکبوو فێر دەبووم کە چاکەت و پانتۆڵی کەشخە چۆنە. دوانیوەڕۆیەك چووم بۆ کڵێسای دوۆمۆ (Duomo)[٢] و لەپڕ هەموو تەسەوراتەکانم سەبارەت بە هونەر گۆڕان. ڕەنگکاری و گونجانی ڕەنگەکان، ڕەنگی خۆڵەمێشی هێورکەرەوەی ڕاڕەوەکان، درەوشانەوەی گەرمی مۆمەکان، شوشە ڕەنگاوڕەنگە ئاسمانبڕەکان و پەیکەرە جوانەکان، هەموویان منیان هێنایە سەر زەوق.

لەگەڵ نزیك بوونەوەی هاوین، وەك بڵێی من گەورەتر دەبووم. ڕۆژێك ئۆچ پێی وتم: "ئەیدی کاتی هاتووە.." بەڕاستیش هەر وا بوو. کەسێك

---

[٢]– Duomo: کڵێسای دوئۆمۆ کە ٥٠٠ ساڵی برد تا تەولو بوو (لە ساڵی ١٣٨٦ بۆ ١٨٨٧)، لە گۆڕەپانی ناوەندیی شاری میلان هەڵکەوتووە. ئەم کڵێسایە گەورەترین و ئاڵۆزترین نموونە بیناسازی "گوتیك"ە و بەری ڕەنجی پێنج سەدە کاری هونەرمەندان، پیشەسازان، بیناسازان، میعماران و ئەندازیارانی شارە دەوڵەمەند یان مامناوەنەکانە کە لە دروستکردنی ئەم کڵێسا بەشکۆیەدا بەشدار بوون.

بەناوی تریفت دراگز، خەڵاتێکی یەك ملیۆن دۆلاری بۆ پێشبڕکێی سیانییەکانی پاسکیلسواری (Triple Crown of Cycling) دیاری کردبوو. ئەم پێشبڕکێیە، لەڕاستیدا لە سێ پێشبڕکێی گرنگ پێکهاتووە کە لە ئەمریکا بەڕێوە دەچێت. هەر یەکێك لە پێشبڕکێکان، شێوازێکی تایبەتی هەیە: بۆ ئەوەی خەڵاتەکە ببەمەوە، دەبوو لە رکابەریەکی یەك رۆژە لە پێترزبۆرگ، پێشبڕکێیەکی چەند قۆناغی ٦ رۆژە لە وێست ڤێرجینیا و دواجاریش لە پێشبڕکێکانی پاڵەوانێتی ئەمریکادا براوە بوومایە. پێشبڕکێکانی پاڵەوانێتی ئەمریکا لە پێشڕکێیەکی یەك رۆژەی مەودا ١٥٦ میلە کە لە جادەکانی فیلادلفیا بەڕێوە دەچێت. کارێکی قورس بوو، رێکخەرانی پێشبڕکێکەش ئەمەیان دەزانی. تەنیا پاسکیلسوارێکی تەواو لێهاتوو دەیتوانی لە وەها پێشبڕکێیەکدا براوە بێت: لەبەر ئەوەی کە هەم دەبوو بەخێرایی لێ بخوڕێت و هەم بە هەورازانیشدا هەڵگەڕێین و هەم لە پێشبڕکێ چەند قۆناغییەکانیشدا پایدەر لێبدەین. واتە کەسی بەشداربوو پێویستە لە هەموو ئەوانەدا شارەزا و لێزان بێت. لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەی کە دەبوو هەماهەنگ کارمان بکردبایە – کارێك کە من نەمدەتوانی بیکەم.

هەموو پاسکیلسوارەکان باسی خەڵاتەکەیان دەکرد و پاشان سەبارەت بە قورسی و دژوارییەکانی کارەکە دەدوان. شەوێك کە بە تەلەفۆن لەگەڵ دایکم قسەم دەکرد، لێی پرسیم: "شانسی بردنەوەم لەم پێشبڕکێیەدا چەندە؟" لە وەڵامدا وتم: "باشە"

تا مانگی جون، له دوو قۆناغدا براوه بووم. رۆژنامه و بلاّوکراوهکان، هەراوهەنگامەیەکی زۆریان ڕێ خستبوو، ڕێکخەرانی پێشبڕکێکانیش تاسابوون. تەنیا ئەوەندەی مابوو کە پاڵەوانێتی ئەمریکا لە فیلادلفیا ببەمەوە. بەڵام لەم پێشبڕکێیەدا ١١٩ پاسکیلسواری دیکە لەگەڵ مندا ڕکابەریان دەکرد. پێنج سەد هەزار کەسیش بۆ تەماشاکردنی پێشبڕکێکە دەهاتن.

ڕۆژی پێش بەڕێوەچوونی پێشبڕکێکە، پەیوەندیم بە دایکمەوە کرد و داوام لێکرد خۆی بگەیەنێتە فیلادلفیا. لەم دەرفەتە کورتەدا، دەبوو ئەو ١٠٠٠ دۆلار بۆ کڕینی بلیتی هاتن و گەڕانەوەکەی بدات. دایکم وتی وای دادەنێم کە بیتاقەی بەختم کڕیوە. ئاخر ئەگەر دایکم نەهاتبایە و من بمبردبایەوە، بۆ هەمیشە داخی بینینی ئەم پێشبڕکێیەی لە دڵدا دەمایەوە.

بڕیارمابوو بە باشی پێشبڕکێکە ئەنجام بدەم و هیچ ووروژمێك نەبەم کە هەڵم نەسەنگاندبێت.

کەم و زۆر هەموو کاتی پێشبڕکێکە بەمشێوەیە پایدەرم لێدا. بەڵام پاشان ٢٠ میلی کۆتایی بە خێرایی پایدەرم لێدا. لە لێژترین بەشی ڕێگاکەدا، خۆم تاو دا و وەك شێتم لێهاتبوو. هیچ نەمزانی چی ڕووی دا.. تەنیا ئەوەندەم دەزانی کە لەسەر کوشنەکە بەرز بوومەتەوە، بە هەموو هێز و توانامەوە پایدەرم لێدەدا، دەمم کردبۆوە و هاوارم دەکرد. ئیتر زۆر لە بەشداربووانی دیکە دوورکەوتبوومە.

لە ساتەکانی کۆتاییدا ئەوانی دی هێندە لە منەوە دوور بوون کە ماچێکم بۆ دایکم ڕەوانە کرد. دوایی بە جیاوازییەکی زۆر لە ریکۆردەکانی پێشووی ئەم پێشبڕکێیانە، لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە. لەنێو قەرەباڵغی هەواڵنێراندا، لە پاسیکیلەکەم هاتمەخوار، بەڵام خۆم لێدزینەوە و خۆم گەیاندە دایکم. من و دایکم یەکترمان لە ئامێز گرت و دەستمان کرد بە گریان.

ئەمە دەستپێکی هاوینی خەیاڵی منی بوو. دوای ئەم سەرکەوتنە، لە یەکێك لە قۆناغەکانی پێشبڕکێی تۆردۆفرانس سەرکەوتنێکی خافڵگیرانەم بەدەست هێنا: لەم قۆناغەدا، دەبوو مەودایەکی ١١٤ میلی پایدەرمان لێبدایە. ٥٠ یاردی مابوو بۆ کۆتایی پێشبڕکێکە، خۆم تاودا.. کاتێك کە پێش دەستەی پاسکیلسواران دەکەوتم، خۆم لە لەمپەرەکانی قەراغ جادە دەکوتا. بردنەوە لە قۆناغە جیاوازەکانی "تور"دا، بە سەرکەوتنێکی بەنرخ هەژمار دەکرا و من یەکەم کەس بووم کە لە تەمەنی ٢١ساڵیدا لەم قۆناغەدا سەرکەوتنم بەدەستهێنابوو.

بۆ ئەوەی بزانن کە سەرکەوتن لە "تۆردۆفرانس"دا چەندە پێویستی بە ئەزموونە، دەبێ بڵێم کە چەند ڕۆژ دواتر، من چیتر توانای بەشداری لە پێشبڕکێمدا نەبوو. من دوای قۆناغی دوانزە، لە پێشبڕکێکە کشامەوە. کێوەکانی ئالپ، وزەیان پێنەهێشتم.

"زۆر دوورودرێژ و سارد بوو." ئەمە ڕستەیەك بوو کە دوای تەواو بوونی پێشبڕکێکە بە هەواڵنێرەکانم وت. کاتێك گەیشتمە هێڵی کۆتایی،

ئوتۆمبێلی تیمەکەمان بەرەو هوتێل رێکەوتبوو. دەبوو تا هوتێل بە پێ برۆم و پاسکیلەکەم بە رێگایەکی زیخەڵاندا هەڵگێرم. بە یەکێك لە رۆژنامەکانم وتبوو: "رێگەی پێشبڕکێکە بەس نەبوو، تازە دەبێت بەم جادەشدا هەڵگەڕێم.." هێشتا لەشم ئەو ئامادەییەی نەبوو تا بە کوێستانە سەختەکاندا رێبکات.

هەندێك جار ئارامم لەبەر دەبڕا. ماوەیەك وریایانە پایدەرم لێدەدا و پاشان دووبارە دەگەڕامەوە سەر دۆخی هەوەڵ. من نەمدەتوانی ئەم بابەتە بخەمە مێشکی خۆمەوە کە بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنم، پێویستە لە هەوەڵەوە بە هێواشی پایدەر لێبدەم. ماوەیەکی پێچوو تا خۆم بەقەناعەت گەیاند کە ئارام گرتن لەگەڵ لاواز بوون جیاوازە.

نزیکەی هەفتەیەکی مابوو بۆ پاڵەوانێتی جیهانی کە دیسان تووشی هەڵەیەکی ئاشکرا بووم. لە پێشبڕکێکانی پاڵەوانێتی "زوریخ"دا، پێش ئەوەی بگەمە قۆناغی هەستیاری پێشبڕکێکە، خۆم هیلاك کرد. دیسان لەنێو بیست کەسی یەکەمیشدا نەبووم. ئۆچ دەیتوانی بە تورەییەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکات، بەڵام لەباتی ئەم کارە، دوو رۆژی دیکەش لە زوریخ مایەوە و لەگەڵ مندا پاسکیلی لێخوڕی. ئەو لەوە دڵنیا بوو کە ئەگەر ژیرانە پایدەر لێبدەم، لە پێشبڕکێی پاڵەوانێتی جیهاندا براوە دەبم. هەروا کە پێکەوە راهێنانمان دەکرد، سەبارەت بە ئارامگرییەوە قسەی بۆ دەکردم: "تەنیا کارێك کە دەبێ بیکەی ئەمەیە کە دان بەخۆدا بگرێت، تەنیا دان بەخۆدا بگرە.. خولی دووەم و سێیەم، زۆر زووە. لەگەڵ هەر

کاردانەوەیەکی پێشوەختەدا، شانسی بردنەوە لەدەست دەدەیت. بەڵام دوای ئەوە، هەر چەندت بوێ دەتوانی خۆ تاو بدەیت."

بەشداربووانی پێشبڕکێی پاڵەوانێتی جیهان، کەسانی ئاسایی نین. ڕکابەرەکانم، پاسکیلسوارانێکی گەورە بوون کە لە سەرووی هەموویانەوە، "میگویل ئیندۆراین" بوو کە سێ خول لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانسدا براوە بوو. ئەگەر بمویستبایە سەرکەوتن بەدەست بێنم، دەبوو واز لە هەندێك لە باوەڕە کۆنەکانم بێنم. تا ئەو کاتە، هیچ پاسکیلسوارێکی تەمەن ٢١ ساڵ، پلەیەکی جیهانی بەدەست نەهێنابوو.

چەند ڕۆژی مابوو بۆ پێشبڕکێکە، دیسان پەیوەندیم بە دایکمەوە کرد و داوام لێکرد بێت و ماوەیەك لام بمێنێتەوە. نەمدەویست لەم ڕێگایەدا تەنها بم. دایکم هەمیشە سوکنایی پێدەبەخشیم. لە لایەکی دیکەشەوە دەمەویست دایکم، پێشبڕکێی من لەگەڵ ئەو ڕکابەرانەدا ببینێت. ئەویش خێرا مۆڵەتی لە ئێریکسۆن وەرگرت و بەڕێکەوت. دایکم بەشێوەی خۆی پارێزگاری لێدەکردم. لە سنگی حاجەت شۆردنی چێشتخانەدا، جلوبەرگەکانمی دەشۆرد، ئاگای لە خۆراکی من بوو، وەڵامی تەلەفۆنەکانی دەدایەوە و وریای خەو و پشوودانی من بوو. پێویستی نەدەکرد من قسەی لەگەڵ بکەم یان باسی هەستەکانمی بۆ بکەم، ئەو خۆی لە هەموو شتێك تێدەگەیشت. تا لە ڕۆژی پێشبڕکێکە نزیکتر دەبووینەوە، من بێدەنگتر دەبووم. بێدەنگ بووم و لە زەینی خۆمدا بەرنامەڕێژیم بۆ پێشبڕکێکە دەکرد. دایکیشم چرایەکی بچووکی

دادەگیرسان و کتێبی دەخوێندەوە. منیش چاوم لە میچی ژوورەکە دەبڕی یان وەنەوزم دەدا.

دواجار ڕۆژی پێشبڕکێکە گەیشت. بەڵام کە لەخەو هەستام، بینیم کەش و هەوا باراناوی بوو. چاوەکانم کردەوە و لەسەر شووشەی پەنجەرەی ژوورەکە دڵۆپە بارانەکانم بینی. هەر ئەو بارانە نەفرەتییە کە لە پێشبڕکێکانی سن سباستیەن، ئەو هەموو کێشە و دەردی سەرییە بۆ نامەوە.

بەدرێژایی ڕۆژەکە بارانی بەخۆڕ دەباری. بەڵام کەسێك هەبوو کە لە من زیاتر، لەژێر بارانەکەدا ئازاری دەچەشت: ئەویش دایکم بوو.. ئەو ماوەی حەوت کاتژمێری تەواو لە شوێنی تەماشاچییەکان دانیشتبوو، تەنانەت بۆ جارێکیش لە شوێنی خۆی هەڵنەستابوو. تەلەفزیۆنێکی گەورە لەبەردەم شوێنی تەماشاچییەکاندا داندرابوو تا ئەوان بتوانن سەیری پێشبڕکێکە بکەن. دایکیشم بە جلوبەرگی تەڕەوە لەوێ دانیشتبوو، سەیری پێشبڕکێکەی دەکرد.

پاسکیلسوارەکان یەك لە دوای یەك دەکەوتن. کاتێك لە ئەورووپا باران دەبارێ، توێژێکی خز لە تەم و بەنزین، سەر جادەکان دادەپۆشێت. بەشداربووان لە چەپ و ڕاستەوە لە پاسکیلەکانیان دەکەوتنەخوار. منیش دوو جار کەوتم، بەڵام هەر دوو جارەکە، خێرا خۆم کۆ دەکردەوە، دووبارە سوار پاسکیلەکەم دەبوومەوە و دەچوومە نێو ڕیزی بەشداربووان.

بەدرێژایی ئەم ماوەیە، دانم بەخۆدا گرت و ئارامم گرت.. هەر بەو شێوەی کە ئوچ پێی وتبووم، لە دواوە دەڕۆشتم. ١٤ سووڕی دیکەی مابوو تا پێشبڕکێکە تەواو ببێ، چوومە ریزی گرووپی پێشەوە. ڕێك لە تەنیشت منەوە، ئیندۆراین، یەکێك لە پاسکیلسوارە بەناوبانگەکانی ئیسپانیا، پاسکیلی لێدەخوڕی. هەر چۆنێك بێت تا کۆتایی ڕێگاکە دوو هەوراز مابوو کە دەستم بە هێرش بردن کرد. بەخێرایی لە گردەکە سەرکەوتم و گەیشتمە لووتکەکەی، پاشان بەخێرایی بە لێژایی گردەکەدا هاتمە خوار، دووبارە بە هەورازی کوڕی دواتردا سەرکەوتم کە بە ئێکبێرگ (Ekberge) بەناوبانگە. پاسکیلسوارەکانی دیکەش ڕێك لە پشت سەری منەوە، دەهاتن. بەخۆم وت، ئەبێ ئێستا بە هەموو هێز و توانامەوە پایدەر لێبدەم، هەر بۆیە لەسەر کورسییەکەم بەرز بوومەوە و دووبارە خۆم تاودا. ئەمجارە مەودا کەوتە نێوان من و ئەوانەوە.

لە لایەکەوە ئێکبێرگ، لێژاییەکی دوورودرێژ و مەترسیدار بوو کە درێژییەکەی نزیکەی چوار کیلۆمەتر دەبوو، لەم بارانە توندەدا دەکرا هەر چەشنە پێشهاتێك ڕوو بدات. لەبەر ئەوەی جادەکە خز بوو، ئەگەری ئەوە هەبوو پاسکیلەکە لەژێر پێمان دەرچێت. بەڵام من لە لۆفەکاندا زۆر وریا بووم. کاتێك گەیشتمە کۆتایی ئەم جادەیە، سەیرێکی پشتەوەی خۆم کرد تا بزانم کێم لێ نزیکە. بەڵام کەسم لە پشتەوە نەبوو.

پەشۆکابووم. بە نائومێدییەوە بەخۆم وت، دووبارە هەمان هەڵەی پێشوو.. دیسان زۆر زوو هێرشم برد. پێدەچێت لە ژماردنی سووڕەکاندا

هەڵەم کردبێت. هێشتا سووڕێك مابوو. نێوانم لەگەڵ ئەواندا هێندە زۆر بوو، جێی باوەڕ نەبوو ئەمە راست بێت.

سەیرێکی کۆمپیوتەرم کرد، ئەی خوایە ! ئەمە سووڕی کۆتایی بوو.

من لە سەرکەوتن نزیك بوو بوومەوە. ٧٠٠ مەتری مابوو بۆ هێڵی کۆتایی کە دەستم بە خۆشی دەربڕین کرد. دەستەکانم رادەوەشاند، ماچم دەنارد و رێزی خۆم بۆ تەماشاچییەکان دەردەبڕی. کە لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە، وەك رۆکێت بەرز بوومەوە، دواجار ستۆپم گرت و لە پاسکیلەکەم دابەزیم. لە نێو خەڵکەکەدا بەشوێن دایکمدا دەگەڕام. دایکمم دۆزییەوە و یەکترمان لە ئامێز گرت. وتم: "ئێمە سەرکەوتین! سەرکەوتین.." پاشان هەر دووکمان دەستمان کرد بە گریان.

لە نێو ئەم خۆشی و هەڵپەڕکێیەی دوای پێشبڕکێکەدا، یەکێك لە پاسەوانەکانی پاشا هەواڵی بۆ هێنام کە پاشا هارالد (King Harald)، شای نەرویج، دەیەوێ من ببینێت.

بە چەند بازگەی پشکنیندا تێپەڕین تا گەیشتینە ژوورێك کە پاشا لەوێ چاوەروانی منی دەکرد. پاسەوانی پاشا پێشی پێگرتین و وتی: "ئەو دەبێ هەر لێرە بمێنێتەوە.. پاشا بە تەنیا چاوی بە تۆ دەکەوێت."

پێموت: "من دایکم بە تەنیا جێناهێڵم.."

رووم لە دایکم کرد و وتم: "وەرە دایکە، وەرە با بگەڕێینەوە." دەستی دایکمم گرت و گەڕامەوە. هیچ حەزم نەدەکرد بەبێ ئەو بۆ هیچ شوێنێك

بچم. بەم هەڵوێستەی من، پاسەوانی پاشا لەسەری نەچوو. "زۆر باشە! تکایە لەگەڵم وەرن." چووینە ژوور. پاشا پیاوێکی نازدار بوو، دیدارەکەی ئێمە زۆر کورت و فەرمی بوو، پاشان ئێمە دووبارە گەڕاینەوە نێو ڕێوڕەسمی شایی و لۆغانەکە.

ئەم سەرکەوتنە بۆ من و دایکم وەك هێڵێکی کۆتایی بوو. بەشی قورس و دژواری شەڕەکە کۆتایی هاتبوو، ئیدی کەس نەیدەتوانی بە ئێمە بڵێ، ئێوە هیچتان بە هیچ نابێ، چیتر پێویست نەبوو نیگەرانی پێدانی خەرجییەکانمان بین، یان نیگەرانی خەرجی کڕینی کەرەستە یان بلیتی فڕۆکە بین. پێدەچوو ئەمە کۆتایی هەورازی دوورودرێژ و تاقەت پڕوکێنی منداڵیم بێت.

سەرەڕای ئەوەی کە پاڵەوانی جیهان بووم، بەڵام زۆر شت هەبوون کە دەبوو فێریان ببم، تا سێ ساڵی داهاتوو دەبوو بەردەوام خۆم لە مەحەك بدەم و خۆم بەهێز بکەم. من تا ئەو ڕۆژە چەندین سەرکەوتنی دیکەشم بەدەستهێنابوو، بەڵام لەو کاتەوە دەبوو فێری ئەو وردەکاریانە ببم کە دەبوونە هۆی ئەوەی من لە پاسکیلسوارە ناودارەکان جیاواز بم.

بردنەوە پێویستی بە زانستی تایبەت بە خۆیەتی و پێویستە ئێمە ئەو زانستەمان هەبێت. تەماشاچییەکان تەنیا بەشی تەکنیکی پاسکیلسواری دەبینن، بەڵام لەپشت پەڵەی ئەم هەموو پاسکیلسوارانەوە، ڕاستییەکی ماندووکەر وەشێردراوە و ئەویش ئەمەیە کە پاسکیلسواری وەرزشێکی تەواو حیساب بۆکراوە. پاسکیلسوارەکانیش کویلەگەڕێکی کۆمپیوتەرین.

ئەوان لە نێوان لێکدانەوە وردەکانی ریتم، بەرهەم، هێز و تواناداا پەلەقاژەیانە. من بەردەوام دەبوو لەسەر پاسکیلێکی جێگیر دانیشتبام، هەموو لەشم شیشی کانزایی (ئەلکترۆلیت)م لێبدایە و بە دوای ئەو شوێنانەی پاسکیلدا بگەڕێم کە دانیشتن لەسەری، چەند چرکەیەك کاتی بۆ دەگێڕامەوە، یان بەشوێن ئەو کەلوپەل و ئامرازانەدا بگەڕێم کە تایبەتمەندی ئیرۆدینامیکی زیاتریان هەبێت.

چەند هەفتە دوای پێشبڕکێی پاڵەوانی جیهانی، لەگەڵ کریس سەردانی تاقیگەی ناوەندی راهێنانەکانی ئۆلۆمپیك لە "کلۆرادۆ سپرینگز" (Colorado Springs)مان کرد. سەرەڕای ئەم سەرکەوتنە گەورەیە، هێشتاش هەندێك خاڵی لاوازی گەورەم هەبوو. چەند رۆژێك لەو تاقیگەیەدا مامەوە. بەدرێژایی ئەو ماوەیە، هەموو لەشمیان کردبوو بە شیشی کانزایی و پزیشکەکان بەردەوام پشکنینی خوێنیان بۆ دەکردم. لە راستیدا ئەوان دەیانەویست سنووری تواناکانی من دیاری بکەن تا بزانن بە چ شێوازێك دەتوانن توانا و ئەنجامەکانی من بەرز بکەنەوە. هەر لەبەر ئەمەش بەردەوام لێدانی دڵ و لانی زۆری توانای سییەکان ( Vo۲ Max)ی منیان کونترۆڵ دەکرد. رۆژێکیان ١٥ جار پەنجە گەورەی دەستمیان بۆ خوێن وەرگرتن کون کرد.

لە راستیدا ئێمە بەشوێن ئەوەوە بووین تا بزانین لانی زۆری ئاستی چالاکییەکانی من چەندە و تا کەی دەتوانم بەرگەی ئەم لانی زۆرە بگرم و بیپارێزم. بڕیاماندا بزانین باشترین خێرایی پایدەر لێدانی من چەندە، خاڵە

لاوازەکانی من لەکاتی پایدەر لێداندا کامانەن و لە کام شوێنانەدا وزەکەم بە فیڕۆ دەدەم؟ شێوەی پایدەر لێدانی من چەکوشی بوو، واتە قاچەکانم ڕاستەوخۆ بەرەو سەرەوە و بەرەو خوارەوە دەجووڵاند و هەر لەبەر ئەم هۆکارەش، وەزەیەکی زۆرم بەکار دەهێنا، بەڵام ئەو خێراییەم نەبوو کە پێویستم پێیبوو. لەبەر ئەوە چووینە گۆڕەپانی پێشبڕکێ تا بارودۆخی من لەسەر پاسکیل ببینین و دیاری بکەین کە لە کام شوێنانەدا، وزەکەم بەفیڕۆ دەدەم. یەکێك لە تیۆرەکانی پاسکیلسواری، ئەمەیە کە بە بەکارهێنانی کەمترین وزە، ئەوەندەی دەکرێ خێراتر لێبخوڕم. توانست (بە پێی وات)، پیشاندەری ڕادەی چالاکی پاسکیلسوارە لەکاتی پایدەر لێداندا. شوێنکەی منیان لەسەر پاسکیلەکە کەمێك هێنایە خوار و هەر بەم کارە گۆڕانێکی بەرچاو دروست بوو.

هەر لەو سەرو بەندەدا، چاوم کەوت بە "ئەیدی مێرکس"ی پاسکیلسواری ئەفسانەیی بەلجیکا. "ئەیدی" پێنج جار پاڵەوانێتی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانسی بردبۆوە و یەکێك لەو پاسکیلسوارانە بوو کە لە پێشبڕکێکاندا، هێرشی دەبرد (خۆی گوڕم دەدا). چیرۆکی زۆرم لە بارەی بوێری و خێرایی ئەوەوە بیستبوو، بۆیە هەمیشە حەزم دەکرد ڕۆژێك وەك ئەوم لێبێت. من تەنیا بەدوای بردنەوەوە نەبووم، بەڵکو حەزم دەکرد بەشێوەیەکی تایبەت سەرکەوتن بەدەست بهێنم و براوە بم. من و ئەیدی پێکەوە بووین بە هاوڕێ. ئەیدی پێی ووتم، دەتوانم لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس سەرکەوتن بەدەست بهێنم، بەڵام بەو مەرجەی کەمێك کێشم دابەزێنم. شوێنەواری کارەکەی من تەواو بە لەشمەوە دیار

بوو. مل و سنگم تەواو بوو بوونە ماسولکە. ئەیدی بۆی روون کردمەوە کە ماوەی سێ هەفتە سەرخستن و هێنانەخواری ئەم کێشە لە کێو و شاخەکاندا کارێکی قورسە. من هەر لەسەر بنەمای هێز و توانای کرچ و کاڵی خۆم، پێشبڕکێم دەدا. بەڵام بۆ ئەوەی لە "تۆردۆفرانس"دا براوە بم، دەبوو رێگایەك بدۆزمەوە کە بێ ئەوەی تواناکانی جەستەم دابەزن، کێشم کەم بکەم. هەر لەم پێناوەدا، وازم لە خواردنی شیرینییەمەنییەکان هێنا. دەبوو بە شوێن توانایەکی نوێدا بگەڕێم، توانایەکی دەروونی بەناوی ئارامگرتن.

تا ساڵی ١٩٩٥ هێشتا نەمدەتوانی هەموو قۆناغەکانی تۆردۆفرانس ببڕم، تەنیا دەمتوانی هەندێك لە قۆناغەکانی تا کۆتایی ببڕم. راهێنەرەکان لەو باوەڕەدا بوون کە من هێشتا وەك پێویست ئامادە نیم و هەر بەڕاستیش وابوو. لەش و زەینی من هێشتا ئەو ئامادەییەیان نەبوو تا بەرگەی ئەو هەموو دژوارییە بگرن. پاسکیلسوارێکی لاو دەبێ لە ماوەی چەندین ساڵی یەك لەدوای یەك، ئەو ئامادەیی و توانایبە پەیدا بکات تا بتوانێ هەموو قۆناغەکانی ئەم پێشبڕکێیە ببڕێت. من بەردەوام لە پێشکەوتندا بووم: ساڵی ١٩٩٤ لە "خولی بۆستون"دا پلەی دووەمم بەدەستهێنا. لە پێشبڕکێکانی سن سباستیان و "توردۆ پۆنت"یشدا پلەی دووهەمم بەدەستهێنا. لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٩٥دا، توانیم پلەی یەکەم لە پێشبڕکێکانی سن سباستیان و توردۆپۆنت بەدەست بهێنم. ئێستا ئیدی ئۆچ پێیوابوو دەبێ لە ئاستە بانترەکاندا، پێشبڕکێ بکەم، ئیدی دەبوو هەموو قۆناغەکانی تۆردۆفرانس ببڕم. کاتی ئەوە هاتبوو کە

فێری ئەو شتانە ببم کە بۆ سەرکەوتن لە گەورەترین پێشبڕکێی چەند قۆناغی جیهاندا، پێویستم پێیانبوو. من لە پێشبڕکێ یەك ڕۆژییەکاندا شارەزا بووم: تەنیا ئەوەندە بەس بوو کە هێڵی دەستپێکردنم پیشان بدەن.. من بە فشاری ئادرنالین و زۆر لەخۆ کردن سەرکەوتنم بەدەست دەهێنا. من دەمتوانی خۆم بۆ ئاستێك لە ئازار بگرم کە کەس نەیدەتوانی خۆی بۆ بگرێت.

بەڵام تۆردۆفرانس، شتێکی تەواو جیاواز بوو. بەم شێوەیە دوای دوو ڕۆژ، لە پێشبڕکێکە دەچوومە دەر. من دەبوو بە چاوێکی کراوەتر لەم پێشبڕکێیە بڕوانم. لەم پێشبڕکێیەدا دەبوو سەرچاوەی گونجاو بۆ کاتی گونجاو ئامادە بکەیت، دبوو بە بێ بەفیڕۆدانی هەرچەشنە جووڵە یان وزەیەك، بگەیتە ئەو ئاستە لە توانا کە پێویستە. کاتێك کە ئیدی هیچ شوێنەوارێك لە ئادرنالین نەماوە و ماندوویێتی هەموو بوونی داگرتووی، دەبێت تەنیا پایدەر لێبدەیت و پایدەر لێبدەیت.

ئەگەر بمەوێ جیاوازی لە نێوان خەسڵەتەکانی پیاوێك و کوڕێکدا قایل بم، پێویستە ئاماژە بە خەسڵەتی پشوودرێژی پیاوان بکەم. دواجار ساڵی ١٩٩٥، بە پێکهاتەی دژواری تۆر و هەموو مەترسییەکانی ئاشنا بووم. من هەموو قۆناغەکانیم بڕی و بەو پەڕی تواناشەوە ئەم کارەم ئەنجام دا. لە ڕاستیدا لە ڕۆژانی کۆتایی پێشبڕکێکەدا، براوەی یەکێك لە قۆناغەکان بووم. بەڵام باجی زۆرم دا تا ئەم زانینەم دەستکەوت و تا ئەو ڕۆژە، بەمشێوەیە لە بابەتەکە نەگەیشتبووم.

لە کۆتایی پێشبڕکێکەدا، یەکێك لە هاوتیمەکان لە تیمی مۆتۆرولا

بەناوی "فابیۆ کاسارتلی" (Fabio Casartelli) لە یەکێك لە لێژاییە کۆڕەکاندا گیانی لەدەست دا.. فابیۆ، پاڵەوانی ئۆلۆمپیکی ۱۹۹۲ بوو. لە لێژاییەکاندا، پاسکیلسوارەکان بە یەك ریز دەڕۆن و هەر ئەوەندە بەسە یەك کەسیان بکەوێت تا ئەوانی دیکەش بەدوای ئەودا بکەون. "فابیۆ"ش بەتەنیا نەبوو، ۲۰ پاسکیلسواری دیکەش کەوتن. بەڵام ئەو پشتە سەری بەر لیواری جادەکە کەوت و مل و کاسە لەسەری شکا. من خێرا خۆم گەیاندە شوێنی رووداوەکە تا لە نزیکە بزانم چی روویداوە. زۆرێك لە پاسکیلسوارەکان لەوێ بوون و هەر یەکەو لای یەکێك لە زامدارەکان بوو.. لە پێشبڕکێکانی تۆردا ئەمجۆرە رووداوانە زۆر ئاساین. بەڵام ماوەیەك دواتر لە رادیۆی تیمەکەمانەوە بیستم کە چی روویدابوو: فابیۆ مردبوو. بەهیچ شێوەیەك نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەم رووداوێکی لەو شێوەیە رووی داوە.

ئەو رۆژە یەکێك لە درێژترین رۆژەکانی ژیانی من بوو. فابیۆ، تەنیا هیوای تیمی پاسکیلسواری ئیتالیا نەبوو، ئەو تازە زەماوەندی کردبوو، ببووە خاوەنی منداڵ. منداڵەکەی تەمەنی تەنیا یەك مانگ بوو.

ئێمە سەرەڕای ئەو کارەساتە دەبوو ئەو قۆناغە تەواو بکەین. من لە ساڵی ۱۹۹۱ەوە واتە لەو کاتەوە کە بۆ یەکەم جار لە پێشبڕکێ نێودەوڵەتییەکاندا بەشداریم کرد، فابیۆم دەناسی. ئەو لە نزیك کۆمۆ، شوێنی نیشتەجێبوونی من، دەژیا. لە ئۆلۆمپیکی ۱۹۹۲شدا، پێکەوە پێشبڕکێمان کرد کە ئەو مەدیالیای ئاڵتوونی بردەوە. فابیۆ پیاوێکی ئارام و روو خۆش بوو. لە بنەڕەتدا پاسکیلسوارە ناودارەکانی ئیتالیا،

کەسانێکی جددی و وەك نەزان وان، بەڵام فابیۆ وەك ئەوان نەبوو. ئەو کەسێکی زۆر لەبەردڵان بوو. ئەو شەوە، کۆبوونەوەیەکمان ڕێکخست تا لەسەر درێژەدان یان وازهێنان لە پێشبڕکێکان ڕێك بکەوین. دوو جۆر بۆچوون هەبوو، تاقمێك دەیانەویست لە پێشبڕکێکان بکشێنەوە و بگەڕێنەوە ماڵەوە و ماتەمینی بۆ لەدەستدانی فابیۆ بگێڕن، تاقمێکیش دەیانەویست بۆ ڕێزدانان لە پلە و پایەی فابیۆ، درێژە بە پێشبڕکێکان بدەن. منیش حەزم دەکرد چیتر درێژە بە پێشبڕکێ نەدەین. چیتر زەوق و حەوسەڵەی پاسکیلسواریم نەبوو. ئەمە یەکەم جار بوو کە من لەگەڵ مەرگ و ئەو خەمە قووڵەدا بەرەوڕوو دەبووم کە بەهۆی ئەوەوە دروست بوو بوو، بۆیە نەمدەزانی چۆن لەگەڵ ئەو بابەتەدا هەڵبکەم. بەڵام دوای ئەم کۆبوونەوەیە، هاوسەری فابیۆ سەردانی کردین و تکای لێکردین لەبەر خاتری فابیۆ، لە پێشبڕکێکە بەردەوام بین. دوای ئەم ڕووداوە، ئێمە لە چیمەنەکانی پشت هوتێلەکە دانیشتین، کەمێك نزامان کرد و هەموومان بڕیارمان دا، بەردەوام بین و کۆڵ نەدەین.

ڕۆژی دواتر، بۆ ڕێزلێنان لە فابیۆ، پایدەرمان لێدا و تیمی ئێمە سەرکەوتنێکی تەشریفاتی بەدەستهێنا. ئەو ڕۆژەش، یەکێکی دیکە لە ڕۆژە ترسناك و دوور و درێژەکان بوو، ئێمە ماوەی هەشت کاتژمێری تەواو بەسەر پاسکیلەوە بووین و بە خەم و پەژارەوە پایدەرمان لێدەدا. پێشبڕکێیەك لەئارادا نەبوو. ئێمە بە ریتمێکی هێواش، دەچووینە پێش. لە ڕاستیدا، ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنێکی سیمبۆلیك بوو کە لە کۆتایی ئەم ڕێوڕەسمەدا، تیمەکەی ئێمە لە هێڵی کۆتایە پەڕییەوە و لە پشت

سەری ئێمەشەوە ئەو ئوتۆمبێلە دەهات کە پاسکیلەکەی فابیۆی هەڵگرتبوو.

بەیانی ڕۆژی دواتر، بە گەرموگوڕییەکی تەواوەوە پێشبڕکێکانمان دەست پێکردەوە و بەرەو بورداوکس" (Bordeaux) بەڕێکەوتین. لە قۆناغی دواتردا دەبوو بچین بۆ لیمۆج (Limoges). ئەو شەوە، ئوچ سەردانی کردین و وتی، فابیۆ لەم پێشبڕکێیانەدا بەدوای دوو ئامانجەوە بووە: یەکەم ئەمەی کە، حەزی دەکرد پێشبڕکێکە تەواو بکات و دووەم ئەوەی کە دەیەویست لە قۆناغی "لیمۆج"دا براوە بێت. هەر کە قسەکانی ئەو تەواو بوو، بە خۆمم وت، ئەگەر فابیۆ ویستوێتی براوەی قۆناغی لیمۆج بێت، ئێستا من دەمەوێ لەبەر ئەو، براوەی ئەم قۆناغە بم.

تا نزیکەی نیوەی ڕێگا لەگەڵ ۲۵ کەسی دیکەدا لە پێشەوە بووین. "ئینوراین"یش، بە کراسە زەردە کاپتنییەکەیەوە لە دواوە پایدەری لێدەدا. من ڕێك ئەو کارەم کرد کە لە من چاوەڕوان دەکرا: خۆم گوژم دا، من لە ۲۵ میلی هێڵی کۆتایی و لە لێژاییەکدا خۆم گوژم دا. واتە تووشی دوو هەڵەی کوشندە هاتم: یەکیان خۆ گوژمدانی پێشوەختە و ئەوی دیکەیان خۆ گوژمدان لە سەرەو لێژاییدا.. بەڵام لەو سەرەو لێژییەدا هێندە توند دەڕۆشتم کە ۳۰ چرکە پێش ئەوانی دیکە کەوتم. هەموو پاسکیلسوارەکانی دیکە لە دوای منەوە بوون. تەسەوەری ئەوەم دەکرد کە ئەوان چۆن بیر لە من دەکەنەوە: بیر لە چی دەکاتەوە؟

بیرم لە چی دەکردەوە؟ ئاوڕێکی پشت سەری خۆم دایەوە، پاسکیلسوارەکان بە بێ هیچ ئامانجێکی تایبەت پایدەریان لێدەدا. ئەو

ڕۆژە هەوا گەرم بوو، هیچ کەس هیچ پاڵنەرێکی نەبوو کە توندتر پایدەر لێبدات.. لەڕاستیدا هەمووان چاوەڕوانی ئەوە بوون بگەنە هێڵی کۆتایی تا تەکنیکەکانیان پیشان بدەن. سووکە ئاوڕێکم دایەوە، کەسێك خەریك بوو ئاوی دەخواردەوە، یەکێکی دیکە خەریکی کڵاوەکەی بوو.. منیش بە هەموو تواناماوە گوژمم دەبرد.

کاتێك ١٥ پاسکیلسوار لە ١٥ تیمی جیاواز لە تەنیشت یەکتر بن، هیچ کات رێك نابن و نەزم و نەسەق لە نێوانیاندا دروست نابێت. هەموویان سەیری یەکتر دەکەن و بەیەکدی دەڵێن: تۆ لە پێشەوە بڕۆ.. نا، تۆ لە پێشەوە بڕۆ! هەر لەبەر ئەمە بوو کە من لەوان جیا بوومەوە و توندتر لە هەمیشە، بەرەو هێڵی کۆتایی ئاژووتم. ئەم کارەی من هیچ پەیوەندییەکی بە هێز و تواناوە نەبوو، هەموو شتێك لەبەر شۆکی هەوەڵ و ئەو جیابوونەوەوە بوو. لەڕاستیدا ئەوەی من کردم کارێکی تەواو شێتانە بوو، بەڵام ئەنجامی هەبوو.

ئوتۆمبێلی تیمەکەمان، شان بە شانی من دەڕۆشت و ئاگاداری دەکردمەوە. هانی کۆپەر، سەرپەرشتیاری تیمەکەمان، بەردەوام دەیووت: "لانس، ٣٠ چرکە لە پێش ئەوانی دیکەوەی.." دیسانەوە چەند خولەك دواتر، خۆی دەگەیاندە من و دەیووت: "چل و پێنج چرکە لە پێش ئەوانی دیکەوەی." جاری سێیەم یان پێنجەم بوو کە بەوم وت: "هانی، تکایە چیتر هەواڵم پێمەدە.. کەس بە من ناگاتەوە". هانی وتی: "باشە، باشە، باشە." ئەوەی وت لە پشت سەرمەوە ون بوو. ئەو ڕۆژە، کەس پێمنەگەیشتەوە. من براوە بووم و هەستم بە بچووکترین ئازاریش

نەدەکرد. ئەو ڕۆژە، حاڵەتێکی مەعنەویم پەیدا کردبوو، ئەو ڕۆژە بەشوێن ئامانجێکی باڵاوە بووم. سەرەڕای ئەوەی کە زۆر خۆم گوژم دا، بەڵام دوای ئەوەی لە گرووپەکە جیا بوومەوە، هیچ زیانم پێنەگەیشت. حەزم دەکرد فابیۆش ئەم هەستەی تاقی کردبێتەوە. فابیۆیش هەڵاتبوو، لەم دنیایە جیا بووبۆوە. گومانم نەبوو کە ئەو ڕۆژە، دوو کەس سواری پاسکیلەکەی من بووبوون، ئەو ڕۆژە، "فابیۆ"ش لەوێ بوو، لەگەڵ مندا پایدەری لێدەدا. ئەو کاتەی لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە، هەستێکی خۆشم هەبوو، هەستێك کە تا ئەمڕۆش، چیتر تووشی ئەو هەستە نەبوومەتەوە.

هەستم دەکرد کە من لەپێناو فابیۆ، لەپێناو خێزانەکەی، لەبەر منداڵە یەك مانگانەکەی و لەپێناو وڵاتی ماتەمباری ئیتاڵیا، بردبوومەوە. کە لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە، سەیرێکی سەرەوەم کرد و ئاماژەم بە فابیۆ کرد کە ئێستا لە ئاسمانەکان بوو..

ئوچ داوای لە یەکێك لە پەیکەرتاشەکان کردبوو، لە بەردی مەڕمەڕ کۆتەڵێك بۆ فابیۆ دروست بکات. پاسکیلسوارەکانی لە هەموو دنیاوە کەوتنە ڕێ و هەموویان بە مەبەستی پێشکەشکردنی ئەو کۆتەڵە، لەسەر شاخێك کۆبوونەوە. لەسەر ئەو کێوە کاتژمێرێکی هەتاوی داندرابوو کە سێ ڕێکەوتی گرنگی لە ژیانی فابیۆ پیشان دەدا: ڕێکەوتی لەدایکبوون، ڕێکەوتی پاڵەوانێتی لە پێشبڕکێکانی ئۆلۆمپیك و ڕێکەوتی مردنەکەی. ئێستا ئیتر لە واتای پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس تێدەگەیشتم. تۆردۆفرانس، پێشبڕکێی پاسکیلسواری نەبوو، بەڵکو لەڕاستیدا متافۆرێك (ئیستعارەیەك) بوو لە ژیان. تۆردۆفرانس، نەك هەر بە درێژ ماوەترین

پێشبڕکێی دنیا دادەندرێت، بەڵکو لەڕاستیدا، لە هەموو ڕوویەکەوە پاسکیلسوار بەرز دەکاتەوە، هەرچەند کە تۆوی خەم و کارەساتیشی تێدا وەشێردراوە. ئەم پێشبڕکێیە هەموو شتێکی راستەقینە دەخاتە بەردەم پاسکیلسوار: سەرما، گەرما، کێو، دەشت، شوێنی تایە، با، بەدشانسیگەلی نالەبار، جوانی گەلی لەباس نەهاتوو، ماندوێتی و لە هەمووان گرنگتر: پرسیار لە خۆ کردن... ئێمە بەدرێژایی ژیانیش، ڕووبەڕووی راستی گەلی جۆراوجۆر دەبینەوە، تووشی زۆر کلۆڵی دەبینەوە و لەگەڵی دا دەجەنگێین، لەژێر باراندا سەرمان دادەخەین و هەوڵ دەدەین سالار و سەنگین، درێژە بە رۆشتن بدەین. تۆردۆفرانس هەرگیز تەنیا پێشبڕکێیەکی پاسکیلسواری نییە. تاقیکردنەوەیەکە کە لە رووی فیزیکی و دەروونی و تەنانەت لە رووی ئاکاریشەوە، کەسەکە لە مەحەك دەدات.

ئێستا من لەمانە تێدەگەم، هیچ رێگایەکی قەدبڕ بۆ بردنەوە بوونی نەبوو. پێویستە سالانێك خەریکی پێشبڕکێ بی تا زەین و جەستە و کەسێتی پاسکیلسوار دروست ببێت، پێویستە سەدان و بگرە هەزاران میل ببڕی تا ئامادەیی پێویست بەدەست بێنیت. من تەنیا لە حاڵەتێکدا دەمتوانی لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس براوە بم کە قاچ، سییەکان، مێشك و دڵێکی پڕلاینم هەبێت، کاتێك کە پیاو بم.. فابیۆ بۆ خۆی پیاوێك بوو، من بۆ گەیشتن بەو قۆناغە دەبوو هەروا هەوڵ بدەم.

تا ئەو ساتەی کە بیستم شێرپەنجەمە، هەمیشە پێموابوو لە واتای ترس تێدەگەم!

پەشۆکان و ترسێکی تێکەڵ بە هەستێکی غەریب هەموو بوونمی داگرتبۆوە. وەك بڵێی خوێنی لەشم، بە ڕێگایەکی هەڵەدا دەسووڕێت! هەمیشە لەوە دەترسام کە کەس منی خۆش نەوێ، یان ئەوەی کە ببمە جێی گاڵتەی ئەوانی دیکە، یان پارەکەم ون بکەم. بەڵام لەپڕ تێکڕای ئەم نیگەرانیانە بۆ من بوونە بابەت گەلێکی هاکەزایی و کەم بایەخ. ئێستا ئیدی هەموو شتێك لەبەر چاوم گۆڕابوو.. هەموو نیگەرانییەکانی ژیانم، وەك پەنچەربوونی تایەی ئوتۆمبێلەکەم، لەدەستدانی کار و پیشە یان ترافیك، سەرلەنوێ ڕیزبەندی کرانەوە.

یەکێك لە تایبەتمەندییە ڕوون و ئاشکراکانی مرۆڤ بە بەراورد بە خوا، لاوازی و بێتوانایی ئەوە. وەرزشکارەکان خۆیان بە بەری لەم وەسفە دەزانن، ئەوان خەسڵەت گەلی ترسنۆك، لاواز، بێ بەرگری، خۆڕانەگر یان هەڵەکار نادەنە پاڵ خۆیان، هەر لەبەر ئەمەشە کە موراعاتی خۆیان و ئەوانی دیکە ناکەن و کەسانێکی نەرم و نیان نین. بەڵام ئەو شەوە کاتێك لە ماڵەکەمدا، بە تەنیا دانیشتبووم، تەواو ترسم لێنیشتبوو، وەك بڵێی منیش وەك مرۆڤەکانی دیکەم لێهاتبوو.. دەترسام.

نەمدەتوانی ڕووداوەکە بە دایکم بڵێم. ماوەیەك دوای ئەوەی لە نۆڕینگەی پزیشك گەڕامەوە، "ریك" هاتە لام. لای خۆی وای بیر کردبۆوە

که نابێ بیەلچێ بە تەنیا بم. بە "ریك"م وت ناتوانم ئەم هەواڵە بە دایکم بڵێم. ریك پێشنیاری ئەوەی کرد کە خۆی ئەم کارە بکات، منیش قبوڵم کرد.

هیچ رێگایەك نەبوو تا بەرەبەرە بابەتەکە لە دایکم بگەیەنم. کاتێك پەیوەندیم پێوە کرد، تازە لە کارەکەی گەڕابۆوە بۆ ماڵەوە و لە حەوشەدا خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامە بوو. ریك بەمشێوەیە رووداوەکەی بۆ باس کرد: "لیندا، لانس دەبێ خۆی لەم بارەوە قسەت بۆ بکات، بەڵام من دەبێ تەنیا تۆ لە رەوتی کارەکان ئاگادار بکەمەوە. لانس تووشی شێرپەنجەی گون بووە و سبەینێ کاتژمێر ٧ نەشتەرگەری بۆ دەکەن.."

دایکم وتی: "نا! چۆن شتی وا دەبێت؟!" ریك لە وەڵامدا وتی: "بەڕاستی بەداخم، بەڵام پێموایە پێویستە هەر ئەمشەو خۆت بگەیەنیتە ئێرە." دایکم دەستیکرد بە گریان.. ریك دڵخۆشی دەدایەوە، بەڵام دیسان داوای لێکرد کە بە زووترین کات خۆی بگەیەنێتە ئاستین. دایکم خۆی کۆ کردەوە و وتی: "باشە، خۆم دەگەیەنم." ئەو بێ ئەوەی قسە لەگەڵ مندا بکات، تەلەفۆنەکەی داخستەوە و خێرا هەرچی بە پێویستی دەزانی، لە جانتا بچووکەکەی دەهاوێ و بەرەو فرۆکەخانە بەڕێ دەکەوێت.

دوای ئەوەی کە ریك تەلەفۆنەکەی داخستەوە، دووبارە هۆشم لای خۆم نەما و گریانم هات.. ریك بە ئارامی قسەی لەگەڵ دەکردم: "ئاساییە ئەگەر بگریت. لەبنەڕەتدا وا باشە کە بگریت.. بەمجۆرە خۆت بەتاڵ

دەکەیتەوە. لانس نەخۆشییەکەی تۆ چارەسەری هەیە، تەنیا ئەوەندەیە کە پێویستە زوو وەخۆ کەوین."

چوومە ژووری خوێندنەوەکەم، پەیوەندیم بە هەموو ئەو کەسانەوە کرد کە پێموابوو پێویستە ئاگادار بن. پێش هەموویان پەیوەندیم بە "کوین لیڤینگستۆن" (KEVIN LIVINGSTON)ەوە کرد. کوین یەکێک لە هاوڕێیانی من بوو، لە تیمی "مۆتۆرۆلا" پێکەوە هاوتیم بووین. ئەو بۆ من وەك برا وابوو، هێندە لێك نزیك بووین کە بەرنامەڕێژیمان کردبوو بۆ وەرزی داهاتوو باڵەخانەیەك لە ئەورووپا بەکرێ بگرین. من ئەوم ناچار کردبوو بێت بۆ ئاستین تا پێکەوە راهێنان بکەین. کوین بۆ پێشبڕکێ چووبوو بۆ ئەورووپا. کە تەلەفۆنم بۆ کرد لە ئیتاڵیا بوو. بەوم وت: "کوین پێویستە شتێکت پێبڵێم، شتێکی خراپ روویداوە.."

"چی بووە؟ لە پەیوەندی بە پێشبڕکێکانەوە کێشەیەك دروست بووە؟"

"من تووشی شێرپەنجە بووم."

دەمویست بە کوین بڵێم کە چ هەستێکم هەیە و چەندە حەز دەکەم هەرچی زووترە بیبینم. بەڵام ئەو لەگەڵ سێ کەسی دیکە لە ئەندامانی تیمی هەڵبژاردەی ئەمریکا پێکەوە لە ژوورێکدا بوون و حەزم نەدەکرد ئەوان بەم بابەت بزانن. بۆیە ناچار بووین بە جفرە پێکەوە قسە بکەین.

وتم: "تێدەگەیت؟"

وتی: "بەڵێ تێدەگەم.."

ئەوەم وت و خواحافیزیم لێکرد. ڕۆژی دواتر، ئەو بەیەکەم فڕۆکە، خۆی گەیاندە ئاستین.

پاشان پەیوەندیم بە "بارت ناگس" (Bart knaggs)ەوە کرد. بارت، لە شاری ئاستین کۆنترین و باشترین هاوڕێم بوو. ئەو پێشتر پاسکیلسوار بوو، بەڵام لەو کاتەدا، لە کۆمپانیایەکی کۆمپیتەری کاری دەکرد. کە پەیوەندیم پێوە کرد، لە شوێنی کارەکەی بوو. ئەو ڕاهاتبوو کە تا درەنگ وەخت کار بکات. وتم: "بارت، من تووشی شێرپەنجەی گون بووم." بارت نەیدەزانی چۆن وەڵامم بداتەوە، بەلاچم وتی: "لانس، لەم سەردەمەدا، پزیشکەکان کاری زۆر سەیر لە بواری شێرپەنجەدا ئەنجام دەدەن، بۆیە ئەگەر پێویستە لەم پەیوەندییەدا کارێك بکەیت، دوو دڵ مەبە."

وتم: "نازانم، ئێستا لێرە بە تەنیا دانیشتووم و خەریکە لە ترسا ڕۆحم دەردەچێت."

بارت وەك هەمیشە، لە ئەنتەرنێتدا دەستی بە گەڕان کرد و هەر شتێك کە پەیوەندی بە نەخۆشییەکەی منەوە هەبوو کۆی کردەوە. ئەو تا درەنگانێك لەبارەی شێرپەنجەوە بەنێو ئەنتەرنێتدا گەڕا و ئەو بابەتانەی بۆ پرەنت دەکردم. پاشانیش هەموویانی بۆ هێنام بۆ ماڵەوە. بڕیاربوو سبەینێ بەیانی زوو لەگەڵ باربارا(Barbara)ی دەزگیرانی بچن بۆ ئۆرلاندۆ (Orlando)، بەڵام بەم کارەی دەیەویست پێم بڵێ کە چەندەی خۆش دەوێم. هاوڕێ و خزمەکانم یەك یەك دەگەیشتن. لیزاش هەر کە

هەواڵەکەی بیست، هات. کە پەیوەندیم پێوە کرد، لە کتێبخانە خەریکی خوێندنەوە بوو، بە بیستنی هەواڵەکە، تەواو مات و کڕ بوو بوو، دوای لیزا، بیل ستاپیلتۆن و لۆرای هاوسەری هاتن. بیل یەکێك لە پارێزەرە لاوەکانی شاری ئاستین بوو، لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی بەئەمەك بوو، بریکارنامەم بۆ کردبوو. لە ڕواڵەتدا پیاوێکی ئارام دیاربوو، بەڵام ئەو یەکێك لە مەلەوانە پێشووەکانی ئۆلۆمپیك لە زانکۆی تەکساس بوو، هێشتاش بەژن و باڵای وەرزشکاری هەبوو. هەر کە چاوم بەو کەوت، تەنیا لە بارەی لەدەستدانی کارەکەم قسەم دەکرد. وتم: "من دەبێت واز لە پاسکیلسواری بهێنم.. کەواتە چیتر پێویستم بە پارێزەر نییە."

بیل: "لانس، ئێمە ئێستا کارمان بە سەر باقی کارەکانەوە نییە.. کارمان بەوە نییە کە شێرپەنجە یانی چی و بڕیارە چی ڕوو بدات..."

"نا، بیل تۆ لە بابەتەکە تێنەگەیشتی.. من چیتر پێویستم بە پارێزەر نییە. چیتر گرێبەستێك لە ئارادا نییە."

"زۆر باشە، بەڵام من ئێستا وەك پارێزەر نەهاتووم بۆ ئێرە، منیش وەك دۆست و هاوڕێکانی دیکەت، هاتووم سەرت لێبدەم.. چ یارمەتییەکم لەدەست دێت؟"

ئەمە یەکێك لەو ساتانە بوو کە لەپڕ شوێنی هەموو شتەکان گۆڕان. من نیگەرانی لەدەستدانی کارەکەم بووم، لە حاڵێکدا کە بابەتی گرنگتر هەبوون.

وتم: "تکایە دایکم لە فڕۆکەخانەوە بێنن بۆ ئێرە."

هەر خێرا بیل و لۆرا، لە جێی خۆیان بەرز بوونەوە و بەرەو فڕۆکەخانە رۆشتن. خۆشحاڵ بووم کە دایکم لە فڕۆکەخانە نابینم، چونکە هەر کە چاوی بە بیل کەوتبوو، دووبارە فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتبووە خوار.. "لانس.بەندی دڵی منە، چۆن دەکرێ وای بەسەر هاتبێت؟! ئێستا پێویستە چی بکەین؟" ئەو زۆر پەرێشان و خەمبار بوو، بەڵام لەڕێی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە هەوڵی دابوو خۆی کۆ بکاتەوە و بەسەر خۆیدا زاڵ بێت.

کە هاتە ژوورەوە، لە هۆڵی دانیشتنەکە چاوم بە دایکم کەوت و باوەشم پێدا کرد.

دایکم بە گوێمدا چپاندی: "هیچ شتێك روو نادات. ئێمە پێشتر دەست وپەنجەمان لەگەڵ زۆر کێشەدا نەرم کردووە.. هیچ روو نادات."

پاشان هەردووکمان کەمێك گریاین، بەڵام زۆری نەخایاند، چونکە قسەمان زۆر بوو بۆ وتن.. هەمووومان لە دەوری یەك دانیشتن و من بۆچوونەکەی دکتۆر "ریۆز"م بۆ باس کردن. پێویست بوو سەبارەت بە هەندێك شت، کەمێك قسە بکەین. بەڵام کاتی زۆرمان بەدەستەوە نەبوو، چونکە بڕیار بوو کاتژمێر ٧ی بەیانی نەشتەرگەریم بۆ بکرێت. ئەو تیشکە وێنانەم پیشان دان کە لە نۆڕینگەی دکتۆر ریۆز هێنابوومن. لووەکان وەك تۆپگەلی سپی رەنگی گۆلف، لە سییەکانمدا دەبیندران.

حەزم دەکرد تا ماوەیەك بابەتی نەخۆشییەکەم بە نهێنی بمێنێتەوە. لەو کاتەدا کە سەرقاڵی قسەکردن لەگەڵ دایکم بووم، بیل پەیوەندی بە

نەخۆشخانەوە کرد و تکای لێکردن کە با نەخۆشییەکەی من بە نهێنی بمێنێتەوە و بە ناوێکی ساختەوە پرۆسەی ناوتۆمار کردن و چارەسەرییەکەی من ئەنجام بدەن. پێویست بوو سپۆنسەرەکانم، واتە نایك(Nike)، جیرۆ(Giro)، ئۆکلی(Oakley)، میلتۆن بێردلی(Milton-Bradley) و هەروەها "رێکخراوی کوفیدیس"م ئاگادار بکردبایە.. دەبوو کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیشم ساز بکردبایە. بەڵام پێش هەموو شتێك، پێویست بوو هاوڕێ نزیکەکانم وەك ئۆچ، کریس و باقی هاوتیمەکانم ئاگادار کەمەوە. مخابن زۆربەیان لە دەرەوەی وڵات بوون و پەیوەندی کردن پێیانەوە کەمێك قورس بوو.

هەر کەس، لەئاست هەواڵی نەخۆشییەکەی مندا، کاردانەوەیەکی هەبوو، هەندێك منگە منگیان دەکرد، هەندێکیان هەوڵیان دەدا ئارامم بکەنەوە.. بەڵام هەموویان پێداگر بوون لەسەر ئەوەی کە بە زووترین کات خۆیان بگەیەنە ئاستین. کاتێك کە پەیوەندیم بە "ئۆچ"ەوە کرد، لە ویسکانسین(Wisconsin) خەریکی خواردنی نانی ئێوارە بوو. دەمزانی چ کاردانەوەیەکی دەبێت.

لێم پرسی: "دانیشتووی یان بە پێوەی؟"

"مەگەر چی بووە؟"

"من تووشی شێرپەنجە بووم."

"یانی چی؟"

"یانی ئەوەی کە من تووشی شێرپەنجەی گون بووم و بڕیارە سبەینی نەشتەرگەریم بۆ بکرێت.."

"زۆر باشە، بزانم چی روو دەدات.. باشە سبەینێ دەتبینمەوە."

دواجار کاتی ئەوە هات بخەوین. سەیرەکە لەوەدا بوو کە من خەوێکی قوڵم لێکەوت. ئەو شەوە، پشوویەکی زۆر باشم دا، وەك بڵێی دەمەوێ خۆم بۆ رکابەرییەکی گەورە ئامادە بکەم. هەمیشە کە پێشبڕکێیەکی گرنگم لەپێش بایە، وەك پێویست دەخەوتم. ئەو شەوەش هەر بەو جۆرە بوو.. لەڕاستیدا من دەمەویست بۆ رووبەروو بوونەوە لەگەڵ ئەو رووداوانەی لەپێشم بوون، لە باشترین حاڵەتدا بم.

کاتژمێر ٥ی بەیانی رۆژی دواتر لە نەخۆشخانە بووم. خۆم شۆفێریم دەکرد، دایکیشم لە تەنیشتم دانیشتبوو. لە حاڵێکدا کە دەستێك تراکسووتی فشم لەبەردابوو، خۆم کرد بە نەخۆشخانەدا تا وەك "نەخۆشێکی شێرپەنجە"ی ژیانی نوێم دەست پێبکەم.. سەرەتا کۆمەڵێك پشکنینی رۆتینی، وەك پشکنینی خوێن و تیشکە وێنەی ئێم.ئارِ. ئای(MRI: Magnetic Resonance Imaging)م بۆ کرا. هێشتاش لە قووڵایی دڵمدا کەمێك هیوام مابوو کە دوای ئەنجامدانی پشکنینەکان، پێم بڵێن هەڵەیان کردووە و نەخۆشییەکەم هێندە گرنگ نییە. بەڵام هیچ باس نەبوو...

هەرگیز شەو لە نەخۆشخانە نەمابوومەوە و هیچم لە شتانێکی وەك وەرگێران لە نەخۆشخانە و شتەکانی دیکەی دەرمان و چارەسەری

نەدەزانی، هەر بۆیە جزدانی پارەکەشم لەگەڵ خۆمدا نەبردبوو. سەیری دایکم کرد و ئەو خێرا بەکارە ئیدارییەکانی ناو تۆمارکردن و فایل وەرگرتن و ئەمجۆرە شتانە راگەیشت و منیش بۆ پشکنینی خوێن چوومە تاقیگە.

نزیکەی سێ کاتژمێر لە ژووری نەشتەرگەری و هاتنەوە هۆشخۆ (ریکاوەری) بووم. ئەو سێ کاتژمێرە بۆ دایکم تەمەنێك بوو.. ئەو لەگەڵ بیل ستاپیلتۆن چاوەڕوانی گەڕانەوەی من بوون. دکتۆر ریۆز ئاگاداری کردنەوە کە نەشتەرگەرییەکە سەرکەوتوو بووە و بێ ئەوەی هیچ کێشەیەك تایبەت بێتە پێش لووەکانیان دەرهێناوە. هەر لەو کاتەشدا ئوچ گەیشت. وەك بەڵێنی دابوو، بە یەکەم تەیارەی بەیانی، خۆی گەیاندبووە ئاستین. ئەو کاتەی لە ژووری نەشتەرگەری بووم، دایکم باسەکەی بۆ ئوچ گێڕابووەوە و وتبووی کە دڵنیایە هەموو شتێك بە باشی کۆتایی دێت.. وەك بڵێی لەو باوەڕەدا بوو کە ئیرادەی بەهێزی ئەو دەتوانێ هەموو هێزەکانی ئەم گەردوونە تەیار بکات تا هەموو شتێك بە باشی و بەخۆشی کۆتایی بێت.

دواجار منیان هێنایە ژوورەکەم. لەبەر کاریگەری دەرمانەکانی بەنج کردن، هێشتاش وڕ و گێژ بووم، بەڵام دەمتوانی قسە لەگەڵ ئوچ بکەم. "من بەسەر ئەودا زاڵ دەبم، هەرچی بێت.."

ئەو شەوە منیان لە نەخۆشخانە هێشتەوە. دایکیشم تا بەیانی لەسەر کورسییەکی بچووك خەوتبوو.. ئەو شەوە هیچ کام لە ئێمە بە ئاسوودەیی

نەخەوتین، من ئازارم زۆر بوو، ئەو درزەی کە لەکاتی نەشتەرگەریدا دروستیان کردبوو، درێژ و قووڵ بوو، هەروەها شوێنەکەشی هەستیار بوو. هەموو جارێك کە دایکم گوێی لە خشەخشی چەرچەفەکان دەبوو، لەخەو رادەپەڕی و خۆی دەگەیاندە تەنیشت قەرەوێڵەکەی من.. لەبەر ئەوەی کە ئاویان پێهەڵواسیبووم، هەر کات کاری توالێتم هەبایە، دایکم یارمەتی دەدام تا لە قەرەوێڵەکە بێمە خوار، شوێنی هەڵواسینی ئاوەکەی بۆ هەڵدەگرتم و منیش بە شەلەشەل بەرەو توالێت دەڕۆشتم. دوای ئەوە، دیسان یارمەتی دەدام تا بگەڕێمەوە سەر قەرەوێڵەکەم. کەفەرێکی نایلۆنیان بە سەر دۆشەکەکانی نەخۆشخانەدا دابوو، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی ئارەق بکەمەوە. هەموو چەند کاتژمێر جارێك بەهۆی ئەوەی کە چەرچەفەکان دەخووسان، خەبەرم دەبۆوە، بەڵام دایکم بەردەوام ئەوانی دەگۆڕی... ڕۆژی دواتر، دکتۆر یومان هاتە ژوورەکەم تا ئەنجامە بەرابیەکانی راپۆرتی پاتۆلۆژی (خەسارناسی) و پشکنینەکانی خوێن بۆ ئێمە روون بکاتەوە. من هێشتا هەر هیوادار و گەشبین بووم بەوەی کە نەخۆشییەکەم پیس نەبێت، تا ئەوەی کە پزیشکەکە دەستی کرد بە نیشانە دانان لەسەر ژمارەکانی پشکنییەکان. ئەو وتی بەپێی ئەو نموونانەی وەرگیراون و پشکنینی خوێن، نەخۆشییەکە بەخێراییەکی زۆر لە تەشەنەسەندن دایە.

لە ماوەی ئەو بیستوچوار کاتژمێرەی کە زانیبووم شێرپەنجەم هەیە، ئەوەندەی بۆم کرا شتم سەبارەت بە نەخۆشییەکەم خوێندەوە. لەم ئاستەدا دەمزانی کە پسپۆڕانی ئانکۆلۆژی ( شێرپەنجەناسی)،

شێرپەنجەی گون بۆ سێ قۆناغ پۆلێن بەندی دەکەن: لە قۆناغی یەکەمدا، شێرپەنجە، تەنیا گونەکان دەگرێتەوە و ئەگەری چاکبوونەوەی زۆرە. لە قۆناغی دووەمدا شێرپەنجە، گلاندە لینفاوییەکانی ناوچەی سکیش دەگرێتەوە و دواجار لە قۆناغی سێیەمدا، ئەندامە سەرەکییەکانی لەش وەك سییەکانیش دەکەونە بەر پەلاماری شێرپەنجە.. پشکنینەکان، ئەوەیان پیشان دەدا کە من لە قۆناغی سێیەمی نەخۆشییەکەدام. لەڕاستیدا سی جۆر شێرپەنجەی جیاواز لە لەشی مندا بەدی دەکرا کە لە نێو ئەواندا، کریۆکارسینۆما (Choriocarcinoma) خراپترینیان بوو کە رزگار بوون لێی کارێکی ئەستەم بوو..

بڕیاربوو هەفتەیەك دواتر دەست بە چارەسەری کیمیایی بکەن. بۆ ئەم کارە دەبوو کاتتر گرۆسجن (Grosjean)ێك لە سنگم رۆکەن. چارەسەر وەرگرتنەکەم سێ مانگی دەخایاند، لەم ماوەیەدا دەبوو پشکنینێکی خوێنی زۆر بکەم. دەبوو دەرمانی جۆراوجۆر بکەنە نێو بۆرییەکانی خوێنمەوە کە بە دەرزی ستانداردی IV ئەو کارە نەدەکرا و هەر بۆیە پێویست بوو کاتتر دابنێن. کاتتر دیمەنێکی جوانی نەبوو. ژێر پێستم هەڵتۆقیبوو، دەمەکەی ناسروشتی و وەك چیکڵدانۆچەی ماسییەکان وابوو.

بابەتێکی دیکە ئەوە بوو کە من بۆ ماوەی چەند مانگێك نەزۆك دەبووم. قۆناغی یەکەمی وەرگرتنی چارەسەری کیمیاییەکەم، هەفتەی دواتر دەستی پێدەکرد.. هەر بۆیە دکتۆر یومان، ئامۆژگاری کردم کە تا پێش

دەستپێکردنی چارەسەرییەکە، سپێرم (Sperm)ی پێویست کۆبکەمەوە. ئەمە یەکەمجار بوو کە بابەتی نەزۆك بوون باس کرابوو، بۆیە هەر بە بیستنی شۆك بووم.. دکتۆر یومان بۆی روون کردمەوە کە: "هەندێك لەو نەخۆشانەی کە چارەسەری کیمیایی وەردەگرن، دووبارە توانای سێکسی خۆیان بەدەست دەهێننەوە، بەڵام هەندێکیشیان تووشی نەزۆکی دەبن. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون، نزیکەی ٥٠٪ نەخۆشەکان دوای ساڵێك دەگەڕێنەوە دۆخی سروشتی خۆیان." دکتۆر یومان وتی بۆ ئەم مەبەستە، بچم بۆ بانکی سپێرم کە لە "سان ئانتۆنیۆ"یە. ئەم بانکە نزیکەی دوو کاتژمێر لە نەخۆشخانەکەوە دوور بوو.

ئەو شەوە، پێش ئەوەی لە نەخۆشخانە دەرچین، دایکم چووە بەشی خوێن و ئانکۆلۆژی تا کەرەستەی پێویست بۆ دانانی کاتتر و دەرمانی دژە هێڵنج وەربگرێت. ئەگەر تا ئێستا سەردانی بەشی ئانکۆلۆژیت نەکردووە، دەبێ بڵێم چوون بۆ ئەم بەشە زۆر نیگەرانکەرە. هەموو نەخۆشەکان بەتانیان لە خۆیانەوە پێچاوە، هەموو قژیان وەریوە و رەنگیان زەرد هەڵگەڕاوە و رەنگ بە روویانەوە نەماوە، یەك یان چەند سرنجیشیان پێوەیە. دایکم لە حاڵێکدا کە چاوەڕوانی وەرگرتنی شتەکان بوو، سەیری چوار دەوری خۆی دەکرد. کاتێك شتەکانیان بۆ هێنا، هەموویانی خستە نێو جانتایەکی مشەما(بڕزنت)یی گەورە. پاش ماوەیەك گەڕایەوە ژوورەکە. "کوڕم، تەنیا با ئەوەت پێبڵێم، کاتێك دەچیتە ئەو بەشە، دیمەنی جوان و دڵخۆشکەر نابینیت.. بەڵام لەبیرت نەچێ کە

هەمووتان تەنیا لەبەر یەك هۆكار لەوێن، ئەویش بەدەستهێنانەوەی لەسشاغییە..."

پاشان منی بردەوە بۆماڵەوە.

ڕۆژی شەممە، بەیانییەكەی زوو لەخەو هەستام و چوومە سەرئاو، سەیرێكی ئاوێنەم كرد.. بە بینینی ئەو دیمەنە دەمویست هاوار بكەم، بەڵام خۆم كۆنترۆڵ كرد. تۆپەڵێك خوێنی گەورە لە كاتترەكەدا كۆ ببۆوە و سنگم تەواو ئاوسابوو. خێرا چوومە ژووری خەوەكەم و پیشانی "لیزا"م دا. لێزا لە ترسان زمانی نەدەگەڕا. بانگی دایكم كرد: "دایە، كەمێك وەرە بۆ ئێرە!" دایكم خێرا هاتە ژوورەكە و "كاتتر"ەكەی تاقی كردەوە. هیچ خۆی تێكنەدابوو، تەنیا دەسرێكی هەڵگرت و بە هێواشی شوێنی ئاوساوییەكەی خاوێن كردەوە و پاشان پەیوەندی بە نەخۆشخانەوە كرد. پەرستاری ئەو بەشە، بە دایكمی وت مەبینی خوێنی نێو كاتترەكە نائاسایی نییە و دایكمی فێر كرد كە چۆن ڕێ لە هەوكردنی ئەو شوێنە بگرێن.

دایكم تەلەفۆنەكەی داخستەوە و بەپەلە لە ماڵ چووە دەرەوە. كەمێك دواتر، بە چەند بەستە لەزگەی برینەوە گەڕایەوە. یەكێك لە لەزگەكانی خستە سەر كاتترەكە. بە بینینی ئەو دیمەنە من و لیزا پێكەنین گرتبووینی.. پاشان پەیوەندی بە دكتۆر "یوما"وە كرد و ڕووداوەكەی بۆ گێڕایەوە: "كاتتر ڕواڵەتێكی جوانی نییە، من هەوڵم دا ئەوەندەی دەكرێ خاوێنی بكەمەوە، بەڵام ڕەنگە پێویست بكات دەری بهێنین.."

"جارێ هیچ کارێك مەکەن، چونکە بڕیامداوە زووتر دەست بە چارەسەری کیمیایی لانس بکەم.. دوو شەممە، کاتژمێر یەکی دوانیوەڕۆ، دەست پێدەکەین."

"بۆچی؟"

تەلەفۆنەکەم لە دایکم وەرگرت. دکتۆر وتی ئەنجامی وردی راپۆرتەکانی پاتۆلۆژی و پشکنینەکانی خوێن لەبەردەستدان و ئەم ئەنجامانە کەمێك نیگەران کەرن. لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا، شێرپەنجەکە پەرەی سەندبوو. پسپۆڕانی ئانکۆلۆژی لە ماددە گەلێکی ناسراو بە پیشاندەری خوێن سوود وەردەگرن تا بزانن نەخۆشییەکە چەندە پەرەی سەندووە: ئاستی پرۆتینەکانی نێو خوێن، وەك گۆنادۆترۆپین کرۆنیکی مرۆیی (Human Chronic Gonadotropin) ناسراو بە Hcg و ئالفا فتۆ پرۆتین (Aipha-fetoprrotein) ناسراو بە Afp ئاستی شێرپەنجە لە لەشدا پیشان دەدەن. لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا ئاستی ئەم پرۆتینانە لە لەشی مندا بەرز بوو بۆوە.

شێرپەنجە بەخێراییەکی زۆر لە پەرەسەندندا بوو، پزیشکەکەم بەهیچ شیوەیەك بە باشی نەدەزانی کە چارەسەری کیمیاییەکە تا هەفتەی داهاتوو دوا بخات.. دەبوو خێرا چارەسەرییەکەم وەرگرتبایە، چونکە بەم خێراییەی کە نەخۆشییەکە لە پەرەسەندندا بوو، تەنانەت یەك رۆژیش رۆلێکی چارەنووسسازی هەبوو...

بە نائومێدییەوە تەلەفۆنەکەم داخستەوە. بەڵام هیچ بواری خەفەت

خواردنم نەبوو، تەنیا شانسی من ئەمە بوو کە هەر ئەو ڕۆژە بچم بۆ بانکی سپێرم لە سان ئانتۆنیۆ. بە دایکم وت: "بەڕاستی جێ پەژارەیە.."

بەدرێژایی ڕێگا زۆر نیگەران بووم. تەنیا شتێك کە کەمێك ئارامی پێدەبەخشیم، ئەوە بوو کە کوین لە لام بوو. بەڕاستی بە بینینی خۆشحاڵ بووم. کوین، دوو چاوی شینێکی درەوشاوە و قژێکی ڕەشی کورتی هەبوو. حاڵەتی ڕوخساری بەشێوەیەك بوو دەتووت هەمیشە دەیەوێ پێبکەنێت.. کاتێك کە کوین لە نێو کومەڵێك خەڵکدا بوایە، نەدەکرا خەمبار بین. ئەو ڕۆژە، کەسێکی دیکەش یارمەتی داین: کۆرد (Cord) کوڕە لاوەکەی دەیڤید شیفلێت (David Shiflet) ئێمەی تا بانکی سپێرم گەیاند، دەیڤید یەکێك لە دۆستان و هەروەها ئەندازیاری خانووەکەی من بوو.

من بێ ئەوەی یەك وشەش بڵێم، لە کورسی دواوەی ئوتۆمبێلەکەدا دانیشتبووم. بیری خراپ یەك لە دوای یەك بە مێشکمدا گوزەریان دەکرد. ڕەنگە چیتر نەتوانم منداڵم ببێت.. دەچووم تا یەکەم جاری چارەسەری کیمیایی ئەنجام بدەم. بڕیار بوو چ شتێك ڕوو بدات.

دواجار گەیشتین. کۆرد و کوین، لەگەڵ دایکم لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتن و پەرستارێك ڕێنوێنی کردم بۆ ژوورەوە. کوین بۆ ئەوەی کەشەکە بگۆڕێت، بەردەوام نوکتەی قۆڕی دەگێڕایەوە. جاروبار پێکەنینێکی ساردوسڕ دەکەوتە سەر لێوانم.. هەمیشە لای خۆم وام بیر دەکردەوە کە لەو کاتەدا کە دەبمە خاوەنی منداڵ تەژی لە ئەوین و

هیوام. هەرگیز تەنانەت بە خەیاڵیشمدا نەدەهات کە لە دۆخێکی ئاوا نیگەرانکەردا، بیر لە منداڵبوون بکەمەوە. هاوسەرگیری و بوون بە باوك، شتانێك بوون کە بیرم لێکردبوونەوە، بەڵام ئێستا هەستم دەکرد هەموو ئاواتەکانم لەم پەیوەندییەدا بوونە بلّقی سەر ئاو.

لە ژووری چاوەڕوانی، دایکم و هاوڕێکانم چاوەڕێیان دەکردم. دواتر زانیم کە دایکم بە تووڕەییەوە بەوانی وتبوو، حەز ناکەم کە لانس لە ژوورەکە هاتە دەر، تەنانەت یەك قسەشی لەگەڵ بکەن، تەنانەت یەك وشەش! دایکم دەیزانی کە ئەم رووداوە، یەکێك لە ناخۆشترین ئەزموونەکانی ژیانی منە.. کە کارەکەم تەواو بوو، لە ژوورەکە هاتمەدەر و شوشەکەم دا بە پزیشك. کۆرد و کوین بێدەنگ بوون.. چەند فۆڕمێکم پڕ کردەوە و بە پەرستارەکەم وت: "دواتر زانیارییەکانی دیکەتان بۆ دەنێرم." هەموو مەبەستم ئەوە بوو زووتر ئەو شوێنە جێبهێڵم. دەمویست لە دەرگا بچمەدەر کە کاکی پزیشك دووبارە هاتەوە.

"ژمارەی سپێرمەکان زۆر کەمن."

پزیشك بۆی روون کردمەوە کە ژمارەی سپێرمەکان نزیکەی یەك لەسەر سێی ئەو برە بووە کە پێویست بووە. وادیاربوو کە شێرپەنجە کاری لە توانای سێکسیشم کردبوو. تازە خۆ چارەسەری کیمیایی لەوەش خراپتری دەکات.

لە گەڕانەوەدا، زۆر نیگەرانتر بووم. لەگەڵ کوین و کۆرددا لەبارەی قۆناغە قێزەونەکانی ئەم کارە دەدوام، بەڵام ئەوان بەشێوەیەك رەفتاریان

دەکرد وەك بڵێی هەموو شتێك تەواو ئاسایی بووە و هیچ شتێکی تایبەت ڕووی نەداوە.. بەم شێوە ڕەفتارەی ئەوان خۆشحاڵ بووم و ئەمە دوایین جار بوو کە سەبارەت بە نەخۆشییەکەی خۆم شەرمم دەکرد.

باقی ڕۆژانی پشووی کۆتایی هەفتەم لەماڵەوە و لەنێو قەرەوێڵەکەمدا بەسەربرد. بەنجەکان منیان وڕ و کاس کردبوو، شوێنی نەشتەرگەرییەکەش ئازاری زۆر بوو. کاتە بەتاڵەکانم بە سەیرکردنی یارییەکانی تۆپی پێ پڕ دەکردەوە. دایکم چێشتی لێدەنا و هەندێك جاریش لەگەڵ مندا سەبارەت بە شێرپەنجە شتی دەخوێندەوە. ئەو بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم کە: "وریابە هیچ شتێکمان لەبیر نەچێت." لەکاتی خوێندنەوەدا، لە بارەی ئەو کارانەوە قسەمان دەکرد کە دەبوو ئەنجامیان بدەین. من لە دایکمم دەپرسی: "چۆن لەدەستی ڕزگارمان ببێت؟" لەڕاستیدا، ئێمە بەجۆرێك ڕەفتارمان دەکرد وەك بڵێی بە بەرنامەڕێژەیەك دەتوانین بەسەر ئەو نەخۆشییەدا زاڵ ببین.

ئەو هەفتەیە، دایکم ڕەچەتەکانی منی پێچایەوە، تێکڕای پێشینە پزیشکییەکانی منی ڕێکخست، هەموو کتێبفرۆشییەکان گەڕا، تا بابەت گەلێك لەسەر شێرپەنجە پەیدا بکات. بەرنامەیەکی بۆ دانام. ئەو دەفتەرێکی بیرەوەری بۆ من کڕی تا یاداشتەکانم لەودا بنووسم. دەفتەرێکی تایبەت بە سەردانیکەرانی کڕیبوو، ئەو بەرنامەی سەردانیکەرانی بەشێوەیەك ڕێك خستبوو کە من هیچ کات تەنیا نەبم. ئێمە ئەم دەفتەرەمان ناو نا"ڕۆژمێری میوانی". بەرنامەکە بەشێوەیەك

ڕێکخرابوو کە نە زۆر دەوورم قەرەباڵغ بێ و نە ئەوەش کە تەنیا بم.

دایکم، ڕۆژمێرێکی سێ مانگەی دانا تا پرۆسەی چارەسەری کیمیایی من لەودا یادداشت بکات. لیستێکیشی بۆ دەرمانەکانی من و کاتی خواردنیان ئامادە کرد. وەك بڵێی نەخۆشییەکەی من پرۆژەیەك بوو، دایکیشم بەڕێوەبەری ئەم پرۆژەیە بوو! ئەو یەك دنیا قەڵەم بۆیە، هێڵکاری و ڕۆژمێری هەبوو.. بە بڕوای ئەو، نەزم و زانین، وادەهات پرۆسەی چاکبوونەوەکە خێراتر ببێت.

کاتێکیشی لای پسپۆڕێکی بواری خۆراك بۆ وەرگرتبووم. بە قورسی لە قەرەوێڵەکەم هاتمە خوار و سوار ئوتۆمبێل بووم. پزیشك بەرنامەیەکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شێرپەنجە و هەروەها لیستێك لە خۆراکە زۆر بەسوودەکان پێداین کە دژە ئۆکسادیان تێدا بوو: مریشکی خۆماڵی، بڕۆکلی، زۆر خواردنی ڤیتامین (C) بۆ نەهێشتنی ئەو ژەهرانەی بەهۆی چارەسەری کیمیاییەوە لە لەشمدا دروست بوو بوون. بەڵام خواردنی پەنیر و هەموو جۆرەکانی چەوری لێ قەدەغە کردم.. ئیدی کاری دایکم بوو بوو بەوەی کە بە هەڵم بڕۆکلیم بۆ زەرد بکات.

بەڵام لە پشت هەموو ئەم ڕووداوانەوە، دەبێ بڵێم، ئەوە دایکم بوو کە خەریکی ململانێ بوو نەك من! کاتێك کە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ خزم و کەس و کاردا دەکرد، هەستم بە لەرزینی دەنگی دەکرد. ئەو کاتانەی من لای دەبووم، تەلەفۆنەکەی دادەخستەوە.. ئەو هەوڵی دەدا هەستەکانی لە من بشارێتەوە، بەڵام من دەمزانی کە شەوان لە ژوورەکەیدا دەگری.

بڕیار بوو بەیانی ڕۆژی دوو شەممە، هەواڵی نەخۆشییەکەی من بڵاو ببێتەوە. کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیمان ساز کرد، تا بە رای گشتی رابگەیەنم کە من نەخۆشم و ناتوانم پاسکیلسواری بکەم. هەمووان ئامادە بوون، بیل، لیزا، دایکم و چەند کەس لە سپۆنسەرەکانم.. پەیوەندییەکی تەلەفۆنیش لەگەڵ هەواڵنێرە ئەورووپییەکاندا کرابوو. نوێنەرانی "کۆفیدیس"یش لەسەر مێز بوون. ژوورەکە پڕ بوو لە کامێرا و من دەبوو دەقی وتەکان بخوێنمەوە. کاتێك وشەی "شێرپەنجە" بە زمانمدا هات، غەڵبە غەڵبێك لە ژوورەکەدا دروست بوو.. هەواڵنێرەکان و وێنەگرەکان هەموویان شۆك بوو بوون. یەکێك لە بەرپرسانی کۆفیدیس ئامادەیی خۆی راگەیاند کە لە هەموو قۆناغەکانی نەخۆشیدا، لە هەر ڕوویەکەوە، پشتگیرم بکات تا دووبارە من لەسەر پاسکیل ببینێتەوە. من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە ڕووبەڕووی نەخۆشییەکەم ببمەوە و بێگومان لەم ڕووبەڕوو بوونەوەشدا براوە دەبم."

دوا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، یەکەم جاری وەرگرتنی چارەسەری کیمیایی من بوو. بیناکە، بینایەکی ئاسایی بوو کە بە خشتی قاوەیی دروستکرابوو. سەرم لە سادەیی شوێنەکە سوڕما: ژوورێکی چاوەڕوانی سادە، چەند کورسییەکی جۆراوجۆر، تەپڵەکێك و تەلەفزیۆنێکی لێبوو.. زیاتر لە ژوورێکی پێشوازی دەچوو کە پڕ لە میوان بێت. لە میوانییەك دەچوو، هەڵبەت جیا لەو موغەزیانەی کە بۆ هەر یەکێك لە میوانەکان هەڵواسرابوو!

دکتۆر یومان بۆی روون کردمەوە کە شێوازی ستانداردی چارەسەری شێرپەنجەی گون، ناوی (BEP)ە کە تێکەڵەیەکە لە سێ دەرمانی جۆراوجۆر بەناوەکانی بیلئۆمایسین، ئیتۆپۆساید و سیس پلاتین( :BEP Bleomycin, Etoposide, Cisplatin)[4] پێکهاتووە. ئەم دەرمانانە هێندە مەترسیدارن کە پەرستارەکان، لەو کاتەدا کە بەکاریان دەهێنان، جلوبەرگی تایبەتیان دەپۆشی. لەنێو ئەم سێ ماددەدا، سیس پلاتین لەوانی دیکە گرنگتر بوو. سیس پلاتین، لەڕاستیدا هەمان پلاتینە کە بۆ یەکەمجار لە لایەن دکتۆر لۆرنس ئینهۆرن ( Dr. Lawrence Einhorn)ەوە بۆ چارەسەری شێرپەنجەی گون بەکار هێنرا. پێش دۆزینەوەکەی ئینهۆرن، شێرپەنجەی گون لە زۆر حاڵەتدا کوشندە بوو. برایان پیکۆلۆ (Brian Piccolo) یاریزانی بەناوبانگی جیهانیی تۆپی پێ، بەهۆی شێرپەنجەی گونەوە مردبوو. بەڵام یەکەم کەس کە دکتۆر ئینهۆرن بە هۆی بەکارهێنانی پلاتینەوە چاکی کردبۆوە، هێشتاش لە ژیاندا بوو.

ئەگەر منیش لەو کاتانەدا بژیابام، بێگومان هەر لە شەش مانگی یەکەمداماڵئاواییم لەم دنیایە کردبوو. زۆربەی خەڵك پێیانوایە کە پیکۆلۆ بەهۆی شێرپەنجەی سییەکانەوە مردووە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە پیکۆلۆ تووشی شێرپەنجەی گون بوو بوو، بەڵام پزیشکەکان نەیانتوانی هیچی بۆ بکەن. ناوبراو ساڵی ١٩٧٠، لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا کۆچی دوایی

---

[4] - ناشیبیەکەی ئەوەیە کە منیش هەر سێ دەرمانەکانی سەرەوەم -بەڕیز- لە پرۆسەکانی چارەسەری کیمیایی ABVD و ESHAP تاقی کردۆتەوە. و، فارسی

کرد. لەو کاتە بەدواوە، سیس پلاتین وەك دەرمانێکی پەرجوو ئاسای شێرپەنجەی گون، بەکارهێنراوە و یەکەم کەس کە بەم دەرمانە چاك بۆتەوە، بۆ زیاتر لە ٢٠ ساڵ خانەی شێرپەنجەیی لە لەشیدا نەبوو. ئەو هەموو ساڵێك لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا، میوانییەکی گەورەی ساز دەکرد و دکتۆر ئینهۆرن و هەموو ستافە پەرستارییەکەی ئەوی دەعوەت دەکرد.

بە خۆمم وت کەوایە زووتر وەخۆ بکەون و پلاتینم بۆ بهێنن.. بەڵام پزیشکەکە ئەم بەرچاو ڕوونییەی دا بە من کە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە، کەسەکە زۆر لاواز دەکات.. پرۆسەی چارەسەرییەکە بەم شێوەیە بوو کە ئەم دەرمانە لە ماوەی ٥ ڕۆژدا و بۆ ماوەی ٥ کاتژمێر، دەکرایە لەشی منەوە. ئەم ماددانە هێڵنجهێنەر بوون و هەر لەبەر ئەمەش، لەپاڵ بەکارهێنانی ئەواندا، دەرمانی دژە هێڵنجیشیان بۆ دانابووم. هەڵبەت تەنانەت ئەگەر دەرمانی دژە هەڵێنجیشم بەکار بهێنابایە، بەتەواوی حاڵەتی هێڵنجدانەکەم لە کۆڵ نەدەبۆوە.

چارەسەری کیمیایی هێندە قورسە کە ناتوانرێ زوو زوو بەکار بهێندرێت. بەڵکو لە قۆناغ گەلی سێ هەفتەییدا ئەنجام دەدرێت. بەمجۆرە من هەفتەیەك چارەسەری کیمیایم بۆ دەکرا و پاشان دوو هەفتە پشووم دەدا تا لەشم بەهێز ببێتەوە و خڕۆکەی سووری نوێ دروست بکات.

دکتۆر یۆمان، بەوردی هەموو شتێکی بۆ ئێمە ڕوون دەکردەوە و ئێمەی بۆ چارەسەری کیمیایی ئامادە دەکرد. کە قسەکانی ئەو تەواو بوو، پرسیارێکم بۆ دروست بوو. ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە بەدرێژایی

ماوەی چارەسەری کیمیایی، بەردەوام دەمپرسی: "ئەگەری چاکبوونەوەم چەندە؟"، "چەندە شانسی ئەوەم هەیە بژیم؟"

دکتۆر یومان وتی: "لە نێوان ٦٠٪ بۆ ٦٥٪"

یەکەم چارەسەری کیمیایی من، بەشێوەیەکی سەیر، باش چووە پێش، ئەویش تەنیا لەبەر یەك هۆ، هۆکەش ئەمە بوو کە من هەستم بە نەخۆشی نەدەکرد. چوومە ژووری چاوەڕوانی و لە کورسییەکانی ریزی پێشەوەی دیوارەکە دانیشتم. دایکم ماچی کردم و بۆ راپەڕاندنی ئەو کارانەی کە مابوون، لە جێی خۆی هەستا و منی لەگەڵ نەخۆشەکانی دیکەدا بەتەنیا جێهێشت.

دایکم پێشتر پێی وتبووم کە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ تووشبووانی شێرپەنجەدا زۆر خۆش نییە، بەڵام من هیچ هەستێکی لەو شێوەیەم نەبوو، بەپێچەوانەوە، بەجۆرێك لە جۆرەکان هەستم بە هاوپێوەندی و هۆگربوون لەگەڵ ئەواندا دەکرد. لەوەی کە دەمتوانی لەگەڵ کەسانێکدا بدوێم کە کێشەی وەك منیان هەیە و لەگەڵیاندا ئەزموونەکانمان ئاڵوگۆڕ بکەین، هەستم بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکرد. کاتێك دایکم گەڕایەوە، لەگەڵ پیاوێکدا کە لە تەنیشت منەوە دانیشتبوو، قسەمان لێ خۆش کردبوو. ئەو تاڕادەیەك هاوتەمەنی باپیرم بوو، بەڵام بوو بووینە دوو هاوڕێی زۆر باش. سەرقاڵی قسە بووین کە دایکم هات، بەخۆشحاڵییەوە پێمووت: "ها دایە، پێت دەناسێنم، "پوول"ی هاوڕێم.. پوول شێرپەنجەی پرۆستاتی هەیە."

بەردەوام بەخۆمم دەووت، نابێ جووڵەم لەدەست بدەم. لە ماوەی هەفتەی یەکەمی چارەسەری کیمیاییدا، هەموو ڕۆژێك بەیانی زوو لەخەو هەڵدەستام، هێدفۆنەکانم دەکردە گوێم و دەکەوتمە ڕێ.. کاتژمێرێك پیادەڕەوی خێرام دەکرد تا ئارەق بکەمەوە. دوانیوەڕۆیانیش پاسکیلسواریم دەکرد.

بارت لە ئۆرلاندۆ گەڕایەوە، ئەو لە دیزنی لەند کڵاوێکی میکی ماوسی بۆ کڕیبووم. لای خۆی بیری کردبۆوە کاتێك قژم دەوەرێ، پێویستیم بە کڵاوێك دەبێت.

من و بارت پێکەوە پاسکیلسواریمان دەکرد و "کوین"یش زۆر ڕۆژ لەگەڵمان دەهات. بارت نەخشەگەلی گەورەی بۆ دروست دەکردین. ئەو نەخشەی ئەو ناوچانەی لە فەرمانگەی ڕێگاوبانی ناوچەکە وەردەگرت، ئەوی دەبڕی و پێکەوەی دەلکاند. ئێمە لەسەری دەوەستاین و ڕێگە گەلی نوێمان بۆ خۆمان هەڵدەبژارد. ڕێگ اگەلی پێچاوپێچی دووردوورودرێژ، لە کەسنەزاندا... هەمیشە بەدوای ئەوەوە بووین کە ڕێگایەکی نوێ بدۆزینەوە، ڕێگایەك کە پێشتر پێیدا نەڕۆشتبووین. من تەحەمولی ئەوەم نەدەکرد کە دوو جار بە یەك ڕێگادا بڕۆم. هەندێکجار ڕاهێنانەکان، بەڕادەیەك وەك یەك و ماندووکەر دەبن کە هەست دەکەی تینووی شتی نوێی، تەنانەت ئەگەر بڕیار بێ لەنێو ڕێدا، بگەیتە ڕێگایەکی دژوار، یان ئەوەی کە ون ببیت.. هەندێکجار ون بوونیش چێژی خۆی هەیە.

بۆچی سەرەڕای ئەوەی کە تووشی شێرپەنجە بوو بووم، پاسکیلسواریم

دەکرد؟ پاسکیلسواری وەرزشێکی قورسە، تووشی ئازاری زۆرت دەکات، بەڵام مرۆڤ لە هەموو شتێك پاك دەکاتەوە. لە کاتێکدا کە باری خەمی دنیات بە کۆڵەوەیە، سوار پاسکیل دەبیت، سەرەڕای ئازاری ماسولکەکان، شەش کاتژمێر تەواو پایدەر لێدەدەی، بەڵام لە کۆتاییدا هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت.. توندی ئازارەکە بە رادەیەکە کە وەك بڵێی پەردەیەك بە سەر مێشکتدا دەدەن. لانی کەم بۆ ماوەی چەند ساتێکیش بێ هەموو کێشەکان فەرامۆش دەکەی، واز لە هەموو شتێك دێنی، چونکە هەوڵ دان و ماندوێتی ئەو کارە لەڕادە بەدەرە.

لەم کارە دژوارەدا، جۆرە سادەییەکی لەباس نەهاتوو وەشێردراوە، رەنگیشە هەر بەڕاستی ئەم تەسەورە راست بێ کە دەڵێ، هەموو وەرزشکارە جیهانییەکان لە راستییەك را دەکەن. جارێك کەسێك لێی پرسیم: چ چێژێك لە پاسکیلسواری درێژ ماوە وەردەگریت؟

وتم: "چێژ؟!" "نازانم مەبەستت چییە!" من بۆ چێژ وەرگرتن، پاسکیلسواری ناکەم، من بۆ ئازار و مەینەتی کێشان، ئەم کارە دەکەم..

پێش ئەوەی تووشی شێرپەنجە ببم، هیچ کات لە دەروونناسی پاسکیلسواری درێژ ماوەم نەکۆڵیبۆوە. نەمدەزانی بۆچی ئەو کارەم نەکردبوو، زۆربەی ئەو کارانەی کە ئێمە دەیکەین لەکاتی ئەنجامدانیان واتایەکی بۆ ئێمە نییە.. من لەو کاتەدا، هیچ بە پێویستم نەدەزانی کە شیتەڵ و شیکردنەوە بۆ ئەو کارە بکەم، بەڵام ئێستا ئیدی دەمزانی بۆچی پایدەر لێدەدەم: ئەگەر درێژەم بە پایدەر لێدان دەدا، نەخۆشی و

زۆر شتی دیکەم بەتەواوی فەرامۆش دەکرد.

ئازاری جەستەیی شێرپەنجە هێندەی ئازار نەدەدام، چونکە من لەگەڵ ئازاردا راهاتبووم. لەبنەڕەتدا ئەگەر ئازارم نەچەشتبایە، هەستێکی باشم نەدەبوو. تا زیاتر بیرم دەکردەوە، وێکچوونی زیاترم لە نێوان شێرپەنجە و پێشبڕکێدا دەدۆزییەوە. لە روانگەی منەوە، تەنیا شتێك کە گۆڕابوو، ئامانج بوو. هەم پێشبڕکێ و هەم شێرپەنجەش، ئازارێکی زۆر بە کەسەکە دەچێژن، کات لەهەر دووکیاندا رۆڵێکی چارەنووسسازی هەیە، لەهەر دووکیاندا رادەی پێشکەوتنی کەسەکە بەو دەوترێ، ژمارە و پشکنینی خوێن لەهەر دووکیاندا حاڵەتێکی هاوبەشە.. تەنیا جیاوازی ئەوە بوو کە دەبوو من لە هەموو کات باشتر تەرکیزم لەسەر پاسکیل بووایە. من دەبوو بیر لە زیندوو مانەوە بکەمەوە. بەڕاستی ئەم بیرکردنەوەیە خۆشحاڵی دەکردم و ورەی پێدەبەخشیم: گەڕانەوە بۆ ژیان بە گەورەترین سەرکەوتن هەژمار دەکرا.

هێندە بیر و زەینم لەسەر ئەم بابەتە چڕ کردبۆوە کە لە قۆناغی یەکەمی چارەسەری کیمیاییدا، هەر بەڕاستی هەستم بە هیچ نەکرد. هیچ شتێك! تەنانەت بە دکتۆر یومانم وت: "رەنگە پێویست بکات دەرمانی زیاترم بۆ بەکاربهێنن.." لەڕاستیدا نەمدەتوانی تێبگەم کە لەشم تا ئەو رادەیە لە هەمبەر چارەسەری کیمیاییدا خۆڕاگربووە. پێش تەواوبوونی ئەم قۆناغە، نەخۆشانێکم بینی کە سەیر دەڕشانەوە. لە کۆتایی خولی یەکەمدا، خۆشم خراپ تووشی حاڵەتی هێڵنجدان بووم و هیچ

دەرمانێکیش دەوری نەبوو لەسەری.

پێش هەموو شتێك ئیشتیام گۆڕا. کاتێك کەسێك چارەسەری کیمیایی بۆ دەکرێ، بەهۆی ئەو مادده کیمیاییانەی دەکرێنە نێو لەشییەوە، تامی خواردنەکان دەگۆڕێت. دایکم قاپێك خواردنی بۆ دەهێنام و دەیووت: "کوڕم ئەگەر برسیت نییە و حەزت بۆ خواردن نییە، من هیچ نیگەران نابم." بەڵام من هەوڵم دەدا بیخۆم. کاتێك لەخەو هەڵدەستام، دایکم قاپێك میوەی قاشکراو و بتڵێك ئاوی گەورەی بۆ دەهێنام. بۆ ئەوەی لە جووڵە نەکەوم، دەبوو خواردن و میوەم بخواردایە.

بەردەوام بە خۆم دەووت دەبێ بجوولێی.. لە قەرەوێڵکەم دەهاتمە خوار، جلوبەرگی گەرمم لەبەر دەکرد، هێدفۆنم دەکردە گوێ و دەڕۆشتم. نازانم چەندە، بەڵام دەڕۆشتم.. تا ئەو کاتەی کە دەمتوانی بڕۆم، تەندروست بووم.

لە ماوەی چەند ڕۆژدا، پورشە (ئوتۆمبێلەکەم) فرۆشت، لەبەر دووشت فرۆشتم، یەکەم ئەوەی کە ڕەنگبوو لەکاتی چارەسەرییەکەدا پێویستم بە پارەکەی هەبایە، دووەم ئەوەی کە، پێموابوو کە باقی تەمەنم دەبێ بەو شتانە بگوزەرێنم کە هەمن. هەڵبەت پێموابێ بەرەبەرە مەیلم بەرەو لای سادە ژیان دەچوو.

چەند ڕۆژ پاش دەستپێکردنی چارەسەری کیمیایی، لە لایەن نەخۆشخانەوە نامەیەکمان بەدەست گەیشت: بەڵگەنامەکان ئەوە دەردەخەن تۆ بیمەی تەندروستیت نییە.

من بە سەرسوڕمانەوە، سەیری نامەکەم کرد. ئەمە ڕاست نەبوو.. تیمی مۆتۆرۆلا، بیمەی تەندروستی بۆ من وەرنەگرتبوو. تەلەفۆنم دەست دایە تا پەیوەندی بە "بیل ستاپڵتۆن"ەوە بکەم و نامەکەی بۆ بخوێنمەوە. بیل هەوڵی دەدا هێورم بکاتەوە و پاشان پێی وتم کە لە بابەتەکە دەکۆڵێتەوە.

چەند کاتژمێر دواتر، بیل پەیوەندی پێوە کردم. من خەریکبوو دەچوومە ریزی تیمی کوفیدیس و لەبەر ئەوەی پێشتر تووشی شێرپەنجە ببووبووم، ئەم تیمە لەم پەیوەندییەدا هیچ بەرپرسیارێتییەکی لەئاست مندا نەبوو. لەو لاشەوە گرێبەستی من لەگەڵ تیمی مۆتورۆلادا کۆتایی هاتبوو. بەمجۆرە دەبوو خۆم هەموو تێچووی مانەوە لە نەخۆشخانە و چارەسەرییەکەم لەئەستۆ بگرم، مەگەر ئەوەی کە بیل ڕێگایەکی بدۆزیبایەوە.

من تووشی شێرپەنجە بوو بووم، بیمەی تەندروستیشم نەبوو...

لە ماوەی چەند ڕۆژدا ڕووبەڕووی زۆر ڕاستی بوومەوە و ئەمە تەنیا یەکێك لەوان بوو، لە هەمان کاتدا زۆریش ترسناك بوو، چونکە بەڕاستی تێچووی دەرمان قورس بوو. هەر لەبەر ئەم هۆکارە، بە کەلوپەلی نێو ماڵەکەمدا گەڕام تا بزانم دەبێ کامیان بفرۆشم. چیتر لە رووی داراییەوە هیچ توانایەکم نەبوو. سەردەمێك ساڵانە دوو ملیۆن دۆلار داهاتم هەبوو، بەڵام ئێستا هیچ پارەیەکم بەدەستەوە نەبوو! من چیتر داهاتم نەبوو، چونکو ئیدی نەمدەتوانی پاسکیلسواری بکەم و ئەو کۆمپانیایانەی کە

سپۆنسەریان دەکردم، پارەیان پێنەدەدام.

پورشە کە سەردەمانێك ئەو هەمووە بایەخم پێدەدا، چیتر بەلامەوە ئەو خۆشی و جوانییەی نەمابوو. یەك "پنی"ش بۆ پێدانی پارەی نەخۆشییەکەم رۆڵی چارەنووسسازی هەبوو! بیرم لەوە کردەوە کەلوپەلی نێو ماڵەکەم هەڕاج بکەم، تا بەمجۆرە لەدەست نەگبەتی پورشە و کەلوپەلە جوانکارییەکان رزگارم ببێت.

من ببوومە خوێندکاری شێرپەنجە، سەردانی گەورەترین کتێبفرۆشییەکانی "ئاستین"م کرد و هەموو ئەو کتێبانەم کڕی کە بەجۆرێك پەیوەندییان بە شێرپەنجەوە هەبوو. دە بەرگ کتێبم کڕی و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. بابەتی ئەم کتێبانە پەیوەندیان بە خۆراك، سازگاربوونی دەروونی لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجە و میدیتەیشن (تێڕامان و دەرووبینی)یەوە هەبوو. دەمویست تێکڕای رێگاکان لەبەرچاو بگرم و هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو کە هەندێك لەم شێوازانە گاڵتەجاڕانە دەهاتنە پێش چاو. هەندێك شتم لەبارەی زەیتی تۆوی کەتانەوە خوێندەوە. ئەم زەیتە وەك "دەرمانێکی کاریگەر" بۆ چارەسەری ئارتریت (هەوکردنی جومگەکان)، جەڵتەی دڵ، شێرپەنجە و نەخۆشییەکانی دیکە باس کرابوو. ژۆرناڵ یۆگا (Yoga Journal)شم خوێندەوە، بەقووڵی کەوتمە ژێر کاریگەری ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان بە راج (Raj)ەوە هەبوو. راج بە واتای "بانگهێشت بۆ لەشساغی تەواو"ە. لاپەڕەکانی گۆڤاری "دیسکاوەر"یشم هەڵدایەوە و ئەو چیرۆکانەم کۆکردەوە کە

لەبارەی کلینیکە دوورە دەستەکان و چارەسەرییە دوور لە چاوەڕوانییەکان نووسرابوون. نامیلکەیەکیشم سەبارەت بە کلینیکی کۆماری دۆمینیکن خوێندەوە کە تیایدا "ڕێگا چارەیەکی تەواوەتی بۆ شێرپەنجە" پێشنیار کرابوو.

تێکڕای ئەو بابەتانەی کە بارت بۆی دەناردم بە حەز و تاسەوە دەمخوێندنەوە، هەر کات بە تەلەفۆن پێکەوە قسەمان دەکرد، لێم دەپرسی: "چیترت دەستکەوتووە؟" من پێشتر هێندەم حەز بە کتێب خوێندنەوە نەبوو، بەڵام ئێستا بوو بوومە خوێنەرێکی پیشەیی. بارت سەردانی سایتی ئەمازۆنی[٥] دەکرد و لە پەیوەند بە شێرپەنجەوە دەگەڕا. پاشان لێی دەپرسیم: "هەموو ئەو بابەتانەت دەوێ کە دەستم کەوتوون؟"

لە وەڵامدا دەمووت: "بەڵێ، هەموویانم دەوێ.." من تا شەشی ناوەندیم خوێندبوو، بەڵام ئێستا بابەتە پزیشکییەکانم دەخوێندەوە. هەمیشە حەزم بە خوێندنەوەی گۆڤارە بازرگانی و بیناسازییەکان بوو، بەڵام هێندەم حەز بە خوێندنەوەی کتێب نەبوو. لەڕاستیدا تەرکیزێکی زۆرم نەبوو، هەروەها نەمدەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێکدا دانیشم. ئێستا دەبوو بنەماکانی ئانکۆلۆژیم بزانیبایە.. وەك ئەوە وابوو کە لە بوارێکی نوێدا بخوێنم. هەندێك ڕۆژ بیرم دەکردەوە کە پێویستە سەر لەنوێ بچمەوە بۆ قوتابخانە و لە بواری پزیشکیدا درێژە بەخوێندن بدەم،

٥- سایتی ئەمازۆن: یەکێك لە بەناوبانگترین و پڕ لایەنگرترین فرۆشگا ئانلاینەکانی کتێبە لە دنیادا.

چونکە زانیارییەکی زۆرم لەم بوارەدا بەدەستهێنابوو.

کارم بوو بووە ئەوە کە لەسەر قەنەفە دانیشم و خێرا خێرا لاپەڕی کتێبەکان هەڵدەمەوە، بە تەلەفۆن قسە بکەم و ئامار و ژمارەکان بخوێنمەوە. دەمویست ماددە ناسروشتییەکان لەنێو لەشمدا بەتەواوی بناسم تا ڕێگایەك بۆ بەرەنگاربوونەوەیان بدۆزمەوە. هەرچەند بەپێی بەڵگەکان لە دۆخێکی باشیشدا نەبووم، بەڵام تا زیاتر لێکۆڵینەوەم دەکرد، هەستم دەکرد شانسی سەرکەوتنم زیاترە. بەڵام زانین لە نەزانین باشتر بوو: لانی کەمەکەی ئەمە بوو کە دەمزانی لەچ دۆخێکدام.

زمانی شێرپەنجە و زمانی پاسکیلسواری، لە یەك شتدا هاوبەشن ئەویش "خوێن"ە. یەکێك لە ڕێگاکانی دوپینگ[٦] لە وەرزشی پاسکیلسواریدا ئەمەیە کە بە بەکارهێنانی دەرمانی ئێپۆژن (Epogen) ژمارەی خرۆکە سوورەکانی خوێن زیاد بکەین. سەبارەت بە نەخۆشی شێرپەنجەش، ئەگەر ڕێژەی خرۆکە سوورەکانی خوێن لە ئاستێکی دیاریکراو زیاتر بێتەخوار، هەر ئەو دەرمانە بۆ کەسە نەخۆشەکە دەنوێنن. هەم لە پاسکیلسواری و هەم لە نەخۆشی شێرپەنجەدا، پزیشکەکان بۆ یەك مەبەست پشکنینیان بۆ خوێنی من دەکرد: ئاستی سترێسی فیسیۆلۆجی.

من زمانێکی نوێ فێر بووم، لەگەڵ چەمك گەلێکی وەك ئیفۆسفامید (Ifosfamid) (دەرمانێکی چارەسەری کیمیایی)، سێمینۆما

---

٦- دوپینگ: بەکارهێنان ماددەی وزەبەخشە لەکاتی وەرزش و پێشبڕکێکاندا.

(Seminoma) (جۆرێك لوو) و ئێل دی ئێچ ( LDH: Lactate Dehydrogenase) (هێمایەکی خوێن) ئاشنا بووم.. لە قسەکانمدا چەمك گەلێکی وەك "پرۆتۆکۆل دەرمانی" و ئەمجۆرە شتانەم بەکار دەهێنا. دەمەویست هەموو شتێك بزانم. حەزم دەکرد ڕێگای دووەم، سێیەم و چوارەمیش بزانم.

هەموو ڕۆژێك سەدان نامە و کارتم پێدەگەیشت، جاروبار لە نێو ئەوانەدا، هەندێك پێشنیاری گاڵتەجاڕانەشم بۆ چارەسەری دەبینی. من هەموویانم دەخوێندەوە.. لەڕاستیدا بە خوێندنەوەی نامەکان، چیتر کاتم بۆ بیرکردنەوە و خەم خواردن نەدەما، هەر بۆیە، دوانیوەڕۆیان، من و دایکم و لیزا سەرقاڵی خوێندنەوەی نامەکان دەبووین و ئەوەندەی بمتوانیبایە وەڵاممان دەدانەوە.

ڕۆژێك دەمەو عەسر، چاوم بە نامەیەك کەوت کە نەخشێکی بەرجەستە بە سەر نامەکەوە بوو. نامەکە لە لایەن ناوەندی پزیشکی زانکۆی ڤەندربیلت (Vanderbilt University)ەوە بوو. کەسێك بەناوی دکتۆر ستێڤن وۆڵف (DR. Steven Wolff)، نامەکەی نووسیبوو. ناوبراو سەرۆکی بەشی چاندنی مۆخی ئێسك بوو. ئەو لە نامەکەدا بۆی نووسیبووم کە پسپۆڕیی لە بواری ئانکۆلۆژیدا هەیە و هەروەها لە لایەنگرانی سەرسەختی پاسکیلسوارییە. لە کۆتاییشدا وتبووی کە لە هیچ یارمەتییەك بۆ من درێغی ناکات. ئەو پێداگری لەوە کردبوو کە تاوتوێی هەموو ڕێگا گریمانەکراوەکان بکەم. دوو شت لەم نامەیەدا سەرنجیان

راكێشام. یەکەم، زانیاری وۆڵف لەبارەی وەرزشی پاسیکیلسواری و دووەم، پێداگری زۆری ئەو لەسەر راوێژ کردن لەگەڵ خودی دکتۆر لەری ئاینهۆرن لە زانکۆی ئیندیانا.. چونکو ئەو لە بواری ئەم نەخۆشییەی مندا پسپۆرترین کەس بوو. ئەو لە نامەکەیدا نووسیبووی: "پێویستە ئەوەت لەبەرچاو بێ کە شیواز گەلی چارەسەری کیمیایی دیکەش هەن کە بەدواداهاتە لاوەکییەکان دەگەیەننە کەمترین ئاست و زیان بە توانای پاسکیلسواری تۆ ناگەیەنن."

تەلەفۆنم هەڵگرت و پەیوەندیم پێوە کرد: "سڵاو، من لانس ئارمێسترانگم." وۆڵف، کەمێك پەشۆکابوو، دوای چاکوچۆنی و هەواڵپرسینی ئاسایی، هەندێك پرسیاری سەبارەت بە رەوتی چارەسەرییەکەم لێکردم. پاشان وتی بەهیچ شێوەیەك مەبەستی ئەوە نییە کە توانا و لێوەشاوەیی هاوکارەکانی بخاتە ژێر پرسیارەوە، بەڵام دەیەوێ یارمەتیم بدات. بۆم روون کردەوە کە پرۆتۆکۆلی ستانداردی چارەسەری شێرپەنجەی گونی تەشەنەسەندوو(میتاستان) بۆ سییەکانم لەسەر جێبەجێ دەکرێت.

دکتۆر وۆڵف: هەڵسەنگاندنی من بۆ ئەم شێوازە، زۆر ئەرێنی نییە."

لەو ساتە بەدواوە، دەرمان کردنی من حاڵەتێکی بەکۆمەڵی پەیدا کرد. پێشتر پێموابوو پزیشکی واتە کارەکانی پزیشك لەسەر نەخۆشێك. لەم پەیوەندییەدا پزیشك بە کەسێکی زانا لەقەڵەم دەدرا و نەخۆشیش کەسێکی بێتوانا بوو. بەڵام بەرەبەرە تێگەیشتم هیچ کێشەیەك لە ئارادا

نییە ئەگەر بۆ چارەسەری یارمەتی لە کۆمەڵێك کەس و سەرچاوە وەرگرم، هەروەها تێگەیشتم کە ڕۆڵی نەخۆشیش بە ئەندازەی پزیشك گرنگی هەیە.

دکتۆر ریۆز، لە بواری بابەتەکانی پەیوەندیدار بە ئۆرۆلۆژی و دکتۆر یومان لە زەمینەی ئاکنۆلۆژیدا چاودێری منیان دەکرد. دکتۆر "وۆڵف"یش کە هاوڕێ و پارێزەرم بوو.. لەڕاستیدا ئەو لە پرۆسەی چارەسەرییەکەدا، چاوی سێیەمی من بوو، هەر کام لەم پزیشکانە، ڕۆڵێکی گرنگیان لەئەستۆ بوو. هیچ کام لەوان نەیاندەتوانی بەتەنیایی بەرپرسیارێتی لەشساغی من لەئەستۆ بگرن. لە هەمووی گرنگتر ئەمە بوو کە من خۆشم بەشێك لەم بەرپرسیارێتییەم لەئەستۆ گرت.

دکتۆر وۆڵف لێی پرسیم: "ئاستی (HCG) خوێنت چەندە؟"

(HCG) جۆرە هۆرمۆنێکی نێو ڕێژە کە دەبێتە هۆی وروژاندنی هێلکەدانی ژنان و لەڕاستیدا بە یەکێك لە هێما(ئاماژەدەر)کانی خوێن دادەندرێت. بەخێرای سەیری پشکنینەکانم کرد تا ژمارەکەی بدۆزمەوە. وتم: "سەد و نۆ"

"زۆر باشە! ئەم ژمارەیە زۆرە، بەڵام جێی هیوایە."

لەحاڵێکدا کە سەیری کاغەزی پشکنینەکەم دەکرد، تێگەیشتم کە پیتێکی (K) –بەواتای هەزار– لە پێش ئەم ژمارەوە نووسراوە.

وتم: "ببوورە، پیتی (K) لێرەدا واتای چی دەگەیەنێت؟"

دکتۆر ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: "واتە وەڵامی پشکنینەکەی تۆ ۱۰۹,۰۰۰(سەد و نۆ هەزار)ە!"

ئای..! ئەگەر ۱۰۹ زۆر بوو، کەواتە ۱۰۹,۰۰۰ چی بوو؟!! وۆڵف سەبارەت بە پشکنینەکانی دیکەی وەك (Abf) و (Idh) پرسیاری لێکردم. منیش بەردەوام پرسیارم لێدەکرد. "ئەمە واتای چییە؟"

وۆڵف پێی وتم، بە لەبەرچاو گرتنی لووەکانی نێو سییەکان، واش ئاستی HCG لە خوێنی مندا زۆر بەرزە. پێویستە دیاری بکرێت کە ئەم ماددانە لە کوێوە هاتوون. دکتۆر وۆڵف بە میهرەبانییەوە وتی رەنگە پێویست بێ هەندێك چارەسەری جددیترت بۆ داندرێت. پاشان راشکاوانە تێیگەیاندم کە بارودۆخم چۆنە: ئەم رێژەیەی HCGە، تۆ دەخاتە خراپترین گرووپەوە.

وۆڵف لە بابەت شتێکی دیکەشەوە نیگەران بوو، دەرمانی بێلئۆمایسین، کاریگەری خراپ لەسەر جگەر و سییەکان جێی دەهێڵێت. بە بڕوای ئەو، شێوەی چارەسەری لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە تەواو جیاوازە. شێوازێك کە بۆ نەخۆشێك وەڵام دەداتەوە، رەنگە سەبارەت بە نەخۆشێکی دیکە گونجاو نەبێ و سەبارەت بە من، پێدانی بێلئۆمایسین هەڵە بووە. پاسکیلسوار، چەندەی پێویست بە قاچەکانێتی رێك بەو رادەیەش پێویستی بە سییەکانێتی و بەکارهێنانی درێژ ماوەی بێلئۆمایسین بە واتای کۆتایهێنان بە وەرزشی پاسکیلسواری بوو. بە بڕوای وۆڵف، دەبوو دەرمانی دیکە بۆ من دابندرایە.

ئەو وتی: "چەند کەسێك هەن کە سەبارەت بە شێرپەنجەی گون، لەسەر ئاستی دنیادا قسەی یەکەم دەکەن." وۆڵف یەکێك لە هاوڕێیانی دکتۆر ئاینهۆرن و ژمارەیەکی دیکە لە پسپۆڕانی ئانکۆلۆژی سەنتەری پزیشکی زانکۆی ئیندیانا بوو. جیا لەمە، ئەو دوو سەنتەری شێرپەنجەی دیکەشی بۆ پێشنیار کردم کە یەکیان لە هۆستۆن و ئەوی دیکەیان لە نیۆیۆرك بوو. هەروەها، پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە چەند راوێژێکم بۆ رێك بخات. منیش قبوڵم کرد.

جارێکی دیکە، دایکم هاتە نێو کارەکەوە. بەیانی رۆژی دواتر، ئەو هەموو بەڵگەنامە پزیشکییەکانی منی کۆ کردبۆوە و ئەوانی بۆ راوێژکردن فاکس کرد بۆ هۆستۆن و ئیندیانا پۆلیس. نزیك کاتژمێر ١٠ی بەیانی بوو کە لە لایەن سەنتەری هۆستۆنەوە پەیوەندیمان پێوەکرا. من بۆ پاسکیلسواری چووبوومە دەرەوە. دوو پزیشکی پسپۆری ئانکۆلۆژی لە پشت هێڵی تەلەفۆنەوە بوون. دایکم گوێی بۆ ئەو دوو دەنگە نەناسە گرتبوو.

یەکێك لەوان وتی: "ئێمە چاومان لە بەڵگەکان کرد. بۆچی ئێوە (MRI)تان لە مێشکی ئەو هەڵنەگرتۆتەوە؟"

دایکم پرسیاری کرد: "بۆچی دەبێ (MRI) لە مێشکی ئەو بگرین؟"

"ئەنجامی پشکنینەکان زۆر لەسەرەوەن و ئێمە وا مەزندە دەکەین کە مێشکیشی تووش بووبێت."

دایکم وتی: "گاڵتە دەکەن.."

"له بنەڕەتدا ژمارە گەلی لەم ئاستەدا، پیشاندەری تووشبوونی مێشکن. بە بۆچوونی ئێمە، کوڕەکەت پێویستی بە چارەسەری جدیترە."

دایکم شۆك بوو بوو، "بەڵام چارەسەری کیمیایی لانس تازە دەستی پێکردووە."

یەکێك لەوان وتی: "ئاگاداربە، بەمشێوەیە، هیچ ئەنجامێك بەدەست نایات."

دایکم وتی: "تکایە ئەم کارە مەکەن. من هەموو تەمەنم لەپێناو ئەم کوڕەمدا جەنگاوم."

"بە بۆچوونی ئێمە، ئێوە هەرچی زووترە سەردانی سەنتەرەکەمان بکەن تا ئێمە دەست بە چارەسەری بکەین."

"کەمێکی دیکە لانس دێتەوە. من قسەی لەگەڵدا دەکەم و ئەنجامەکەیتان پێ دەڵێمەوە."

دوای چەند خولەك، من گەیشتمەوە ماڵ و دایکم وتی: "کوڕم، کارم پێتە." نیگەرانی بە روخسارییەوە شەپۆلی دەدا و منیش دڵم باشی نەدەووت. دایکم بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، ئەوەی بیستبووی، بەکورتی بۆی باس کردم. من هیچ وەڵامم نەدایەوە.. بە ئارامی لەسەر جێی خۆم دانیشتم. وەك بڵێی تا مەسەلەکە ئاڵۆزتر و دژوارتر دەبوو، من بێدەنگتر دەبووم. دوای چەند خولەکێك، وتم، دەمەوێ خۆم لەگەڵ ئەواندا بدوێم و بابەتەکە لە زمانی ئەوانەوە ببیستم.

پێوەندیم بەوانەوە کرد و ئەوانیش تێکڕای ئەو شتانەی بە دایکمیان وتبوو، بۆ منیان دووبارە کردەوە. لە وەڵامی ئەواندا وتم، دەمەوێ سەردانی سەنتەرەکەتان بکەم و بە زووترین کات پشکنینم بۆ بکرێت. پاش ئەوەی تەلەفۆنەکەم داخستەوە، پەیوەندیم بە دکتۆر "یومان"ەوە کرد و ئەنجامی گفتوگۆکەم لەگەڵ پزیشکانی هۆستون بەو ڕاگەیاند: "دکتۆر یومان، ئەوان وای بۆ دەچن کە نەخۆشییەکە مێشکمیشی گرتۆتەوە. دەڵێن، پێویست (MRI) لە مێشکم بگرن."

دکتۆر یومان وتی: "بەڕاستی منیش دەمەویست سبەی نیوەڕۆ بتبینم. خۆشم دەمەویست (MRI)ت بۆ بکەم، وای بۆ دەچم شێرپەنجە دزەی کردبێتە مێشکتەوە."

پاشان پەیوەندیم بە "ستێڤن وۆڵف"ەوە کرد، بابەتەکەم بۆ باس کرد و پێموت، سبەینێ دەچم بۆ هۆستۆن. ناوبراو بڕیارەکەمی پێ باش بوو، بەڵام دیسان وتی کە پەیوەندی بە پسپۆڕانی زانکۆی "ئیندیانا"وە بکەم، چونکە ئەوێ بە سەنتەری سەرەکی چارەسەری شێرپەنجە دادەندرا. تێکڕای پزیشکەکان لەسەر بنەمای پرۆتۆکۆلە پەسندکراوەکانی ئاینهۆرن، کاریان بۆ چارەسەری من دەکرد، ئەی چ هۆکارێك هەبوو کە من ڕاستەوخۆ بچم بۆ ئەوێ؟ ستێڤن پێی وتم، ئاینهۆرن خۆی ئێستا لە ئوسترالیایە و هەر لەبەر ئەمەش منی ناردە لای دکتۆر کرایگ نیکۆلس (DR. Craig Nichols) کە یاریدەدەری ئەو بوو. بە پێشنیارەکەی ئەو ڕازی بووم و ئەو بۆ ڕاوێژ کردن سەبارەت بە من پەیوەندی بە

"نیکۆلس"ەوە کرد.

بەیانی ڕۆژی دواتر بۆ ئەنجامدانی (MRI) چووم بۆ نەخۆشخانە. دایکم و لیزا و بیل ستاپیڵتۆن لەگەڵم هاتن. تازە دایە گەورەشم لە "دالاس"ەوە هاتبوو. هەر کە چاوم بە دکتۆر یومان کەوت، بە دڵنیاییەکی زۆرەوە وتم: "من دڵنیام کە مێشکیشمی گرتۆتەوە.. خۆم دەزانم چ هەواڵێکتان بۆ من پێیە."

بۆ ئەنجامدانی (MRI)، دەبێ بە تونێلێکی تەسك و تاریکدا تێپەڕ ببیت. تونێلەکە هێندە تەسکە تەنانەت لووت و تەوێڵیشی لێدەخشێ، لەبنەڕەتدا کەسەکە تووشی حاڵەتێکی وەك خنکان دەبێت. من لەم کارە بێزار بووم.

هەر خێرا ئەنجامەکانی سکانەکە ئامادە بوو. دایکم و نەنکم لەگەڵ بیل، لە هۆڵی پێشوازی چاوەڕوان مانەوە، بەڵام من و لیزا چووینە لای پزیشك. من بە توندی دەستی لیزام گرتبوو. پزیشك سەیرێکی سکانەکەی کرد و وتی: "دوو پەڵە لە مێشکتدا دەبیندرێت."

لیزا چاوەکانی نوقاند. بەڵام من خۆم بۆ بیستنی ئەم هەواڵە ئامادە کردبوو. دایکم لە هۆڵی پێشوازی چاوەڕوانی ئێمە بوو. ئەویش وەك لیزا، ئامادەیی بیستنی ئەم هەواڵەی نەبوو. لە نۆرینگە هاتینەدەر و من بە رستەیەك وتم: "پێویستە بچین بۆ هۆستۆن." وتنی ئەم قسەیە بەس بوو تا ئەو تێبگات کە چ باسە.

دکتۆر یومان وتی: "بیرێکی زۆر باشە، بۆچی تۆ راوێژ لەگەڵ

پزیشکەکانی هۆسترن ناکەیت." پێش ئەمە، دەمزانی کە ئەو پزیشکێکی شیاوە، بەڵام ستایشی ئەم خاکەڕایی(خۆ بەکەمگرتنە)ی ئەوم کرد. هەڵبەت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەو پزیشکی خێزانی من بوو، زۆرجاران بۆ ئەنجامدانی پشکنینەکانی خوێن و پشکنینەکانی دیکە سەردانی ئەوم دەکرد. بەڵام بەهۆی رۆحی بڵند و حەزی ئەو بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ پزیشکەکانی دیکەدا، لەو کاتە بەدواوە لەگەڵ ئەودا بووم بە دۆست و هاوڕێ.

لیزا و دایکم نەیاندەتوانی پێش بە گریانی خۆیان بگرن، هەردووکیان لە هۆڵی پێشوازی دانیشتبوون و فرمێسك بە چاوەکانیاندا چۆڕاوگەی بەستبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە هەفتەیەکی سەیر و پڕ کارمان بەڕێ کرد. چوار شەممە دەرکەوت کە من تووشی شێرپەنجە بووم، پێنج شەممە نەشتەرگەرییان بۆ کردم، دوای نیوەڕۆی هەینی لە نەخۆشخانە هاتمە دەر، شەممە چووم بۆ بانکی سپێرم، بەیانی دوو شەممە، هەواڵی نەخۆشییەکەم بە میدیاکان راگەیاند، دوانیوەڕۆی دوو شەممە چارەسەری کیمیاییەکەم دەستی پێکرد.. و ئەمڕۆش دەرکەوت کە شێرپەنجە گەیشتۆتە مێشکم! ئەم رکابەرە، زۆر لەوە کەلەڕەقتر بوو کە تەسەورم دەکرد. بەدرێژایی ئەم ماوەیە، هیچ هەواڵێکی باشم پێنەگەیشتبوو: سەرەتا وتیان، شێرپەنجە گەیشتۆتە سییەکانم، پاشان دەرکەوت لە قۆناغی سێیەمدام، پاشان نامەیان نارد کە بیمەی تەندروستیم نییە و ئێستاش...!

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. دایکم رۆشتە گیان ئامێری فاکسکە تا بەڵگەی زیاتر بۆ پزیشکەکانی هۆسترن بنێرێت. لیزاش وڕوکاس لە ژووری دانیشتن دانیشتبوو.

تەلەفۆنم بۆ بارت کرد تا ئەو لە بەرنامەکانم ئاگادار بکەم. بارت لێی پرسیم: "ئایا پێویست دەکا لەگەڵت بێم؟" من داوام لێکرد ئەو چاکەیەمان لەگەڵ بکات. کاتژمێر ٦ی بەیانی ڕۆژی دواتر، بەڕێکەوتین.

نازانم باوەڕ دەکەن یان نا، بەڵام ئیدی بە بیستنی ئەم هەواڵە ناخۆشانە، ئاسوودەییەکی تایبەت رووی تێکردبووم. چونکە دەمزانی لەمە خراپتر نابێت! ئیدی هیچ پزیشکێك نەیدەتوانی هەواڵێك لەوە ناخۆشترم پێبدات. ئێستا ئیدی رووبەڕووی خراپترین حاڵەت بووبوومەوە.

هەر جارێك کە پزیشکەکان هەواڵێکی نوێیان سەبارەت بە پەرەسەندنی نەخۆشییەکەم بە من رادەگەیاند، بەردەوام پرسیارم لێدەکردن: "ئێستا شانسی چاکبوونەوەی من چەندە؟" حەزم دەکرد بە ژمارە قسەم لەگەڵدا بکەن، ئەم رادەیەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەم دەبۆوە. لە هەوەڵەوە دکتۆر ریزن، شانسی چاکبوونەوەی منی ٥٠٪ پێشبینی کرد، بەڵام چەند ڕۆژ دواتر وتی: "پێموایە نزیکەی ٢٠٪ شانست هەبێت." ئەو دواتر پێی وتم، ئەگەر بمویستبایە لەگەڵت راستگۆ بومایە، دەبوو بڵێم بەداخم چیتر هیچ شتێکم بۆ تۆ لەدەست نایەت، بەڵام چی بکەم کە تۆ کوڕە ٢٥ ساڵەکەمم بیر دەخەیتەوە.. تەنانەت بارتیش راستیی پێنەوتبووم، خەزووری بارت پزیشك بوو، کاتێك کە زانیبووی شێرپەنجە گەیشتۆتە سییەکانم، وتبووی: "بەدڵنیاییەوە نامێنێت."

"شانسی چاکبوونەوەم چەندە؟" ئەمە پرسیارێك بوو کە بەردەوام لە پزیشکەکانم دەپرسی. بەڵام بەڕواڵەت پرسیارێکی نابەجێ بوو. هەرگیز ناتوانرێ مەزندەی ئەوە بکرێ کە شانسی زیندوو مانەوەی کەسێك چەندە، هەر لە بنەڕەتیشدا هەوڵدان بۆ ئەم کارە بێسوودە، چونکە ژمارە بەدەستهاتووەکان، وەك پێویست ورد نین و تەنیا دەبنە هۆی ئەوەی کە

نەخۆش، هیوای لەدەست بدات، هیوایەك كە تاكە دژە ژەهری ترسە.

پرسیار گەلێكی وەك بۆچی من؟! ئەگەری چارەسەری من چەندە؟ وەڵامێكی روونیان نەبوو، هەندێك جاریش هەستم دەكرد ئەوان كەسانێكی خۆپەسندن. بەدرێژایی ژیانم لەگەڵ دوو وشەی بردنەوە و دۆڕاندا بەڕەڕوو بووم، بەڵام شێرپەنجە فێری كردم كە لە هەمبەر پرسە ناڕوونەكاندا، دانبەخۆداگر بم.. بەرەبەرە تێگەیشتم كە نەخۆشی، جیاوازی نێوان ژمارەكان نازانێت: هەندێكجار كەسێكی بەهێز لەنێو دەبات كە روانگەیەكی دەرئاسای هەیە و هەندێك جاریش بەشێوەیەكی پەرجووئاسا، كەسانی لاواز بۆ ژیان دەگێڕێتەوە. هەمیشە پێموابوو كە سەركەوتن لە پێشبڕكێكانی پاسكیلسواریدا، هێز و نرخم پێدەبەخشێت. بەڵام بەمجۆرە نەبوو.

بۆچی من؟ بۆچی كەسێكی دیكە نەبوو؟! بەڵام من هیچ جیاوازییەكم لەگەڵ ئەو نەخۆشەدا نەبوو كە لە سەنتەری چارەسەری كیمیایی، لە تەنیشتم دانیشتبوو. كەواتە ئەم پرسیارە، پرسیارێكی بێ بەها بوو.

كام یەك لەم دووانە بەهێزترن: ترس یان هیوا؟ پرسیارێكی سەرنجڕاكێشە و تەنانەت رەنگە پرسیارێكی چارەنووسساز بێت. لە هەوەڵەوە زۆر دەترسام و هیچ هیوایەكم نەبوو، بەڵام كاتێك لەوێ دانیشتم و بیرم لە نەخۆشییەكەم كردەوە، بە خۆم وت، نابێ بێڵم ترس، گەشبینی من تێكبدات. شتێك پێی دەوتم، ترس نابێ بەتەواوی بە سەر دەروونمدا زاڵ ببێ و من بڕیارم دا نەترسم. حەزم دەكرد بژیم، بەڵام ژیان و مردنی من وەك مەتەڵێكی بێ وەڵام بوو. بەرەبەرە هەستم كرد، چاوەڕوانی كێشان بۆ هەڵێنانی ئەم مەتەڵە ترسناكە، هێندەش خراپ نییە. ترس شتێكی بەنرخە. كاتێك ترس و تۆقان، بەواتا راستەقینەكەی خۆی، هەموو بوونت دادەگرێ، لە زۆربەی خەڵك زیاتر، پەی بە

خاڵە لاوازەکانی خۆت دەبەی و بە بڕوای من، ئەم ترسە، بنیاتنەرە. من لەو پێگە بەرزەوە کە خۆمم تیادا دەبینی، دابەزیبووم و جیا لە فەلسەفە لێدان هیچ پەنایەکی دیکەم نەبوو: ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە رابردوو زیاتر، پرسیار لە خۆم بکەم و بنەما گەلی ئەخلاقی دیکە هەڵبژێرم.

چەند رۆژ پێشتر، نامەیەکم لە لایەن کەسێکی سەربازییەوە پێگەیشتبوو. ئەو خەڵکی ئاسیا و وەك من تووشی شێرپەنجە بوو بوو. لە نامەکەدا بۆی نووسیبووم: "ئێستا لەم قسەی من تێناگەی، بەڵام ئێمە کەسانێکی بەختین.."

کە نامەکەم خوێندەوە، بە دەنگێکی بەرز وتم: "مرۆڤێکی سەیر و گەمژەیە!" مەبەستی لەم قسەیە چییە؟!

میوانێکی ناوەخت هاتبووە سەری منەوە، کاتێکیش کە شتێك ڕاستەوخۆ بچێتە سەری کەسێکەوە، واتە زۆر لەو نزیك بۆتەوە.. بۆیە منیش بڕیارمدا لێی نزیك ببمەوە و گفتوگۆیەکی لەگەڵ دامەزرێنم. هەوڵم دا لەم گفتوگۆیەدا، هیچ چەشنە نەرم و نیانییەك نەنوێنم. بەوم وت: "کەسێکی گونجاوت هەڵنەبژاردووە.. کاتێك بە شوێن کەسێکدا دەگەڕای تا لە لەشی ئەودا درێژە بە ژیانت بدەی، هەڵەت کرد کە منت هەڵبژارد."

بەڵام کاتێك کە ئەم وشانە لە دەمم دەهاتنە دەرەوە، خۆشم دەمزانی کە خەریکی توڕەهات وتنم. بەیانی ئەو ڕۆژە، وێنەیەك کە لە ئاوێنەدا چاوی لە من بڕیبوو، ڕەنگ هەڵبزڕکاو و لاواز دیاربوو. لە ناخمدا، دەنگێکی نامۆ دەنگی دەدایەوە: دوو دڵی.

هەوڵم دەدا لەگەڵ ئەودا ڕێکەوم. بەوم دەووت، ئەگەر بابەتەکە ئەوەیە کە من چیتر پاسکیلسواری نەکەم، زۆر باشە ڕازی دەبم.. گرێبەستەکەم پیشان بدە، تا خێرا واژۆی بکەم، دەتوانم کارێکی دیکە بکەم. ئەگەر بتەوێ، سەر لەنوێ دەچمەوە بۆ قوتابخانە، دەبمە کەنناس.. هەر کارێك بڵێی دەیکەم، تەنیا بهێڵە بژیم.

پێش خۆر هەڵاتن ڕێکەوتین. دایکم، چووە پشت سوکان. من و لیزاش لەسەر کورسی دواوە دانیشتین. ئەم کارە لە من نەدەوەشایەوە، چونکە من هەمیشە خۆم شۆفێریم دەکرد. بەم کارە، دیاربوو کە چەندە نیگەرانم و سترێسم هەیە. بەدرێژایی ڕێگا کەس قسەی نەکرد، هەر یەکێك لە ئێمە

نوقمی بیرکردنەوەکانی خۆی بوو. هیچ یەکێکمان، شەوی پێشوو، بە باشی نەخەوتبووین. دایکم قاچی لەسەر بەنزین داگرت.. وەك بڵێی دەیەویست زووتر لە شەڕی ڕێگا ڕزگاری ببێت. بیر و هۆشی هێندە پرش و بڵاو بوو، خەریك بوو لە سەگێك بدات.

هۆستۆن، شوێنێکی پڕ لە ترافیکە. بەڕاستی شۆفێری کردن لەوێ زۆر ناخۆشە. دواجار کاتژمێر ٩ی بەیانی بوو کە نەخۆشخانەکەمان دۆزییەوە. چووینە هۆڵی چاوەڕوانی و نزیکەی دوو کاتژمێر مەحتەل بووین. زۆر زوو گەیشتبووین. هەستم دەکرد لە ترافیکێکی دیکە گیرمان کردووە.

ئەو نەخۆشخانەیە سەر بە زانکۆیە و بە ناوەندێکی فێرکاری دادەندرێت. ڕاڕەوە گەورەکانی، پڕ لە نەخۆش، منداڵانی چاو بەفرمێسك، خێزانە نیگەرانەکان، بەرپرسانی تورە، پەرستارانی بزۆز، پزیشکان و ئینتێرنەکان بوو. گڵۆپە سپییەکانی میچەکان، ڕووناکییەکی سپییان لەخۆیان دەردەکرد، لەژێر ئەو ڕووناکییەدا، تەنانەت کەسانی ساغیش، ڕەنگ پەڕیو دەهاتنە پێش چاو. هەر وا کە لە چاوەڕوانیدا دانیشتبووین، تا دەهات زیاتر پەرێشان دەبووم. بەخێرایی لاپەڕەی گۆڤارەکانم هەڵدەدایەوە، بە قەڵەمەکەم، لە کورسییەکەم دەدا و بەردەوام بە موبایلەکەم پەیوەندیم بەم و بەوەوە دەکرد.

دواجار ئەو پزیشکەی کە قسەمان لەگەڵ کردبوو، گەیشت و ئێمە لە نزیکەوە چاومان بەیەکتر کەوت: پزیشکێکی لاو و ڕێکپۆش بوو، ڕەفتارێکی بەئەدەبانەی هەبوو. بەژنی وەك یاریزانانی گۆڕەپان و مەیدان،

بەلەباریك دەهاتە پێش چاو.

"من بە شوێن کارەکانی تۆوە بووم، زۆر خۆشحاڵم کە هاتی بۆ ئێرە."

بەڵام دوای ئەوەی کە چاکوچۆنییەکانمان تەواو بوو، حاڵەتێکی فەرمی و ساردی بەخۆیەوە گرت. هەر کە لەسەر کورسییەکانمان دانیشتین، خاڵە گشتییەکانی شێوازی چارەسەرییەکەی بۆ ئێمە روون کردەوە. بەپێی ئەو بەرنامەیە، دەبوو لە خواردنی دەرمانی "ئێلئۆمایسین" بەردەوام بم، بەڵام بەرنامەی ئەو زۆر قورستر لە بەرنامەکەی دکتۆر یومان بوو.

"تۆ بە کێشمە کێش لێرە دەچیتە دەرەوە."

بەهۆی سەرسورمانەوە چاوەکانی من و دایکم، ئەبڵەق بوون. من شۆك بووم. ئەو لە درێژەی قسەکانیدا وتی: "من هەموو ڕۆژێك تۆ دەکوژم و پاشان، دووبارە دەتگێڕمەوە بۆ ژیان. ئیدی هێزی ڕێکردنیش لەدەست دەدەیت. دوای ئەوەی کارەکانمان تەواو بوو، دەبێ دووبارە پێکەوە ڕاهێنانی ڕێگا ڕۆشتن بکەین."

لەبەر ئەوەی کە چارەسەرییەکە تووشی نەزۆکیم دەکات، کەواتە چیتر ناتوانم ببمە خاوەنی منداڵ. بێلئۆمایسین"یش سییەکان خراپ دەکات، کەواتە دەبێ ئیدی واز لە پاسکیلسواریش بهێنم.

دەبێ مەینەتییەکی زۆر تەحەمول بکەم. تا زیاتر قسەی دەکرد، زیاتر لەوەی کە لاواز ببم، بێزار دەبووم. لێم پرسی بۆچی ئەم بەرنامە چارەسەرییە، هێندە قورسە؟! لە وەڵامدا وتی: "لەبەر ئەوەی کە تۆ لە

خراپترین دۆخ دای، بەڵام بە بڕوای من، تاکە شانسی تۆ لەم نەخۆشخانەیە."

کە قسەکانی تەواو بوو، دایکم بەهۆی ئەوەی کە بە قورسی نیگەران بوو بوو، دەلەرزی، لیزاش ورووکاس بوو بوو. بارت بە بیستنی قسەکانی پزیشك، تووڕە بوو، هەر لەبەر ئەم هۆکارە هاتە نێو قسەکانەوە و سەبارەت بە ڕێگاکانی دیکەی چارەسەری چەند پرسیارێکی لەو کرد. ئەو شارەزاییەکی زۆری لە پرسیارکردن و یادداشت هەڵگرتنەوە هەیە، لەڕاستیدا پیاوێکی زۆر وردە. پزیشك قسەکانی بە بارت بڕی و رووی کردە من و وتی: "سەیرکە، تۆ شانسێکی زۆرت نییە. بەڵام من لەو باوەڕەدام کە شانسی تۆ لەم نەخۆشخانەیە، زۆر زیاترە تا ناوەند و نەخۆشخانەکانی دیکە."

لێم پرسی، بە بۆچوونی تۆ شێوازی چارەسەری دکتۆر ئاینهۆرن چۆنە. ئەم پرسیارەی منی پێخۆش نەبوو: "دەتوانی بچیت بۆ ئیندیانا، بەڵام بە ئەگەری زۆر دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم نەخۆشخانەیە. شێوازی چارەسەری ئەوان بۆ ئەم حاڵەتە پەرەسەندووەی تۆ دەوری نییە."

دواجاریش ئەنجامی قسەکانی خۆی ڕاگەیاند و وتی، رای وایە هەرچی زووترە، لەو سەنتەرە دەست بە چارەسەری کیمیایی بکەم. "ئەم سەنتەرە تاکە شوێنە کە ئەمجۆرە چارەسەرییە پێشکەش دەکات و ئەگەر قبوڵی نەکەی، ئەگەری ڕوودانی هەموو پێشهاتێك هەیە.."

وتم مۆڵەتم بدە کەمێك بیری لێبکەمەوە و دوانیوەڕۆ وەڵامت بدەمەوە.

بە ئۆتۆمبێل بە شەقامەکاندا دەخولامەوە، تا لەڤە فرۆشییەکم دۆزییەوە، بەڵام هیچ کاممان، دوای بیستنی ئەو قسانە، ئیشتیای خواردنمان نەبوو. هەستم دەکرد دەبێ هەرچی زووترە بریاری خۆم بدەم: ئەو ڕۆژە هەینی بوو، بۆچوونی پزیشك ئەوە بوو کە لە ڕۆژی دوو شەممەوە دەست بە چارەسەری کیمیایی بکەم.

تەواو بێ هیوا بوو بووم. خۆم ئەوەم دەزانی کە تووشی نەخۆشییەکی قورس بووم، بەڵام هەرگیز بەرگەی لاوازی و لەکارکەوتنم نەدەگرت.. بە وەرزییەوە، خاڵە لاواز و بەهێزەکانی قسەکانی پزیشکم هەڵسەنگاند، بۆچوونی ئەوانی دیکەشم وەرگرت. بۆچوونی ئێوە لەم بارەوە چۆنە؟ هەوڵم دەدا گیانی رکابەرایەتیخوازی و متمانە بەخۆبوونی پزیشك وەك خاڵی بەهێزی ئەو ببینم. بەڵام تەواو روون و ئاشکرا بوو کە دایکم لە قسەکانی ئەو ترسابوو.

ئەم شێوازی چارەسەرییە، زۆر قورستر لە شێوازەکانی سەنتەرە پزیشکییەکانی دیکە بوو. بە خۆم وت بەم کارە من توانای ڕێگا ڕۆشتنم نامێنێ، توانای منداڵ خستنەوەش لەدەست دەدەم.. چیتر ناتوانم پاسکیلسواریش بکەم. من زۆرجار لە کارەکانمدا، زێدەڕۆییم دەکرد: راهێنانی قورس، پاسکیلسواری رەق و توند.. بەڵام بۆ یەکەمجار بیرم کردەوە کە ئەم شێوازە چارەسەرییە، شتێکی زیاتر لە زێدەڕۆییە. رەنگە لە ئاستی پێویستی من زیاتر بێت.

بە مێشکمدا هات پەیوەندی بە دکتۆر "وۆلف"ەوە بکەم و بۆچوونی

ئەویش بزانم. تا زیاتر قسەم لەگەڵ ئەو دەکرد، زیاتر هۆگری دەبووم. دکتۆر وۆڵف، پیاوێکی ژیر و تێگەیشتوو بوو، هەرگیز ئەهلی فیز و لووتبەرزی نەبوو. پرۆتۆکۆلی چارەسەری پێشنیارکرا و بەدواداهاتەکانیم بۆ روون کردەوە: "ئەو جەخت دەکاتەوە کە هەرچی زووترە چارەسەرییەکە دەست پێبکەم و دوانیوەڕۆی ئەمڕۆش چاوەڕوانی وەڵامی منە..."

وۆڵف بێدەنگ بوو. گوێم لە دەنگی بیرکردنەوەکەی بوو. دواجار وەقسە هات و وتی: "خراپ نییە ئەگەر بۆچوونی چەند کەسێکی دیکە وەرگری. بێگومان نابێ هەر ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ، وەڵام بدەیتەوە. بە بۆچوونی من، وا باشترە لانیکەم بۆچوونی پسپۆڕانی سەنتەری ئیندیاناش وەرگری." پێشنیارێکی باش بوو. بۆچی نەچم بۆ ئەوێ و بۆچوونی پسپۆڕانێك کە لە بواری شێرپەنجەی گوندا، خاوەن کتێب بوون و ئەو پزیشکانەی دیکەش وەرنەگرم کە شێوازی ئەوانیان بەکار دەهێنا؟

پەیوەندیم بە یاریدەدەری دکتۆر ئاینهۆرن واتە "دکتۆر کریگ نیکۆلز"ەوە کرد. بارودۆخی خۆم بۆ روون کردەوە، وتم پێویستم بە راوێژی زیاترە و دەمەوێ لە زووترین کاتدا بتانبینم. لێم پرسی: "هەر ئێستا بکەوینە رێ؟"

نیکۆلز وتی، ئەوەی راست بێ چاوەڕوانی پەیوەندی من بووە. "هەر ئێستا دەتوانن بێن بۆ لام." رۆژی دوایی پشوو بوو. دواتر زانیم کە فەرمانبەرانی ئیندیانا(IU) لە هەموو دۆخێکدا ئامادەی خزمەتکردنن و

هەموو ڕۆژێك راوێژی تەلەفۆنی بە نەخۆشان و پزیشكانی سەرانسەری دنیا دەدەن.

كاتژمێر ۳ی دوانیوەڕۆ بوو، ئێمە دەبوو بەڵگەنامە پزیشكییەكانم لە سەنتەری هۆستۆن وەرگرینەوە، بەڵام كەمێك نیگەران بووم. پزیشكی ئەوێ، زۆری حەز بەوە نەبوو كە چارەسەری من لەئەستۆ بگرێ، بەڵام لە لایەكی ترەوە منی ترساندبوو. بەوم وت یەك، دوو ڕۆژێك مۆڵەتم دەوێ تا بڕیاری خۆم بدەم. ئەویش هیوای سەركەوتنی بۆ خواستم و وتی: "بەڵام زۆر دوای مەخە (مەحتەلی مەكە)..."

بەم بڕیارەی من، دایكیشم دووبارە ئامێكی بەبەردا هاتەوە و بەرپرسیارێتی كارەكانی لەئەستۆ گرت. سەرەتا پەیوەندی بە نوسینگەی "بیل ستاپێڵتۆن"ەوە كرد و بە ستاسی (Stacy) –سكرتێرەی نوسینگەكە–ی وت: "ستاسی، ئێمە پێویستە بە یەكەم فڕۆكە خۆمان بگەیەنینە ئیندیانا پۆلیس." پاشان هەموومان سوار ڤۆلڤۆكەی دایكم بووین و بەرەو فڕۆكەخانە وەڕێ كەوتین. ئوتۆمبێلەكەمان لە گەراجی فڕۆكەخانە راگرت. هیچكام لە ئێمە، جلوبەرگ و فلچەی دەم وددان شتنمان پێنەبوو، چونكە بڕیار بوو ڕۆژێكمان پێبچێت. چووینە كۆشكی بلیت فرۆشی، ستاسی چوار كورسی دەرجە یەكی بۆ گرتبووین.

كە گەیشتینە ئیندیا پۆلیس، دایكم ئوتۆمبێلێكی بەكرێ گرت. هەوای ئەوێ زۆر سارد بوو، بەڵام دایكم زانیبووی كە ڕێك بەرامبەر نەخۆشخانەكە هوتێڵێكی لێیە. چەند ژوورمان گرت و شەكەت و ماندوو، پاڵكەوتین. ئەو

ئەوەش شەوێکی کورت بوو، چونکە بەیانی زۆر زوو دەبوو چاومان بە دکتۆر نیکلۆز بکەوێت.

پێش خۆرهەڵاتن، لەخەو هەستام و لەبەردەم ئاوێنەدا خەریکی شانەکردنی قژم بووم. لەبەر ئەوەی کە دەمزانی دوای وەرگرتنی چارەسەری کیمیایی قژم دەوەرێ، سەرم تاشیبوو. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، تۆپەڵێکی گەورە بە شانەکەوە هاتبوو. کڵاوەکەم کردە سەر و چووم بۆ هۆڵی چاوەڕوانی. کافتریای هوتێلەکە، بۆ ژەمی بەیانی، دانولە و میوەی پێشکەش دەکرد، دایکیشم پێش من چوبوو بۆ ئەوێ. شوێنی کەوتم و کڵاوەکەم لەسەرم لابرد.

"دایە قژم دەوەرێ.."

دایکم هەوڵی دەدا پێبکەنێ: "باشە، خۆمان پێشتر ئەمەمان دەزانی."

بەڵگەنامە پزیشکییەکانم لە بن باخەڵم نابوو، بەو تاریکەشەوە بەرەو نەخۆشخانە کەوتنەڕێ.

سەنتەری پزیشکی (IU)، نەخۆشخانەیەکی فێرکاری بوو لە بینایەکی گەورەدا. بە ئاسانسۆر چووینە بەشی ئانکۆلۆژی و لەوێوە براین بۆ ژوورێکی کۆنفرانس کە پەنجەرەی شوشەیی گەورەی تێدابوو.

خۆر بەرەبەرە خەریك بوو هەڵدەهات و ژوورەکە پڕ بوو لە رەنگ. تیشکی درەوشاوەی خۆر لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوور و من هەستم بە ئارامی دەکرد.

لە نزیکەوە چاوم بە پزیشکە راوێژکەرەکان کەوت. کریگ نیکۆلز، پیاوێکی قورس و سەنگین دیاربوو، کورتە ریشێکیشی هەبوو. کوپێك قاوەی بەدەستەوە بوو. ماوەیەك بوو لەبەر نەخۆشییەکەم وازم لە قاوە هێنابوو، هەر بۆیە زۆرم تاسە بۆی چووبوو. لە کتێبە خۆراکییەکاندا نووسرابوو کە کافائین (Caffeine) بۆ ئەو کەسانە خراپە کە نەخۆشی وەك منیان هەیە. من هەر لەبەر ئەم هۆکارە، وازم لە خواردنەوەی قاوە هێنابوو. بەڵام چاوم بڕیبووە کوپەکەی نیکۆلز. لێم پرسی:

"بۆچونی تۆ سەبارەت بە قاوە چۆنە؟"

"ئێ، بۆ تۆ زۆر باش نییە، بەڵام ئەگەر جارناجارێك، یەك دوو کوپ بخۆیتەوە، ناتکوژێت."

لە تەنیشت "نیکۆلز"ەوە سکۆت شاپیرۆ (Scott Shapiro) وەستابوو کە نەشتەرگەری مێشك و دەمار بوو. شاپیرۆ، پیاوێکی باڵابەرز بوو، کەمێکیش پشتی کۆم بوو. بەژنوباڵای لە ئەکتەری بەناوبانگ واتە ئابێ ڤیگۆدا (Abe Vigoda) دەچوو. چاوەکانی بە قوڵا چووبوو، برۆکانی پڕ بوون. دکتۆر نیکۆلز، باروودۆخی منی بۆ ئەو باس کرد: ئەو تووشی شێرپەنجەی گون بووە و چەند لویەکیش لە مێشك و سییەکانیدا بیندراوە.

ئێمە دانیشتین و دەستمان بە گفتوگۆ کرد. نەخۆشخانەکە زۆر بێدەنگ و ئارام بوو، نیکۆلز زۆر ئارام و هێور بوو، ئەمەش هەستێکی باشی بە من دەبەخشی. هەروا کە قسەمان دەکرد، ئەوم خستبووە ژێر چاودێرییەوە،

راهاتبوو پاڵ بە دیوارەوە بدات و بەردەوام قورگی پاك بكاتەوە. بەڵام لەودیو ئەم ئارامییەوە، متمانە بەخۆبوونێکی زۆریش هەبوو. بەرەبەرە خەریکبوو خۆشم دەویست.

نیکۆلز، قورگی بۆ ساف کرد و وتی: "ئێمە هیوامان بە شانسی چاکبوونەوەی تۆ هەیە." بۆ نیکۆلزم باس کرد کە پێش ئەوەی چاوم بەوان بکەوێ، چوومە بۆ هۆستۆن. چاوەڕوانی ئەوە بووم ئەویش ئەم بابەتەی بەلاوە گرنگ نەبێ، بەڵام بەمشێوەیە نەبوو. لە وەڵامی مندا وتی: "سەنتەرێکی زۆر باشە و ئێمە چالاکییەکانی ئەوان زۆر بەرز دەنرخێنین." پاشان سەیری بەڵگەنامە پزیشکییەکانی منی کرد. تیشکە وێنەکانی منی خستە سەر شاشەیەکی ڕووناکی تایبەت و وتی، ١٢ لوو لە هەردوو لادا دەبیندرێت. قەبارەی هەندێکیان بە ئەندازەی خاڵێك دەبوو، هەندێکیشیان قەبارەیان دەگەیشتە ٢,٧ سانتی مەتر. پاشان تاویدایە ئەو (MRI)یەی بۆ مێشکم کرابوو، دوو ناوچەی ناسروشتی پیشان دام کە ڕێك لەژێر کاسە لەسەرمەوە بوو. قەبارەی ئەو دوو پەڵە سپییە بەئەندازەی بۆڵە ترێیەك بوو.

من بە وردی گوێم بۆ قسەکانی ئەو گرتبوو. نیکۆلز لە بارەی شانسی چارەسەری و شێوەی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ نەخۆشییەکەدا، قسەی بۆ دەکردم. قسەکانی سادە بوون و باش لێی تێدەگەیشتم.

"نەخۆشییەکەت لە قۆناغی پێشکەوتوودایە و ئەو زیانانەش کە بەر مێشکت کەوتوون، کێشەکە دوو هێندە دەکات.." ئەو بۆی ڕوون کردمەوە

کە زیانەکانی مێشك بە چارەسەری کیمیایی لەنێو ناچن، چونکە پێشگرە مێشکییەکان (Blood-brain Barrier) ڕێ لەوە دەگرن کە دەرمان گەلێکی وەك دەرمانە بەکارهاتووەکان لە چارەسەری کیمیایی، بچنە مێشکەوە. کەواتە چارەسەر بە تیشك (تیشك دەرمانی) یان نەشتەرگەری چارەسەری کێشەکە بوو.

وەك هەمیشە دەمەویست زانیاری وردم پێبدات، بۆیە دیسانەوە پرسیارە هەمیشەییەکەم دووبارە کردەوە: "شانسم چەندە؟"

"تۆ دەستپێکێکی باشت نەبووە.." لەڕاستیدا مەبەستی نیکۆلز، ئەمە بوو کە لەکاتی خۆیدا نەخۆشییەکەم دەستنیشان نەکراوە. "ڕێژەکەی زۆر باش نییە. بەڵام ئەم نەخۆشییە چارەسەری هەیە. من پێموایە شانسی تۆ پەنجا بە پەنجایە." نیکۆلز پیاوێکی ماقوڵ و واقیعبین بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤێکی گەشبینیش بوو.

"لە ئێستادا، بەهۆی بەکارهێنانی پلاتین، دەکرێ هیوامان بە چارەسەری شێرپەنجەی گون هەبێ، زۆر کەس لە دۆخێکی خراپتر لە دۆخی تۆدا بوون و ڕزگاریشیان بووە. ئێمە لەم نەخۆشخانەیەدا، هەموو جۆرە نەخۆشییەك دەبینین و هەرچەند دۆخی تۆ هێندە هیوابەخش نییە، بەڵام حاڵەتی لە تۆش خراپترمان چارەسەر کردووە."

پاشان نیکۆلز قسەیەکی کرد کە لەجێی خۆم وشك بووم: ئەو وتی دەیەوێ بەرنامەی چارەسەرییەکەم بەشێوەیەك ڕێك بخات کە دووبارە بتوانم دەست بە پاسکیلسواری بکەمەوە. جیا لە ستیڤ وۆڵف، هیچ

پزیشکێکی دیکە ئەم شتەی بە من نەوتبوو. هێندە بەم قسەیە شۆك بوو بووم، سەرەتا بڕوام نەکرد. مەسەلەی چوون بۆ هۆستۆن و ئەو چارەسەرییە قورسە، بەتەواوی بێ هیوای کردبووم. لە وەڵامدا وتم، من ئێستا تەنیا بیر لە زیندوو مانەوە دەکەمەوە. "تەنیا یارمەتیم بدە زیندوو بمێنمەوە.."

بەڵام نیکۆلز پێیوابوو نەك هەر زیندوو دەمێنمەوە، بەڵکو ئەگەری ئەوە هەیە کە بتوانم درێژە بە پاسکیلسوارییەکەشم بدەم. لەڕاستیدا، ئەو دەیەویست شێوازی چارەسەرییەکەم بەشێوەیەك ڕێك بخات کە زیان بە سییەکانم نەگات. یەکێکی دیکە لە شێوازەکانی چارەسەری کیمیایی بە پلاتین، VIPی[٧] پێدەوترێت –کە لە راستیدا تێکەڵەیەکە لە دەرمانەکانی ڤین بلاستین، ئیفۆسفامید، سیس پلاتین و ئاتۆپۆساید–. بەکارهێنانی کورت ماوەی ئەم دەرمانانە، کێشە گەلێك بۆ نەخۆش دروست دەکات، بەڵام لەبەرامبەردا، وەك بیلئۆمایسین زیان بە سییەکان ناگەیەنێت. بەکارهێنانی ئیفۆسفامید، دەبێتە هۆی دروستبوونی حاڵەتی هێڵنجدان، رشانەوە و هەندێ کێشەی کروت ماوەی دیکە. بەپێی قسەکانی پزیشك، ئەگەر سێ دەورەی (VIP)م ئەنجام بدایە، لە بەڵای شێرپەنجە رزگارم دەبوو، هەروەها دەمتوانی سەر لەنوێ لە پێشبڕکێکاندا بەشداری بکەم.

دایکم پرسی: "واتە لەباتی چارەسەرێك کە بۆ هەموو نەخۆشەکان بەکار دەهێنرێ، ئێمە دەبێ ئەم چارەسەرییە ئەنجام بدەین؟ واتە هەر

---

[٧] - VIP: Vinblastine, Ifofamide, CisPlatin, Etoposid

لەبنەڕەتدا بێلئۆمایسین بەکار نەهێنین؟"

نیکۆلز وەڵامی دایەوە: "ئێمە نامانەوێ زیان بە سییەکانی بگات."

ئەو درێژەی بە قسەکانی دا و وتی، من پێشنیار دەکەم بە نەشتەرگەری، لووەکان لە مێشکت دەرهێنیت. بۆ نەهێشتنی لووەکانی مێشك زیاتر چارەسەر بە تیشك بەکار دەهێنن، بەڵام چارەسەر بە تیشك، کۆمەڵێك کاریگەری لاوەکی لەسەر کۆئەندامی دەماری ناوەندی جێدەهێڵێ، تەنانەت هەندێك لە نەخۆشەکان لە تێگەیشتن و درك کردنی هەندێ بابەتدا تووشی گرفت دەبن. "کاردانەوەی نەخۆشەکان لە هەمبەر چارەسەر بە تیشکدا، جیاوازە." هیچ کێشەیەك بۆ کەسێکی ئاسایی دروست نەدەکرد، بەڵام سەبارەت بە من، دەبووە هۆی ئەوەی کە چیتر نەتوانم لە بەرزاییەکانی "ئالپ"ەوە بە پاسکیل بێمەخوار، چونکە لەم حاڵەتانەدا هاوسەنگی ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە.

شاپیرۆ درێژەی بە باسەکە دا. من ئەوم هەڵدەسەنگاند: جیا لەو وێکچوونەی لەگەڵ ڤیگۆردا هەیبوو، جلوبەرگ پۆشینەکەشی کەمێك سەیر بوو: تراکسودێکی ئادیداسی لەبەردابوو کە سەرتاپای واژۆ بوو، بەسەر ئەوەوە بەرگە سپییەکەی پۆشیبوو. قژی بە سەر یەخەی جلەکانیدا هاتبوونەخوار. ئەم پیاوە نەشتەرگەری مێشکە؟! ڕواڵەتی هیچ لە پزیشك نەدەچوو.

"باشە، وەرن با سەیرێکی (MRI) و سی تی سکانەکە بکەین."

نیکۆلز، تیشکە وێنەکانی دا بەو. شاپیرۆش ئەوانی لەسەر شاشەیەکی

تایبەت دانا و لە کاتێکدا کە سەیری دەکرد، سەری رادەوەشاند.

"کێشەیەکی نییە.. بەئاسانی دەری دەهێنم."

وتم: "هیچ کێشەی نییە؟"

شاپیرۆ ئاماژەی بە لووەکان کرد و وتی، لووەکان لە رووکاری مێشکدان و بە سوود وەرگرتن لە تەکنیکی ستریۆتاکتیك فێریم لێس (Framelees Stereotactics)، بە ئاسانی دەتوانین سەرکەوتوو بین. لەڕاستیدا بە سوود وەرگرتن لەم شێوازە، دەکرێ رێك شوێنی لووەکان دەستنیشان بکەین و تەنیا درزێکی بچووك دروست دەبێت.

"بەم شێوازە، پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە، بەشە خراپبووەکان جیا دەکەینەوە و بەمجۆرە لەچاو رابوردوودا، تەنیا یەك لەسەر چواری کاتەکە بۆ بەشی کاسە لەسەر تەرخان دەکەین."

پرسیم: "مەترسییەکانی ئەم شێوازە چییە؟"

"سەبارەت بە کەسانی لاوی وەك تۆ، لانی کەمی گرفتەکانی بەنجمان تووش دەبێت. مەترسی هەوکردن یان خوێنبەربوونیش هێندە زۆر نییە، ئەگەری روودانی سەکتەش زۆر کەمە. بەڵام گەورەترین مەترسی کە هەڕەشەیە بۆ کەسەکە، ئەمەیە کە رەنگە لایەکی لەشی لاواز ببێت. بەگشتی نەشتەرگەرییەکی سادەیە و تۆش توانای جەستەیی پێویستت بۆ ئەم کارە هەیە."

من زۆر ماندوو بووم، لە لایەکیشەوە باوەڕم بە قسەکانیان نەبوو. هەر

بۆیە راشکاوانە وتم: "پێویستە بە قەناعەتم بگەیەنن کە بە سەر کارەکەتاندا زاڵن.

شاپیرۆ وتی: "سەیرکە، من نەشتەرگەری لەم جۆرەم زۆر کردووە و تا ئێستا هیچ کام لە نەخۆشەکانم نەمردوون یان لانی کەم لە پێشوویان خراپتر نەبوون."

"راستە، بەڵام بۆ دەبێ تۆ نەشتەرگەری بۆ من بکەیت؟"

"چونکە هەر بەو رادەیەی کە تۆ لە پاسکیلسواریدا شارەزاییت هەیە، من زۆر لەوە زیاتر، لە نەشتەرگەری مێشکدا شارەزام."

پێکەنینم بە وەڵامەکەی ئەو هات، خۆشیم لێیهاتبوو. لەجێی خۆم هەستام و وتم، لەکاتی نانی نیوەڕۆدا بیر لەم بابەتە دەکەمەوە و بڕیاری کۆتایی دەدەم.

پێش هەموان، حەزم دەکرد راوێژ لەگەڵ دایکم و هاوڕێکانم بکەم. ئەمجۆرە بڕیاردانانە، کێشە خولقێنن. دەبوو نەخۆشخانە و پزیشکەکانم هەڵبژاردبایە. ئەم هەڵبژاردنە، وەك هەڵبژاردنی کۆمپانیای سەرمایەگوزاری نییە. ئەکەر بمویستبایە لە کۆمپانیایەکدا سەرمایەگوزاری بکەم، دەمتوانی لێیان بپرسم کە بڕی قازانجی من دوای پێنج ساڵ چەندە؟ بەڵام ئێستا دۆخەکە تەواو جیاواز بوو.. لێرەدا باسی مەرگ و ژیان بوو.

لەو بەر شەقامەکەوە بازاڕێکی لێبوو. چووین بۆ کافتریایەك. هەموومان بێدەنگ بووین. دایکم، لیزا و بارت نیگەرانی ئەوە بوون کە قسەکانیان

کار لە بڕیارەکەی من بکات. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون کە من خۆم دەبێ نەخۆشخانەکەم هەڵبژێرم. من بۆچوونی ئەوانم پرسی، بەڵام نەمدەتوانی ئەوان ناچار بەم کارە بکەم.

هەروا هەوڵم دەدا کە ئەوان وەقسە بێنم: "باشە، لە هۆستۆن وتیان کە شانسێکی باشم هەیە و چاك دەبمەوە، بەڵام لێرە دەیانەوێ شێوازی چارەسەریەکەم بگۆڕن، رەنگە بڕیارێکی بەجێش بێت.." کەس قسەیەکی نەکرد. ئەوان تەواو بێلایەن بوون. هەموویان چاوەڕوانی وەڵام بوون، بەڵام دەبوو خۆم ئەم بڕیارە بدەم.

لەکاتی خواردنی نانی نیوەڕۆدا، بیرم لەم بابەتەش دەکردەوە، دەمەویست لەوە دڵنیا بم کە هەڵسەنگاندنێکی راست و دروستم بۆ پزیشکەکان و بەرنامە چارەسەرییەکانی ئەوان کردووە. من ئیدی ئەوەم قبوڵ کردبوو کە دەبێ واز لە پاسکیلسواری بهێنم، بەڵام دکتۆر شاپیر و دکتۆر نیکۆڵز، بۆچوونێکی دیکەیان هەبوو. ئەوان متمانەی منیان بەدەستهێنابوو، خۆشیم لە ئارامی و خاکەڕایی ئەوان دەهات، لەوەی کە قسەکانی من، ئەوانی تووڕە و نیگەران نەکردبوو، هەستێکی باشم هەبوو. رواڵەت و ناخی ئەوان یەك شت بوو: دوو پیاوی بەساڵاچووی ماندوو، لە هەمان کاتدا شارەزا و کارزان. لای خۆم بەو ئەنجامە گەیشتم کە کەسێکی لەوان باشترم دەست ناکەوێت.

من پرسیار گەلێکی ناجۆرم لەوان کرد، بەڵام نیکۆڵز، بە مێشکێکی ئارام و راشکاوانە وەڵامی دامەوە و هیچ دڵگران نەبوو. ئەو تەواو بە سەر

کارەکەیدا زاڵ بوو، متمانەشی بە تواناکانی خۆی هەبوو.

لەپڕ بێ پێشەکی وتم: "زۆر باشە، وادیارە ئەمانە لە کارەکەیان شارەزان. منیش زۆر خۆشیم لێیان هاتبوو.. شوێنەکەشم بەدڵ بوو، دکتۆر شاپیرۆشم بەدڵ بوو کە سەبارەت بە نەشتەرگەرییەکە هیچ نیگەران نەبوو. کەواتە پێموابێ وا باشترە هەر لێرە بمێنمەوە."

هەموویان خۆشحاڵ بوون. بارت وتی: "من تەواو رازیم."

داکیم وتی: "پێموایە بڕیارێکی راستت داوە."

دووبارە چووین بۆ سەنتەری پزیشکی (IU) و چاومان بە دکتۆر نیکۆلز کەوت. بە دکتۆرمان وت، ئەم نەخۆشخانەیە بۆ چارەسەرکرن هەڵدەبژێرین.

دکتۆر نیکۆلز وتی: "باشە، کەواتە پێویستە رۆژی دوو شەممە بێی بۆ ئەنجامدانی هەندێك کاری سەرەتایی و رۆژی سێ شەممەش نەشتەرگەرییەکەت بۆ ئەنجام دەدین." نیکۆلز لە درێژەی قسەکانیدا خێرا وتی، دوای نەشتەرگەرییەکە، دەست بە گەڕێکی نوێی چارەسەری کیمیایی دەکەین. پاشان منیان بە سەرپەرشتی بەشی ئانکۆلۆژی، واتە لاتریس هانی (Latrice Haney) ناساند و سەبارەت بە بەرنامەی چارەسەرییەکە پێکەوە گفتوگۆمان کرد.

من وتم: "ئێوە خۆ ناتوانن من بکوژن، کەواتە هەرچیتان پێیە، بیدەن بە من. چەندە دەدەن بە نەخۆشەکانی دیکە، دوو هێندە ئەو بدەن بە

من. وەرن با ئەم بەلایە لەنێو بەرین."

نیکۆلز و لاتریس، هەوڵیان دەدا من لەم هەڵەیە رزگار بکەن. نیکۆلز وتی: "دڵنیا بە من دەتوانم تۆ بکوژم، کارێکی دژوار نییە."من لەبەر ئەو راوێژەی لە هۆستۆن کردم، ئەم بیرکردنەوە هەڵەیەم لا دروست بوو بوو. لە حاڵێکدا کە راستییەکەی ئەوە بوو کە دەرمانەکانی چارەسەری کیمیایی، ژەهراوین و زۆر بەکارهێنانیان، دەبووە هۆی لەدەستدانی ئەندامەکانی لەش. تەنانەت نیکۆلز، دەیەویست چارەسەرییەکەی من هەفتەیەك دوا بخات، چونکە ژمارەی خڕۆکە سپییەکانی خوێنم، بەهۆی وەرگرتنی یەکەم چارەسەری کیمیایی، هێشتا نەگەیشتبۆوە ئاستی پێویست.

کاتێك خولی نوێی چارەسەری کیمیایی دەستی پێدەکرد کە من لە رووی جەستەییەوە ئامادەیی پێویستم هەبایە.

سەرپەرشتیار سەری قسەی گرتە دەست. وادیاربوو کە شارەزایی پێویستی هەیە، ئەو بەڕادەی پزیشکەکە زانیاری لەسەر چارەسەری کیمیایی هەبوو، هەروەها لەبارەی یەك بە یەکی ئەو دەرمانانەی لەم شێوازە چارەسەرییەدا بەکاردەهێنران، قسەی بۆ کردم. کاریگەرییەکانی هەر دەرمانێك و هەروەها میکانیزمی ئەوانی بۆ روون کردمەوە. زۆر وردی گوێم بۆ قسەکانی دەگرت. بڕیارم دابوو رۆڵێکی چالاکم لە چارەسەری نەخۆشییەکەمدا هەبێت. دایکم هەر نیگەران بوو، لە پەرستارەکەی پرسی:

"بارودۆخی چەند تێکدەچێت؟"

"بێگومان تووشی هێڵنجدان و رشانەوە دەبیٚ، بەڵام بەم دواییانە دەرمان گەلێك کەوتۆتە بازارەوە کە رادەی رشانەوە بۆ کەمترین ئاست دادەبەزێنن، یان تەنانەت بەتەواوی دەیوەستێنن."

لاتریس وتی، هەر دڵۆپە دەرمانێك کە دەچێتە لەشەوە، بەوردی حسێب دەکرێت و ئەو شتانەش کە لە لەش دەرەهێندرێن، لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت.

قسەکانی هێندە پوخت و تەواو بوون کە جێی هیچ پرسیارێکی نەهێشتەوە. دایکیشم کەمێك ئارام بوو بۆوە. لاتریس، هەموو شتە پێویستەکانی روون کردبۆوە. یەك هەفتە دواتر، گەڕاینەوە بۆ ئیندیانا پۆلیس. دایکم هەموو بەڵگەنامەکانی لە جانتاکەی نابوو، هەموو دەرمان و ڤیتامینەکانیشی کردبووە نێو بەستەیەکی گەورەوە. تا ئەو رۆژە، نزیکەی سێ هەفتە بوو کە دایکم سەرقاڵی کارەکانی من بوو، تەنانەت پولیۆریشی پێنەبوو! هەوای ئیندیانا پۆلیس سارد بوو، هەر بۆیە بەتانییەکی لە نووسینگە فڕۆکەوانی بە ئەمانەت وەرگرت تا خۆی پێ گەرم بکاتەوە.

کە گەیشتینە نەخۆشخانە، قۆناغە قورسەکانی داخڵکردن لەوێ دەستی پێکرد، دایکم بەردەوام بۆ دۆزینەوەی بەڵگەنامەکانی من، سەروبنی جانتاکەی دەگەڕا. بەرپرسی ناو تۆمار کردنەکە، هەموو زانیارییە پێویستەکانی تۆمار کرد و پاشان چەند پرسیارێکی کرد.

"حەزت لە چ جۆرە خواردنێکە؟"

وەلامم دایەوە: "شیرینەمەنی کە نابێ بیخۆم. گۆشتی مەڕیش بۆ من باش نییە. نابێ ئەو خواردنانەش بخۆم کە پەنیریان تێدابێ.. بەلام گۆشتی مریشکی خۆماڵی بۆ من باشە."

چەند ساتێك، چاوی بڕیبووە من و پاشان پرسی: "ئەی کەواتە دەتوانی چی بخۆیت؟"

بۆ ساتێك بیرم کەوتەوە کە ئێرە نەخۆشخانەیە و ڕێستورانت نییە. بەلام دایکم زۆر پێی تێکچووبوو. لەپڕ لەجێی خۆی هەستا و وتی: "ئێمە خەریکین خۆمان بۆ نەشتەرگەری مێشك بۆ سبەینێ ئامادە دەکەین، تکایە دووبارە نەبێتەوە.. پسپۆڕی خۆراك چەند خۆراکێکی تایبەتی پێ پێشنیار کردین، ئەگەر ئێوە ناتوانن ئەم خۆراکانە دەستەبەر بکەن، زۆر باشە خۆمان خواردنەکان ئامادە دەکەین." لەو کاتە بەدواوە، هەر کات دایکم دەهات بۆ نەخۆشخانە، شتی بۆ دەکڕیم.

پاشان چووینە ژوورەکەمان. دایکم لای وابوو، دەنگە دەنگ زۆر دێت. ژوورەکەی ئێمە ڕێك لە تەنیشت شوێنی پەرستارەکانەوە بوو. دایکم دەیووت، دەنگی قسەکردنی پەرستارەکان، من ناڕەحەت دەکات، هەر لەبەر ئەم هۆکارە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ژوورەکەمان بگۆڕین. دواجار منیان گواستەوە بۆ ژوورێك لە کۆتایی ڕاڕەوەکە کە کەمێك بێدەنگتر بوو.

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە شاپیرۆ بۆ ئەنجامدانی ئامادەکارییەکانی نەشتەرگەرییەکە، سەردانی کردم.

یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشەکانی شێوازی ستریۆتاکتیك، ئەمە بوو کە کۆژمەڵێك خاڵی ڕەنگیان لەسەر سەرم دادەنا تا شوێنی لووەکان و شوێنی بڕینەکە دیاری بکەن.

دانانی ئەو خاڵانە، واتای ئەوە بوو کە کاتی نەشتەرگەرییەکە نزیك بۆتەوە. بە خۆم وت، ئەوان خەریکن ئەم خاڵانە لەسەر سەرم دادەنێن تا شاپیرۆ بزانێ کە کوێ ببڕێت. واتە پزیشکی نەشتەرگەر، لەو شوێنانەوە نەشتەرگەری لەسەر مێشکی من ئەنجام بدات.

"لاتریس، من دڵنیا نیم کە بتوانم نەشتەرگەرییەکە بکەم."

هەر چەند دەمەویست ئەرێنی بیر بکەمەوە و ڕێ نەدەم ترس بێتە دڵمەوە، نەدەکرا... تەنیا تەسەوەرم دەکرد هەر کەس لوو لە مێێشکییدا بێ، دەمرێت. پێموابوو، نەخۆشییەکانی دیکە چارەسەریان هەیە و هیچ کام لە ئەندامانی لەش، بەڕادەی مێشك گرنگ نەبوون. لەو بیرکردنەوانەدا بووم کە لەپڕ قسەیەکی کۆنم بیر کەوتەوە: "ئەگەر دەست لە مێشکت بدەی، هەرگیز وەك هەوەڵت لێنایاتەوە .." کەسانی دەوروبەریشم بەڕادەی من و تەنانەت لە منیش زیاتر ترسابوون. هەموو هاوڕێکانم هاتبوون: ئوچ، کریس، بیل و کوین. حەزم دەکرد ئەوان لە لام بن، ئەوانیش بەوە خۆشحاڵ بوون کە لەوێ بوو، چونکە پێیانوابوو بەمجۆرە کارێکیان بۆ من کردووە. بەڵام دەکرا لە چۆنێتی روخسار، چاوەکانیان و خۆشحاڵییە درۆینەکەیانەوە، لەوە تێبگەی کە چەندە نیگەرانن.

"من ئامادەم شکست بە نەخۆشییەکەم بهێنم.. تەواو بۆ

نەشتەرگەرییەکە ئامادەم. چیتر لای ئەم و ئەو، ئاخ و ئۆف ناکەم."

کە نەخۆش دەکەوی، تازە تێدەگەی ئەوە تەنیا تۆ نیت کە پێویستت بە دڵدانەوەیە، بەڵکو هەندێك جار دەبێ دڵی دەوروبەرەکانیشت بدەیتەوە. ئەوە تەنیا ئەرکی هاورێکانم نەبوو کە بەردەوام، ئاگادارم بکەنەوە کە: "هیچ نییە، توانات بەسەریدا دەشکێت." هەندێکجاریش دەبوو من دڵدانەوەی ئەوانم بدابایەوە و بمووتبایە: "خەم مەخۆن، تواناm بەسەریدا دەشکێت."

خەریکی سەیرکردنی بەیسباڵ بووین، واماn پیشان دەدا کە وەك بڵێی ئەنجامی یارییەکان زۆر بەلامانەوە گرنگە و هیچ نەشتەرگەرییەکی مێشك لەئارادا نییە. هەندێکجاریش سەبارەت بە پۆرسەی دراوەکان، یان پێشبرکێکانی پاسکیلسواری گفتوگۆمان دەکرد. هەروا نامە و کارتێکی زۆریشمان پێدەگەیشت. هەندێکجار ئەو کەسەم نەدەناسی کە نامەکەی ناردبوو، یان ساڵانێك بوو هیچ هەواڵم لێی نەبوو.. هەموومان لە دەوری یەك دادەنیشتین و بە دەنگی بەرز نامەکانمان دەخوێندەوە. دەبوو تا زووە، هەڵسەنگاندنێکی داراییەکانم بکەم. سەبارەت بە کێشەی بیمەی تەندروستی، قسەم لەگەڵ "ئۆچ و کریس"دا کرد، پاشانیش قەڵەم و کاغەزمان هێنا تا تێکرای سامانەکەم کۆ بکەینەوە. "دەبێ بزانم لە چ بارودۆخێکدام. دەمەوێ بەرنامەرێژییەك بکەم.. بەمجۆرە هەست دەکەم دەتوانم بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەم." من برێك پارەم بۆ چوونە زانکۆ پاشەکەوت کردبوو. باسی فرۆشتنی خانووەکەش هاتە گۆرێ، بەلام حەزم

نەدەکرد خانووەکەم بفرۆشم، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵم دەدا لۆژیکی بیر بکەمەوە. بە خۆم وت ئێستا کاتی ئەم قسانە نییە... ئەگەر من پێویستم بە پارەیە، کەواتە دەبێ خانووەکەم بفرۆشم. پارەی نەختینە و هەژماری خانەنشینییەکەشم پێ زیاد کرد.

زەوی: ٢٢٠,٠٠٠ دۆلار

مەلەوانگە: ٦٠,٠٠٠ دۆلار

کەلوپەلی نێو ماڵ: ٣٠٠,٠٠٠ دۆلار

کەلوپەلی جێگیر، وەك کەوانتەر و...هتد: ٥٠,٠٠٠ دۆلار

هەر ئەو ڕۆژە، شاپیرۆ سەردانی کردم و بە تۆنێکی جددی وتی: "پێویستە سەبارەت بە نەشتەرگەرییەکەی سبەینێ پێکەوە قسە بکەین."

"باسی چی دەکەیت؟ هیوادارم کە زۆر جددی نەبێت؟"

"ئێ، بابەتەکە کەمێك جددییە.."

شاپیرۆ وتی، لووەکان لە دوو شوێنی هەستیار دان: یەکێك لەوان، لە ناوچەی بیناییە و ئەوی دیکەیان لە ناوچەی هاوسەنگی ڕاگرتندابوو. تازە تێدەگەیشتم کە بۆچی هەندێکجار، چاوەکانم لێڵ دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا وتی، هەوڵ دەدات تا ئەو شوێنەی دەکرێ، هەڵدڕینەکان بچووك بن و لە یەك میلیمەتری لووەکان بن. چیتر وەك سەردەمانی کۆن نەبوو کە هەڵدڕینی گەورە لەسەردا دروست بکەن. بە بیستنی قسەکانی ئەو، لەرزم

لێنیشت. هیچ بیرم نەدەکردەوە کە بابەتەکە ئەوەندە جددی بێت. پێموابوو کارێکی سادەیە. بە خۆم دەووت، سەرم دەکەنەوە و بەشە خراپەکان دەتاشن. بەڵام ئێستا ئیدی دەمزانی کە شوێنی نەشتەرگەرییەکە بەڕادەیەك هەستیارە کە بچووکترین هەڵە، دەبووە هۆی ئەوەی کە بینابیم لەدەست بدەم یان تووشی شەلەل ببم.

شاپیرۆ، هەستی بە ترسەکەی من کرد، هەر بۆیە وتی: "هیچ کەس حەزی بە نەشتەرگەری مێشك نییە، کەواتە ئەگەر نەترسی شتێکی نائاساییە."

لە درێژەی قسەکانیدا وتی، لەوە دڵنیایە کە دوای نەشتەرگەرییەکە، خێرا دەگەڕێمەوە بۆ دۆخی ئاسایی پێشووم: "تەنیا یەك رۆژ لە بەشی چاودێری چڕ(تایبەت)دا دەخەوێندرێی و رۆژی سێیەم، دەست بە چارەسەری کیمیایە دەکەین."

ئەو شەوە لەگەڵ دایکم، بیل، ئوچ و کریسدا چووینە بازاری ئەو بەر شەقامەکە تا لە رێستورانتی ئەوێ ، نانێك بخۆین. زۆر مەیلی خواردنمان نەبوو. هێشتاش ئەو خاڵە رەنگییانە، لەسەر سەرم بوون.. دەستبەندی نەخۆشخانەش بە مەچەکمەوە بوو، بەڵام هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو. چ گرنگییەکی هەبوو کە ئەو خاڵانە لەسەر سەرم بوون؟ گرنگ ئەوە بوو کە من لە نەخۆشخانە هاتوومەدەر و خەریکی کات بەسەر بردنم. خەڵك سەیریان دەکردم، بەڵام دیسان بۆم گرنگ نەبوو. تازە بڕیارە بوو سبەینێ سەریشم بتاشن.

تۆ چۆن ڕوبەڕووی بابەتی مەرگ دەبیتەوە؟ هەندێك جار لای خۆم بیر دەکەمەوە کە بەربەستە مێشکییەکان، تەنیا لایەنی جەستەییان نییە، بەڵکو لایەنی سۆزداریشیان هەیە. دەشێ، میکانیزمێك لە سروشتی ئێمەدا هەبێ کە وا دەکات چۆك بۆ مردن دانەدەین، مەگەر لە هەندێك کاتدا کە هەر بەڕاستی ناچاربین.

شەوی پێش نەشتەرگەرییەکە، بیرم لە مردن دەکردەوە. لە خۆمدا بەشوێن خاڵی بەهێزدا دەگەڕام. لەخۆم پرسی ئەگەر بڕیارە بمرم، ئایا دەبێ بمرم، ددانە چیرە بکەم یان بە بە ئاسوودەیی، خۆی رادەست بکەم؟ ئایا لە خۆم و ئەو کارانەی بەدرێژایی ژیان کردبووم، رازی بووم؟بە بۆچوونی خۆم، کەسێکی باش بووم.. هەڵبەت دەمتوانی باشتر بم، بەڵام شێرپەنجە، هیچ کاری بەم کارانە نەبوو.

پاشان بیرم لە بیر و باوەڕەکانم کردەوە. من زۆر ئەهلی پەرستش نەبووم. زۆرم ئاوات دەخواست، بەڵام هیچ کات نزام نەدەکرد. باوەڕم بە ئایین –بەو شێوە ڕێکخراوەی– نەبوو، بەڵام بیرم دەکردەوە کە دەتوانم کەسێکی ئایینی بم و بیروباوەڕی تایبەتی خۆم هەبێت.. من بەرپرسیارم لەوەی کە مرۆڤێکی باش بم و بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش، دەبوو کەسێکی بەویژدان، بەشەرەف و ماندوویی نەناس بم. کەواتە ئەگەر من، بۆ خێزانەکەم پیاوێکی باش بم، بۆ هاوڕێکانیشم، هاوڕێیەکی باش بم، خزمەت بە کۆمەڵگاکەم بکەم، درۆزن و ساختەچی و دزیش نەبم، پێموایە هەر ئەمە بەسە بۆ ئەوەی کەسێکی باش بم. لە کۆتاییدا، ئەگەر بڕیار بوو

کەسێك هەڵسەنگاندنم بۆ بکات، حەزم دەکرد پێم بڵێ کە ئایا ژیانێکی شەرافەتمەندانەم هەبووە یان نا. حەزم نەدەکرد کە باوەڕ بوون بە کتێبە پیرۆزەکان یان ئەنجامدانی رێوڕەسمی خۆ لەناو هەڵکێشان، پێوەری هەڵسەنگاندن بێت. حەزم نەدەکرد پێم بڵێن: "باشە، تۆ هەرگیز کەسێکی مەسیحی نەبووی، کەواتە لە بەهەشتدا شوێنێك بۆ تۆ نییە." ئەگەر بەوشێوە بوایە، منیش لە وەڵامدا پێم دەووتن: "ئێوە چی دەزانن؟ بەڵێ، ئێوە راست دەکەن.."

باوەڕیشم بە پزیشك، دەرمان و نەشتەرگەری هەبوو. بە بۆچوونی من، دەبێ باوەڕمان بە کەسێکی وەك دکتۆر ئاینهۆرن هەبێ، کەسێك کە بیست ساڵ پێشتر، شێوازێکی داهێناوە کە ئێستا دەیتوانێ ژیانی من رزگار بکات.. من باوەڕم بە ژیری و لێکۆڵینەوەکانی ئەو هەبوو.

بەڵام سەرەڕای ئەمانە، نەمدەزانی سنووری نێوان باوەڕی مەعنەوی و زانست کوێیە. هەر ئەوەندەم دەزانی کە خۆم، ئیمان و باوەڕم هەیە. لە هەمبەر بێ هیوایی رەها، بەڵگە بەردەستەکان و کارەساتدا، جیا لەوەی کە ئیمانمان هەبێ، چ کارێکمان لەدەست دێت؟ ئەمە کاری هەموو رۆژێکمانە. ئێمە زۆر لەو شتە بەهێزترین کە تەسەوری دەکەین و باوەڕ یەکێك لە کۆنترین تایبەتمەندییە مرۆییەکانە. لە حاڵێکدا کە هەموومان دەزانین هیچ دەرمانێك بۆ کورت ماوەبوونی ژیان بوونی نییە و ناتوانین خۆ لە مردن قوتار بکەین، بەڵام هەروا ئیمان و باوەڕەکەمان دەپارێزین و ئەمەش جۆرە بوێرییەکە.

گرنگترین هەنگاو ئەمە بوو کە باوەڕم لەهەمبەر خۆم، پزیشکەکان، شێوازی چارەسەرییەکەم و هەر شتێکی دیکە بپارێزم کە باوەڕم پێی بوو.

بە بێ باوەڕ، ئێمە دەمێنینەوە و چارەنووسێکی ناخۆش.. بێگومان ئێمە لەئاست ئەودا شکست دێنین. کاتێك تووشی شێرپەنجە بووم، تازە تێگەیشتم کە ئێمە هەموو ڕۆژێك دەست و پەنجە لەگەڵ موسیبەتەکانی دنیادا نەرم دەکەین. نەخۆشییەکی کتوپڕ، موسیبەت نییە، بەڵکو نائومێدی و بێهیوایی، موسیبەتی راستەقینەی ژیانە. ئێستا دەزانم کە بۆچی خەڵك لە شێرپەنجە دەترسن: لەبەر ئەوەی کە شێرپەنجە، مردنێکی لەسەرخۆ و حەتمییە. ئەو یانی وێناکردنی ڕەشبینی و نەبوونی بوێری.. کەواتە من باوەڕم هەبوو.

کاتێك شتێکت بیر نایاتەوە، بێگومان هۆکارێکی هەیە. لەبیرم نایات کە ڕۆژی نەشتەرگەرییەکە، چ هەستێکم هەبوو یان بیرم لە چی دەکردەوە.. تەنیا شتێك کە لەبیرم ماوە، ڕێکەوتی ئەو ڕۆژەیە، ٢٥ی ئۆکتۆبر، چونکە کاتێك کۆتایی هات، خۆشحاڵ بووم لەوەی کە زیندوو بووم. دایکم، ئۆچ و بیل، کاتژمێر ٦ی بەیانی هاتنە لام تا لەخەو هەڵمسێنن. چەند پەرستارێکیش هاتن تا بۆ نەشتەگەرییەکە ئامادەم بکەن. پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەری مێشك، یادەوەری نەخۆش تێست دەکەن. سی وشە بە نەخۆش دەڵێن و پاشان داوای لێدەکەن کە ئەم وشانە لەبەر بکات. هەندێك لەو نەخۆشانەی کە لوویان هەیە، دوای تێپەڕبوونی دە

خولەك، ئەو شتانەی پێیان وتوون، بیریان نایاتەوە. لەڕاستیدا ئەگەر لووەكان كاریان كردبێتە سەر مێشك، مرۆڤ ناتوانێ شتە بچووكەكانی بیر بێتەوە.

یەكێك لە پەرستارەكان وتی: "تۆپ، دەرزی، ڕێگای هاتنە ناوەوەی ئوتۆمبێل... چەند خولەكی دیكە، ئەم وشانەت لێ دەپرسینەوە."

ڕەنگە نیو كاتژمێری دیكە، ڕەنگیشە دوای سێ كاتژمێر، بەڵام بەهەرحاڵ ئەم وشانەیان لە من دەپرسی و ئەگەر لەبیرم بكردنایە، واتای ئەوە بوو كە كێشەیەكی گەورە لەئارادایە. حەزم نەدەكرد وا بیر بكەنەوە كە كێشەیەكم هەیە، لەڕاستیدا هەروا دەمەویست بیسەلمێنم كە بەو ڕادەیەش كە پزیشكەكان بیریان لێ دەكردەوە، نەخۆش نیم. بڕیارمدا وشەكان لە یادەوەریمدا ڕاگرم، هەر لەبەر ئەم هۆكارەش بۆ ماوەی چەندین خولەك، تەنیا بیرم لەم وشانە دەكردەوە: تۆپ، دەرزی، ڕێگای هاتنە ژوورەوەی ئوتۆمبێل.. تۆپ، دەرزی، ڕێگای هاتنە ژوورەوەی ئوتۆمبێل...

دوای نیو كاتژمێر یەكێك لە پزیشكەكان گەڕایەوە و داوای لێكردم كە وشەكان بڵێم.

منیش بە متمانە بەخۆبوونێكی تەواوەوە وتم: "تۆپ، دەرزی، ڕێگای هاتنە ژوورەوەی ئوتۆمبێل"

كاتی، نەشتەرگەرییەكە هاتبوو. منیان برد بۆ ژووری نەشتەرگەری. دایكم تا بەردەم ژووری نەشتەرگەرییەكە، لەگەڵم هات. لە ژووری

نەشتەرگەری، ژمارەیەك پەرستار و پزیشکی دەم و لووت هەڵبەستراو چاوەڕوانی من بوون. منیان لەسەر قەرەوێڵەی نەشتەرگەرییەکە پاڵخست تا پسپۆڕی بەنج کاری خۆی بکات.

لەبەر هەندێك هۆکار حەزم دەکرد زۆربڵێیی بکەم..

پرسیارم کرد: "فیلمی ڤین لەدڵ (Malice)تان بینیوە؟"

یەکێك لە پەرستارەکان، سەری لەقاند.

بە حەز و تاسەوە، کورتەیەك لە فلیمەکەم باس کرد: ئالك بلدوین (Alec Baldwin) ڕۆڵی نەشتەرگەرێکی بەتوانا و پڕ دەعیە دەبینێت. ئەو بەهۆی چارەسەری هەڵەوە، تووشی لێپێچینەوە دەبێت. لە دانیشتنی دادگایی کردنەکەی ئەودا، یەکێك لە پارێزەرەکان دەڵێ، ئەو پێیوایە خوایە و خۆی لە هەر هەڵە و خەتایەك بەری دەزانێت.

بلدوین بۆ بەرگری لە خۆی وتارێکی دوور و درێژ پێشکەش دەکات، بەڵام دواجاریش، خۆی تۆمەتبار دەکات. بە بڕوای ئەو، کاتێك نەخۆش لەسەر قەرەوێڵەی نەشتەرگەری پاڵکەوتووە و بڕیارەکانی پزیشکی نەشتەرگەر، حوکمی مەرگ و ژیانی ئەوی هەیە، فشارێکی زۆر دەکەوێتە سەر پزیشکی نەشتەرگەر.

پاشان ئەم ڕستەیە دەڵێت: "بەڵام تۆ بەڕێزم، من پێموانییە کە خوام.. من هەر بەڕاستی خوام..."

بە وتنی ئەم ڕستەیە، کۆتاییم بە قسەکەم هێنا و کۆتا وشە کە لە

زمانم هاتەدەر، "ئا.....ی"بوو کە دوای وتنی ئەو، لەهۆش خۆم چووم.

ڕاستییەك لەم ڕستەیەدا هەیە، ڕاستییەکی ڕەها. کاتێك خەریکبوو لەهۆش خۆم دەچووم، داهاتووی من لەدەست پزیشکەکاندا بوو. خەوتن و بەخەبەر هاتنی من، لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندا بوو. لەو ماوەیەدا، پزیشکەکان حوکمی خودایان هەبوو.

بێ هۆشی شتێکی وەك تاریکی بوو: ساتێك وشیار بووم و ساتی دواتر، وەك بڵێی هەر بوونیشم نەبووە. چەند ساتێك دوای دەستپێکردنی نەشتەرگەرییەکە، پسپۆڕی بەنج کردنەکە بۆ تاقیکردنەوەی ئاستی بێ هۆشییەکە، منی وەهۆش خۆم هێنایەوە. کاتێك بەخەبەر هاتم، تێگەیشتم کە نەشتەرگەرییەکە هێشتا کۆتایی نەهاتووە، لەڕاستیدا هەر دەستی پێنەکردبوو. زۆر تووڕە بووم و وتم: "بە نەفرەت بن، دە دەست پێبکەن."

گوێم لە دەنگی شاپیرۆ بوو، دەیووت: "هەموو شتێك تەواوە" و پاشان دیسان لەهۆش خۆم چوومەوە.

هەموو ئەو شتەی لەبارەی نەشتەرگەرییەوە دەیزانم، شتانێکن کە دکتۆر شاپیرۆ، دوای نەشتەرگەرییەکە بۆی باس کردبووم. نەشتەرگەرییەکەی من نزیکەی شەش کاتژمێری خایاند. پزیشك سەرمی هەڵدڕیبوو، خەریکی هێنانە دەرەوەی لووەکان بوو بوو. پاشان ئەوانی دابوو بە پاتۆلۆژیست تا لەژێر وردبیندا پشکنینی بۆ بکات.

بە پشکنینی پێکهاتەی لووەکان، دەیانتوانی جۆری شێرپەنجەکە و

ئەگەری تەشەنە کردنەکەی دیاری بکەن. ئەگەر لە جۆری شێرپەنجە زیندوو و پەلامارد‌ەر بوایە، ئەگەری ئەوە هەبوو لە لەشمدا لووی دیکەش هەبوایە.

بەڵام پسپۆڕی پاتۆلۆژی بە سەرسوڕمانەوە سەری لەسەر وردبینەکە هەڵگرت و وتی: "پێکهاتە(شانە)کە، نکرۆتیك (Necrotic)ە."

شاپیرۆ وتی: "شانەی مردوو؟"

پسپۆڕ پاتۆلۆژی وتی: "ئەوانە مردوون."

بێگومان ناکرێ هەموو خانەکان لەنێو چووبن، بەڵام هەموو تایبەتمەندییەکانی خانە مردووەکانیان هەبوو. ئەمە باشترین هەواڵ بوو، چونکە چیتر ئەگەری پەرەسەندنیان لەئارادا نەبوو. شانەی مردوو شتێکی نائاسایی نییە، بەڵام چ شتێك ئەوانی کوشتبوو؟ کەس وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدەزانی.

دوای نەشتەرگەرییەکە، شاپیرۆ ڕێك و ڕاست چوو بوو بۆ لای دایکم و ئەم هەواڵەی بە دایکم دابوو کە: "لانس لە ژووری وەهۆش هاتنەوەیە و دۆخیشی باشە.." ئەو بە دایکمی وتبوو، شانەکە لە جۆری مردوو بوون و هیچ شتێکی دیکە لە لەشیدا نەماوە و هەموویان دەرهێناوە.

شاپیرۆ وتی: "زۆر لەوە باشتر بوو کە ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد."

بەرەبەرە لەخەو هەستام، ژوورەکە زۆر ڕووناك بوو، کەسێکیش خەریك بوو قسەی لەگەڵ دەکردم.

من زیندووم.

چاوەکانم کردەوە. خەریکبوو وەهۆش خۆم دەهاتمەوە و شاپیرۆ بەسەر سەرمەوە نوشتابووەوە. کاتێك پزیشك کاسەلەسەری کەسێك هەڵدەگرێ، نەشتەرگەری بۆ مێشکی دەکات و پاشان دووبارە یەکی دەخاتەوە، راستییەك بوونی هەیە کە ئەویش ئەمەیە کە نەشتەرگەر، هەرچەندیش شارەزا بێ، بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی ئەنجامە.

شاپیرۆ وتی: "منت دێتەوە یاد؟"

وتم:" تۆ پزیشکەکەی منی."

-"ناوم چییە؟"

"سکات شاپیرۆ"

-"دەتوانی ناوەکەتم پێبڵێی؟"

"لانس ئارمێسترانگ"

ئەوەم وت و دووبارە لەهۆش خۆم چوومەوە، بەڵام هەر لەو کاتەدا کە چاوەکانم دادەخرانەوە، هەستم کرد ئەو پزیشکەشی لێیە کە پێش نەشتەگەرییەکە، یادەوەریمی تێست کردبوو. بێ ئەوەی مەبەستم بێ ئەو وشانەم دووبارە کردەوە: "تۆپ، دەرزی، رێگای هاتنە ژووری ئوتۆمبێل..."

دووبارە زۆر بەقوڵی خەوم لێکەوت.

کاتێك کە ئەمجارەیان بەهۆش خۆم هاتمەوە، لە ژووری چاودێری چڕدا بووم کە ژوورێکی کەم ڕووناك و بێدەنگ بوو. دەمەویست بەسەر گێژی بەنجەکەدا زاڵ ببم. ژوورەکە زۆر تاریك و بێدەنگ بوو. دەمەویست لە قەرەوێڵەکەم بێمەدەر. بەخۆم وت: خێراکە، بجووڵێ.

پەرستاری بەشەکە وتی: "بەخەبەرە"

قاچێکم لە قەرەوێڵکە هێنایە خوار.

"هەر لەوێ بمێنەرەوە! ئەوە چی دەکەیت؟"

"دەمەوێ هەستم" و پاشان هەوڵم دا بەرز ببمەوە.

بە خۆم وت: خێراکە، بجووڵێ، ئەگەر بتوانی بڕۆیی واتە نەخۆش نیت.

پەرستارەکە وتی: "تۆ هێشتا ناتوانی بەرز ببیتەوە. پاڵکەوە"

پاڵکەوتم و وتم: "من برسیمە."

کەمێك کە وشیارتر بوومەوە، زانیم کە هەموو سەرم لەفاف پێچ کراوە. وەك بڵێی هەستەکانیشم لەفاف پێچ کرابوون! ڕەنگبوو ئەم حاڵەتە بەهۆی، بەنجەکە و ئەو سۆندانەوە بوو کە پێمەوە هەڵواسرابوون. ژمارەیەك سۆندە لە لووتمدا بوون و سۆندەیەکیشم پێهەڵگیرابوو. لە ناخەوە هەستم بە ماندوێتییەکی زۆر دەکرد؟

برسیمبوو. دایکم وای بار هێنابووم کە سێ ژەم خواردن بخۆم. بیرم لە قاپێك خواردنی گەرم لەگەڵ ساسێکی زۆر دەکردەوە. چەندین کاتژمێر

بوو هیچم نەخواردبوو. دوایین جار تەنیا قاپێك فاسۆلیام خواردبوو.. خۆ فاسۆلیاش خواردن نەبوو، زیاتر بەرکوڵ بوو.

یەکێك لە پەرستارەکان، قاپێك هێلکە وڕۆنی بۆ هێنام.

لێم پرسی: "دەتوانم چاوم بە دایکم بکەوێت؟"

چەند ساتێك دواتر، دایکم بە بێدەنگی هاتە ژوور و دەستی گرتم. دەمزانی چ هەستێکی هەیە. بە بینینی من لەو دۆخەدا هەستی دایکایەتییەکەی، برینداربوو بوو. ئاخر من لە گۆشت و خوێنی ئەو بووم، گەرد بەگەردی گیانم تا دوا خانەی نینۆکە بچووکەکەم، لە بوونی ئەو بوو. ئەو دەمانەی کە منداڵ بووم، دایکم، لەخەودا هەناسەکانمی دەژمارد.

وتم: "زۆرم خۆشدەوێی. ژیانم خۆش دەوێ و ئەمە تۆ بووی کە ژیانت پێبەخشیم.. لەم بابەتەوە زۆر قەرزارباری تۆم."

حەزم دەکرد چاوم بە هاوڕێکانم بکەوێت. پەرستارەکە مۆڵەتی دا دوو کەس، دوو کەس، بێنە لام. پێش نەشتەرگەرییەکە، وریای ئەوە بووم کە وەك کەسێکی خۆڕاگر ببیندرێم، بەڵام ئێستا نەشتەرگەرییەکە کۆتایی هاتبوو، چیتر پێویست نەبوو خۆم بنوێنم. ئۆچ هاتە ژوور، دوای ئەویش کریس هات، دەستەکانیان گرتم. حەزم دەکرد پێیان بڵێم کە چەندە ترسابووم. بزەیەکم کرد و وتم: "هێشتا نەمردووم.. دیسان لە لاتانم."

وڕوکاس بووم، بەڵام سەرەڕای ئەوە، ئاگام لە دۆخی کەسانی چوار دەورم بوو، دەمزانی لە چ دۆخێکدان. بوغز قورگی "کوین"ی گرتبوو. ئەو

زۆر نیگەران بوو، دەمەویست دڵنەوایی بکەم.

بەپێکەنینەوە وتم: "بۆ ئاوا خۆت جددی پیشان دەدەی؟"

تەنیا دەستی گوشیم.

وتم: "تێدەگەم، زۆر قورسە کە برا گەورەکەت لەم دۆخەدا ببینی."

هەروا کە خەوتبووم و گوێم بۆ قسەی هاوڕێکانم دەگرت، دوو هەستی لێکدژ، سەرتاپای بوونمی داگرت. سەرەتا شەپۆلێك لە ڕێز و پێزانینم لە ناخمدا هەست پێدەکرد، بەڵام پاشان شەپۆڵێك لە تووڕەیی، دایگرتم و ئەم شەپۆلە، لەگەڵ شەپۆلی یەکەمدا نەدەهاتەوە. من زۆر باش بووم، لە لایەکیشەوە سەراسیمە بووم. ئەم دوو هەستە ئاوێتەی یەکتر بوو بوون، واتە هێندە باش بووم کە سەراسیمە بم. لەوەی کە لەسەر قەرەوێڵە بووم و سەرم لەفاف پێچ کرابوو، هەروەها لەشم پڕ لە سۆندە بوو، هێندە سەراسیمە بووم، حەزم دەکرد بگریم.

کریس دەستەکانمی خستە نێو دەستی خۆیەوە. نزیکەی شەش ساڵ دەبوو کە من و کریس یەکترمان دەناسی و هیچ قسەو هەستێکمان نەبوو کە لە یەکتری بشارینەوە.

کریس پرسی: "چۆنی؟"

وتم: "زۆر باشم"

-"زۆر باشە، ئێستا چ هەستێکت هەیە؟"

"زۆر باشم."

وتم: "كریس تۆ نازانی" فرمێسك بە چاوانمدا چۆڕاوگەی بەست.. "من بۆ ئەوە خۆشحاڵم. دەزانی بۆچی؟ خۆشمدەوێ، من هەمیشە ئەو گرفت و كێشانەم خۆش دەوێ كە دێنە ڕێم. هەمیشە هەر بەو جۆرە بووە و جیا لەوە هیچ ڕێگایەكی دیكە ناناسم. ئەمەش یەكێك لەو گرفتانەیە كە دەبێ بەسەریدا زاڵ بم. تەنیا ئەوە و بەس."

ئەو شەوە، لە بەشی چاودێری چڕدا مامەوە. یەكێك لە پەرستارەكان هاتە لام و ئامێرێكی پێدام تا فووی تێكەم. لە نێو ئامێرەكەدا تۆپێكی بچووكی سوور تێدابوو. لەڕاستیدا بەم كارە دەیانەویست بزانن توانای سییەكانم چەندە تا لەوە دڵنیا ببنەوە كە بەنجەكە زیانی بە سییەكانم نەگەیاندووە.

پەرستارەكە وتی: "فوو بكەرە نێو ئەم ئامێرەوە. هەڵبەت ئەگەر تۆپەكە زۆر بەرز نەبووەوە، هیچ نیگەران مەبە."

وتم: "خاتوون، گاڵتەم پێدەكەی.. من لەم ڕێگایەوە نان پەیدا دەكەم. ئەو پۆخڵەواتە بدە بە من."

ئامێرەكەم لە دەستی فڕاند و فووم تێكرد. تۆپە، ڕاستەوخۆ بەر میچی ئامێرەكە كەوت. بێگومان ئەگەر زەنگوڵەی پێوەبووایە، دەنگی دەردەهات.

ئامێرەكەم دایەوە و وتم: "چیتر ئەمجۆرە شتانە مەهێنە بۆ ئێرە.

سییەکانم ساغن."

پەرستارەکە بێ ئەوەی هیچ بڵێ، چووە دەر. سەیرێکی دایکم کرد. چاوەڕوان بووم شتێکم پێبڵێ، ئاخر رەفتارم لەگەڵ ئەو پەرستارەدا زۆر بێ ئەدەبانە بوو. بەڵام دایکم جۆرێك بە روومەوە پێکەنی وەك بڵێی لە پێشبڕکێیەکی سیانەیی دیکەدا براوە بووم. بە بۆچوونی ئەو خەتای پەرستارەکە بوو، من هیچ هەڵەیەکم نەکردبوو.

"تۆ کوڕی خۆمی.. کوڕم، خەریکە بارودۆخت باش دەبێت."

بەیانی رۆژی دواتر، منیان بردە قاوش تا دەست بە چارەسەری کیمیایی بکەم. دەبوو شەش رۆژی دیکە لە نەخۆشخانە بمێنمەوە و چارەسەر وەرگرم. ئەنجامەکانی ئەو، گرنگییەکی زۆریان هەبوو.

هەروا لە بواری شێرپەنجەدا دەمخوێندەوە. دەمزانی ئەگەر چارەسەری کیمیایی وەڵام نەداتەوە، چیتر هیوایەك نییە و نەشتەرگەری مێشك هیچ دەوری نییە. لە هەموو کتێبەکاندا بەکورتی ئاماژە بە دۆخی من کرابوو. لە یەکێك لە کتێبەکاندا نوسرابوو: "ئەگەر لەکاتی بەکارهێنانی سیس پلاتیندا نەخۆشییەکە هەروا تەشەنە بکات، هیچ دەرمانێکی دیکە دەوری نابێت."

لە یەکێك لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکاندا کە لە بواری شێرپەنجەی گوندا کرابوو، ئاماژە بە جۆرەکانی دەرمان و رێژەی چاکبوونەوەی نەخۆشەکان کرابوو. لە پەراوێزی کتێبەکەدا، بارودۆخی خۆم هەڵسەنگاند و یادداشتێکم نووسی. بەڵام لەم نووسینەشدا، دیسان ئاماژە بەو بابەتە

کرابوو: "ئەگەر دوای وەرگرتنی یەکەم چارەسەری کیمیایی نەخۆشییەکە بە ڕێژەیەك کەمتر نەبێتەوە، بە واتای ئەوەیە کە شانسی چاکبوونەوە کەمە." کەواتە بەمجۆرە، چارەسەری کیمیایی لە هەندێك حاڵەتدا کاریگەر دەبێ و لە هەندێك حاڵەتیشدا بێ سوودە.

تەنیا کارێك کە دەمتوانی بیکەم ئەمە بوو کە لەسەر قەرەوێڵە دانیشم تا ئەو ماددانە، بچنە لەشمەوە. پەرستارەکانیش بەردەوام بە دەرزییەکانیان ئازاریان دەدام.. یەکێك لە شتەکان کە سەبارەت بە نەخۆشخانە، بە نەخۆش ناوترێ، ئەو ستەمەیە کە پەرستار و پزیشکەکان دەرهەق بە نەخۆشەکان ڕەوای دەبینن، ئەوان ڕێگەپێدراون کە هەر کارێك حەزیان لێیەتی بیکەن و هەر شتێك بکەنە نێو دەمار و کونەکانی لەشی نەخۆشەوە. لە نێو ئەو شتانەدا سۆند[8] لە هەمووان خراپتر بوو، هەر جارێك بیانویستایە بیگۆڕن، بەڕاستی ئازارم دەچەشت. ئەم کارە بچووکانە، خراپترین بەشی چارەسەری نەخۆشییەکە بوون. لانی کەم لەکاتی نەشتەرگەرییەکەدا، بەنج بووم و ئاگام لە خۆم نەبوو، بەڵام بۆ باقی کارەکانی دیکە، تەواو ئاگام لە خۆم بوو. پشتی دەستەکانم و باسکەکانم و سەر ڕانم، ڕەش و شین هەڵگەڕابوو، هەمووی شوێنی دەرزی بوو. هەستم دەکرد پەرستارەکان خەریکن بەزیندوویی دەمخۆن.

شاپیرۆ هاتە ژوورەکەم و وتی نەشتەرگەرییەکە زۆر سەرکەوتوو بووە. ئەوان لووەکانیان دەرهێنابوو، بەڕواڵەت هیچ نیشانەیەك لە لوو نەمابوو.

---

[8]– سۆند: ئامرازی لێکەڕان یان هەراوردنی دەراوێکی لەش. فەرهەنگی فارسی – کوردی دانشگای کوردستان.

هیچ کێشەیەکی زەینی یان ناسینەوەش ڕووی نەدابوو، توانای جووڵانیشم زۆر باش بوو. شاپیرۆ وتی: "ئێستا تەنیا پێویستە هەمووهان نزا بکەین کە لووەکان دووبارە دروست نەبنەوە."

بیست و چوار کاتژمێر دوای نەشتەرگەرییەکە، بۆ خواردنی نانی ئێوارە لە نەخۆشخانە چوومە دەر. هەر بەو جۆرەی کە شاپیرۆ بەڵێنی دابوو، بارودۆخم زۆر زوو بەرەو باشبوون چوو. ئەو شەوە بە یارمەتی دایکم، لیزا، ئوچ، کریس و بیل چووینە ڕێستۆرانتی ئەوبەر شەقامەکە. شاپیرۆ شتێکی تایبەتی بە من نەوتبوو، هەر بۆیە حەزم دەکرد بەپێی بەرنامە خۆراکییەکەی خۆم بجووڵێمەوە. کڵاوەکەم کردە سەرم تا لەفافەکان دیار نەبن و لە نەخۆشخانە چوینەدەر.. بیل تەنانەت بلیتی یاریشی کڕیبوو، دەیویست من بیات، بەڵام هێشتا بۆ ئەم کارانە، کەمێك زوو بوو. لەکاتی خواردنی نانی ئێوارەدا وەزعم باش بوو، بەڵام کاتی خواردنی شەوچەرە(پاشەژەم)، هەستێکی باشم نەبوو، هەر بۆیە پەشیمان بووینەوە لەوەی کە سەیری یاری بکەین و من گەڕامە نێو جێگای نەخۆشی.

بەیانی ڕۆژی دواتر، شاپیرۆ هات لەفافەکان بکاتەوە. هەروا کە گۆزەکانی دەکردەوە، هەستم بەوە دەکرد کە گۆزەکان لە سیمی تەقەڵەکان جیا دەبنەوە. وەك بڵێی شتێك گازم لێدەگرێت. دواجار کۆتایی هات. چوومە بەردەم ئاوێنە. تەڵەقەکانی سەرم لە زنجیر دەچوو. شاپیرۆ وتی: "کاری من تەواو بوو."

بەوردی سەیری تەڵەکانی سەرم دەکرد. دەمزانی کە شاپیرۆ، بۆ پێکەوە لکاندنەوەی کاسەلەسەرم برغۆ گەلی تیتانیوم(Titanium)ی بەکار هێناوە. تیتانیوم، جۆر هاوجۆشێکە(الیاژ) کە لەپاسکیلە کێش سووکەکاندا بەکار دەهێندرێت. بەگاڵتەوە بەخۆم وت: "رەنگە لەمە بەدوا، باشتر بە هەورازاندا سەرکەوم."

من و شاپیرۆ، بوونە دوو هاوڕێی زۆر باش، ئەو بەدرێژایی مانگەکانی دواتر، بەردەوام سەردانی دەکردم تا ئاگاداری گۆڕانکارییەکان بێت. هەرچەند خەوم بهاتبایە یان هێڵنجیشم هاتبایە، واش بەبینینی ئەو خۆشحاڵ دەبووم. دکتۆر ئاینهۆرنیش لە سەردانی ئیتاڵیا گەڕایەوە و سەری لێدام. ئەو زۆر سەرقاڵ بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کاتێکیشی بۆ سەردانیکردنی من دادەنا و بەشداری لە پرۆسەی چارەسەری مندا دەکرد. ئەویش وەك دکتۆر نیکۆلز و دکتۆر شاپیرۆ، لەو پزیشکانە بوو کە "دەستی شیفا" بوو. بە بۆچوونی من، ئەوان لە خەڵکانی دیکە زیاتر واتای ژیان و مەرگیان دەزانی. روانگەیەك کە ئەوان بۆ مرۆڤایەتیان هەبوو، هیچ کەسی دیکە نەیبوو، چونکە ئەوان ئاسۆیەکی سۆزداری فراوانیان هەبوو. ئەوان مەرگ و ژیانی مرۆڤەکانیان بینیبوو، هەروەها هەموو رۆژێك بەشێوەی ئاشکرا و بەهەموو گەشبینییە نالۆژیکی و ترسەکانەوە، چۆنێتی رووبەڕوو بوونەوەی کەسانێکیان لەگەڵ ئەم دوو پێشهاتەدا دەبینی.

دکتۆر ئاینهۆرن وتی: "من زۆر نەخۆشی بەوەرەم بینیوە کە دواجار

بەسەر ئەم نەخۆشییەدا زاڵ نەبوون و زۆر نەخۆشی داماویش هەبوون کە ڕزگاریان بووە و دووبارە دەستیان بە ژیانی پڕ لە مەینەتی خۆیان کردۆتەوە.."

بەرەبەرە هەواڵی خۆشمان پێدەگەیشت. من و بیل، خۆمان بۆ بیستنی هەواڵی ناخۆش ئامادە کردبوو. بەڵام کۆمپانیاکانی نایك، جیرۆ، ئۆکلی و میلتۆن برادلی، هەموویان بەڵێنیان دا پشتیوانیمان بکەن.

ناسیاوی من لەگەڵ "نایك"دا بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کە لە پێشبڕکێکانی ڕاکردن و پێشبڕکێ سیانییەکانی دواناوەندیدا بەشداریم دەکرد. ئەو کاتە بڕوام نەدەکرد کە ڕۆژێك ببمە ئەندامی یانەی نایك، لەبەر ئەوەی کە من لە یانەکانی دۆجر (Dodger)، سۆڵجرز فیلْد (Soldhres) یان ڕۆلاند گارۆس (Rolan Garros)دا یاریم نەدەکرد، بەڵکو شوێنی یاریکردنی من شەقامەکانی فەڕەنسا، بەلجیکا و ئیسپانیا بوو. سەرەڕای ئەمەش، کاتێك کە کارەکەم ڕەونەقی پەیدا کرد، داوام لە بیل ستاپیڵتۆن کرد کە ئەگەر دەکرێت لەگەڵ نایکدا گرێبەستێك بۆ من واژۆ بکات، چونکە هەمیشە ئاواتم ئەوە بوو لەگەڵ ئەو کۆمپانیایەدا کار بکەم. ساڵی ١٩٩٦، واتە ڕێك پێش ئەوەی دەرکەوێ نەخۆشم، نایك گرێبەستی لەگەڵ مندا واژۆ کرد کە پێڵاو و دەستکێشەکانی ئەوان بپۆشم.

خێرا لەگەڵ "سکات مەك ئایچرن"دا بووین بە هاوڕێ. سکات، نوێنەری نایك بوو لە بەشی پاسکیلسواریدا و یەکێك لە یەکەم کەسەکان بوو کە باسی نەخۆشییەکەم بۆ کرد. ئەو شەوەی کە لە نۆرینگەی دکتۆر ڕیۆز

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، قسەم لەگەڵ ئەودا کرد و هەرچی هەوڵمدا، نەمتوانی خۆم کۆنتڕۆڵ بکەم. کاتێك سەبارەت بە هەموو بەسەرهاتەکە و ئازاری چاڵایی سەروی ران و تێشکەوێنە گرتن لە سنگم، قسەم لەگەڵ "سکات"دا دەکرد، یەکبینە گریام. پاش ئەوەی گریانەکەم تەواو بوو، بێدەنگییەك لە نێوان ئێمەدا دروست بوو، بەڵام دوای ئەوە سکات زۆر دۆستانە و ئارام قسەی لەگەڵ کردم.

سکات وتی: "نیگەرانی ئێمە مەبە. ئێمە لەگەڵتین."

رستەیەکی کورت بوو، بەڵام بە بیستنی هەستم کرد تەنیا نیم. سکاتیش هەر بەڕاستی لەسەر بەڵێنەکەی خۆی بوو. نایك هیچ کات پشتی بەرنەدام. تا نەخۆشییەکەم قورستر دەبوو، ئەم قسەیە لای من واتای زیاتری پەیدا دەکرد. سپۆنسەرەکانی دیکەشم هەر ئەم کارەیان کرد. من هەر ئەم رستانەم لە زمانی –جیرۆ، ئۆکلی و میلتۆن برادلی–شەوە بیست.

ئەوان نەك هەر ئاگایان لە من بوو، بەڵکو بۆ من وەك دۆست و هاوڕێیەکی راستەقینە بوون. بیل سەبارەت بە بابەتی بیمەی تەندروستی من، دەستەوەستان مابوو، بەشوێن رێگایەکەوە بوو تا من بتوانم بەهۆی ئەوەوە، داوای بیمەی تەندروستی بکەم، بەڵام هیچ سوودی نەبوو.

بیل پەیوەندی بە "مایك پارنل"ی بەڕێوەبەری "ئۆکلی"یەوە کرد، رووداوەکەی بۆ گێڕایەوە و سەرەڕای دوودڵبوونی داوای یارمەتی لێکرد. مایکیش لە وەڵامدا وتی کارەکان جۆر دەکەم.

کەمێك دڵخۆش بوو بووم، بەڵام لەناکاو ئەو کۆمپانیای بیمەیەی کە ئەوان گرێبەستیان لەگەڵ واژۆ کردبوو، هەموو شتێکی تێکدا. بەپێی قسەی ئەوان، من پێشتر تووشی ئەم نەخۆشییە بووم و ئەوان ناچار نین تا تێچووی چارەسەری من لەئەستۆ بگرن.

هەر بە بیستنی ئەم هەواڵە، مایك خێرا پەیوەندی بەوانەوە دەکات و هەڕەشەیان لێدەکات کە ئەگەر تێچووی من نەگرنە ئەستۆی خۆیان، گرێبەستەکەی لەگەڵ ئەواندا هەڵدەوەشێنێتەوە.

"ئەو بیمە بکەن."

بەڵام ئەوان هەر رازی نەدەبوون.

"وادیارە تێنەگەیشتن کە وتم چی.."

دواجار منیان بیمە کرد.

من تا ماوم پاسکیلسواری بۆ ئۆکلی، نایك و جیرۆ دەکەم، تا بەڵکو بتوانم سوچێك لە ماندووبوونەکانی ئەوان قەرەبوو بکەمەوە. هەر کام لەوان، گرێبەستەکانی منیان بەتەواوی جێبەجێ کرد. هەرچەند دەیانتوانی زۆر ئاسان، هەڵیوەشێننەوە کەچی هیچ کام لەوان، تەنانەت یەکجاریش لە منیان نەپرسی، کەی دووبارە دەتوانم بچمەوە سەر پاسکیل.. تازە کاتێك کە بەوانم وت "ڕاستی دەمەوێ دامەزراوەیەکی نەخۆشانی شێرپەنجە دامەزرێنم (لە بەشەکانی دواتردا باسی دەکەم) و پێویستم بە بڕێك پارەیە، تا پێشبڕکێیەکی پاسکیلسواری ساز بکەم،

هەموویان ئامادەیی خۆیان دەربڕی. کەواتە قسەکردن لە دنیای بێبەزەیی بازرگانی لەجێی خۆیدا نییە.

شێرپەنجە فێری کردم تا مرۆڤەکان باشتر بناسم و واز لە بیرکردنەوەکانی رابووردووم بهێنم.

بەدرێژایی هەفتەکانی دواتر، هەروا هەواڵی خۆشم پێدەگەیشت. یەك دوو رۆژ دوای وەرگرتنی چارەسەری کیمیایی، ژمارەی خرۆکە سوورەکانی خوێنم زیادی کرد و پیشانە شێرپەنجەییەکان، کەمیان کرد، ئەمەش واتای ئەوە بوو کە شێرپەنجەکە لە ئاست دەرمانەکاندا کاردانەوەی پیشان داوە. بەڵام هێشتا رێگایەکی دوور و درێژم لەپێش بوو، تازە ئەو بەدواداهاتە لاوەکیانەی کە نیکۆلز باسی کردبوون، خەریکبوو دەردەکەوتن. لە کۆتایی هەفتەدا چیتر هیچ نیشانەیەك لە خۆشحاڵبوونی ئەوەی کە نەشتەرگەرییەکە سەرکەوتوو بووە، نەمابوو، بەهۆی بەکارهێنانی ئیفۆسفامیدەوە حاڵەتی هێڵنجدان جێی ئەوی گرتبووەوە. بەردەوام هەستێکی ناخۆشم هەبوو، تازە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە زۆریش نەخۆشی خستبووم. تەنیا حەزم دەکرد چاوم ببڕمە دیوار یان بخەوم.. تازە ئەمە هەوەڵی رێگا بوو، دوو قۆناغ(جار)ی دیکەشم مابوو.

حەوت رۆژ دوای نەشتەرگەرییەکە لە نەخۆشخانە ئیزن درام. دەبوو دوای چەند رۆژێکی دیکە دیسانەوە سەردانی نەخۆشخانە بکەمەوە، بەڵام بەرەبەرە خەریکبوو پێی رادەهاتم و کەمتر ئازاری دەدەدام...

پرسیار ئەمە بوو، چارەسەری کیمیایی، یەکەمجار کام یەك لە ئێمە لەنێو دەبات: شێرپەنجە یان من؟! ژیانی من لە سورنجێك و پرۆسەیەکی دووبارە بووەوەی وەڕزکەردا، کورت بووبۆوە: ئەو کاتانەی کە ئازارم نەبوو، دەرشامەوە. کە نەدەرشامەوە، بیرم لە سامانەکەم دەکردەوە یان بیرم لای ئەوە بوو کە کەی لەم دۆخە رزگارم دەبێت.

شێرپەنجە هەستێکی ناڕوونی ناخۆشە، بەڵام چارەسەری کیمیایی، کۆمەڵەیەکی بێ کۆتایی لە ترس و تۆقانە.. دواجار گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە شێوازی چارەسەریش، وەك شێرپەنجە خراپە و تەنانەت لەویش خراپترە. بە بیستنی وشەی "شێرپەنجە" زۆر شتت بیردێتەوە، وەرینی قژ، رەنگ پەڕیوی و لاوازی جەستەیی... لە راستیدا ئەمانە هەموویان بەدواداهاتی لاوەکی چارەسەری کیمیاین. چارەسەری کیمیایی وەك ئاگرێك وابوو لە خوێنبەرەکانمدا، هەموو شتێکی لووش دەدا و دەچووە پێش، تا ئەوەی کە چیتر تەنانەت مژۆڵێکیشی بۆ نەهێشتمەوە. چارەسەری کیمیایی واتە کۆکینی بەردەوام، هاتنەدەری پارچەگلی رەشی وەك قیر لە سنگ و میزهاتنی بەردەوام.

بۆ ئەوەی بتوانم بەرگەی ئەم دۆخە بگرم، لای خۆم وێنام دەکرد کە ئەمانە پارچە گەلی لوون کە لە لەشم دێنەدەر. وام تەسەور دەکرد کە دەرمانەکانی چارەسەری کیمیایی کاری تێکردوون، ئەوانی سووتاندوە و لە لەشم دەیانکاتەدەر. کە دەچوومە ئاودەست، بەرگەی سووتانەوەی

میزەکەم دەگرت و بەخۆم دەووت، ئەمانە خانە مردووە شێرپەنجەییەکانن کە خەریکن لە لەشم دێنەدەر. دواجار دەبێ ئەوان لە شوێنێکەوە بێنەدەر؟ من ئەوانم لەڕێی کۆکە و میزەوە لە لەشم دەکردە دەرەوە.

ژیانی من تەنیا بوو بووە چارەسەری کیمیایی و بەس.. چیتر پشوو بووایە یان نا هیچ واتایەکی بۆ من نەبوو. هەموو پشووی زستان و پاییزی ئەو ساڵەم بە چارەسەری کیمیایی یان تێپەڕاندنی پشووی دوای نەخۆشی بردەسەر. پشووەکانی هالۆوین (Halloween) لە نەخۆشخانە بووم و لە نێو پەرستارەکاندا بەستەی چکلێتم دابەش دەکرد. ڕۆژی شوکرانەبژێری (Thankssgiving)یش لە ماڵەوە بووم و لەسەر قەرەوێڵەکەم، قۆناغی پشووی دوای نەخۆشییەکەم دەگوزەڕراند. دایکیشم حەزی دەکرد بەزۆر چەند پارو لەو قەلەم دەرخوارد بدات کە لێینابوو. شەوان لە نێوان ۱۰ بۆ ۱۲ کاتژمێر دەخەوتم و کە لەخەو هەڵدەستام، لەشم داهێزرابوو. شتێکی وەك ماندوێتی فڕین و خوماری بەیانیان.

چارەسەری کیمیایی کاریگەری چەن لایەنەی هەیە. من لە ماوەی سێ مانگدا، چوار خولی چارەسەری کیمیاییم وەرگرت و هەر قۆناخێکیش ئەو ژەهرانەی بەهۆیەوە دروست دەبوون لە لەشمدا کەڵەکە دەبوو. سەرەتا زۆر ناخۆش نەبوو. لە کۆتایی خولی دووەمدا، حاڵەتی هێڵنجدان و خەواڵوویيم پەیدا کرد. ڕۆژی دوو شەممە دەچووم بۆ سەنتەری ئیندیانا

پۆلیس و بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ و هەر ڕۆژەش بۆ ماوەی ٥ کاتژمێر، دەخرامە ژێر چارەسەری کیمیاییەوە. کاتێك کە چارەسەرە کیمیاییەکە کۆتایی دەهات، موغەزییەکی ٢٤ کاتژمێریان بۆ هەڵدەواسیم. بۆ ڕێگری کردن لە کاریگەرییە ژەهراوییەکانی ئینفۆسفامید[١] لەسەر سیستەمی بەرگری لەشم پارێزەرێکی کیمیاییشیان پێوە دەبەستم.

لە خولی سێیەمدا، زۆر بەقورسی تووشی هێڵنجدان دەبووم. جارێکیان تووشی هێڵنج بووم و دۆخی تێکڕای کۆئەندامەکانی ناوەوەی لەشم تێکچوو. لە خولی چوارەمدا زۆرترین ڕێژە(دۆز)ی دەرمان کە بۆ نەخۆشی شێرپەنجە بەکار دەهێنرێ، بۆم بەکارهێنرا و ئیدی شەو و ڕۆژ هێڵنجم دەدا.

دکتۆر نیکۆلز پێشنیاری کرد لە ئاستێن درێژە بە چارەسەری کیمیاییەکە بدەم: "لە شارەکەی خۆت، چارەسەری کیمیایی ئەنجام بدە و ئێمەش هەر پەیوەندیمان لەگەڵ تۆدا دەبێت.." بەلام من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە هەر لەوێ درێژە بە چارەسەرییەکەم بدەم بۆ ئەوەی بەردەوام لەژێر چاودێریدا بم.

وتم: "دەمەوێ ئەگەر خراپتر بووم، بتوانن پشکنینم بۆ بکەن و ئەگەر باشتریش بووم، دیسان هەر لەژێر چاودێری ئێوەدا بم."

چارەسەری کیمیایی لە هیچ شتێك ناچێت، ناکرێ باوەڕ بەوە بکەی کە ئەم مادده کوشندانە، مەترسییان نییە. دەرمانەکان لە نێو کیسە گەلی

---

[١]– ئەم دەرمانە، کاریگەری خراپی لە سەر گورچیلە و مۆخی ئێسقان هەیە.

نایلۆنی ٥٠ سی.سی دا بوون و ناو و ناوی خێزانی من، ڕێکەوت، دۆز(ڕێژە)ی دەرمانەکە و قەبارەی شلەکەی لەسەر نووسرابوو. ئەو شتە ڕەنگ زیویانە، لەنێو کیسە نایلۆنییەکاندا سەرئاو کەوتبوون و هیچ خڵتەیەکیشیان لەخۆیان جێنەدەهێشت. تاڕادەیەك لە کیسەی شەکراو دەچوون. تەنیا جیاوازییان ئەوە بوو کە لە سەری نووسرابوو "ماددەی مەترسیدار" و پەرستارەکان، بە دەستکێشی لاتیکەوە دەستیان بۆ دەبرد. پەرستار، بۆرییەکی دەکردە نێو کیسەکەوە و لەڕێی بۆرییەکی دیکەوە، ئەوی بە کاترەکەوە جۆین دەکرد و بەمجۆرە، ئەو ماددانە دەچووە نێو سووڕی خوێنمەوە. بەتاڵبوونەوەی یەکێك لە کیسەکان، ٦٠ خولەك، یەکیان ٩٠ خولەك و یەکێکیشیان ٣٠ خولەکی دەبرد.

هەستم دەکرد خوێنبەرەکان دەشۆرێنەوە. لە زمانی پزیشکیدا بەم حاڵەتە دەڵێن میلۆسۆپرشن[10]، کە لەڕاستیدا سەرەکیترین دەرکەوتەی لاوەکی چارەسەری کیمیاییە. لەم حاڵەتەدا، بەرهەمهاتن و پێگەیشتنی خڕۆکە سورەکانی خوێن، دەوەستێت. چارەسەری کیمیایی، خوێن لاواز دەکات. لە خولی سێیەمی چارەسەری کیمیاییەکەدا، ڕێژەی هیماتۆکریتی[11] خوینی من لە ٢٥ کەمتر بوو. ئەمە لەحاڵێکدایە کە ڕادەی ئاسایی ئەو ٤٦ە. بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم کەم هێنانە، "ئەپۆژن"یان

---

[10]– Myelo Suppression: کەمبوونەوەی دروستبوونی خڕۆکە سوورەکانی خوێن، پلاکێتەکان و هەندێك لە خڕۆکە سورەکان لە لایەن مۆخی ئێسقانەوە.

[11]– Hematocrit: قەبارەی چڕی خڕۆکە سورەکانی خوێن پێی دەوترێ هیماتۆکریت. سادەترین ڕێگای دیاریکردنی کەمخوێنی (ئانمی) زانینی ڕادەی هیماتۆکریتی خوێنە.

بۆ دەنووسیم. ئەپۆژن، بەهێزکەری خڕۆکە سورەکانی خوێنە. لە دۆخی ئاساییدا، بەکارهێنانی ئەم ماددەیە دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشە لەگەڵ یەکێتی نێودەوڵەتی پاسکیلسواری و کۆمیتەی نێودەوڵەتی ئۆلۆمپیکدا، لەبەر ئەوەی بە یەکێك لە ماددە وزەبەخشەکان (دوپینگ) هەژمار دەکرێت. بەڵام ئێستا لەم بارودۆخەدا، بەکارهێنانەکەی کێشە نەبوو، لەبەر ئەوەی کە تاکە شتێك بوو کە منی بەزیندوویی دەهێشتەوە.

دەرمانەکانی چارەسەری کیمیایی، تەنیا خانە شێرپەنجەییەکانی لەنێو نەدەبرد، بەڵکو خانە ساغەکانیشی دەکوشت. ئەم دەرمانانە، پەلاماری مۆخی ئێسقان، ماسولکەکان، ددانەکان و رووپۆشی قورگ و سکی دەدا و وای لێدەکردم ئامادەی توشبوون بە جۆرەها هەوکردن بم. پوکەکانمی تووشی خوێنبەربوون دەکرد، ناو دەمم بوو بوو بە برین. ئیشتیاشم نەمابوو، ئەمەش خۆی کێشەیەکی گەورە بوو، چونکە ئەگەر پرۆتینی پێویست بە لەشم نەگەیشتبایە، لەشم نەیدەتوانی شانە خراپبووەکان نۆژەن بکاتەوە.

بەیانیان لە هەموو کاتەکانی دیکە ناخۆشتر بوو. بەرنامەی چارەسەری من کەمێك دوای نانی ئێوارە کۆتایی دەهات. هەوڵم دەدا شتێك بخۆم، لەسەر قەرەوێڵەکەم پاڵکەوم و سەیری بەرنامەی تەلەفزیۆن بکەم یان لەگەڵ هاوڕێیانمدادەمەتەقێ بکەم. لە شەودا دەرمانەکان کاریگەری خۆیان دادەنا و بەیانی رۆژی دواتر، بەتوندی تووشی هێڵنجدان دەبووم. لەم بارودۆخەدا کلوچەی کافتریای نەخۆشخانەکە تەنیا شت بوو کە

دەمتوانی بیخۆم. کەمێك سەیر بوو، بەڵام هەویری برژاو، دەنکە شەکر و سێوی شێوە مرەبا کە لەنێویدا بوو، هەستێکی خۆشیان بە من دەبەخشی.

جیم، هەموو بەیانییەك سەردانی دەکردم و لەگەڵ خۆی بەستەیەك لەو کلوچانەی بۆ دەهێنام، لە سەر لێواری قەرەوێڵەکە دادەنیشت و پێکەوە دەستمان بە خواردنیان دەکرد.. "ئۆچ"یش هەموو رۆژێك بەستەیەك لەوانی بۆ دەکڕیم، بەڵام کاتێك دەهات کە هیچ حەزم بۆ خواردنیان نەدەما.

لە ماوەی وەرگرتنی چارەسەری کیمیاییەکەدا، تەنیا بووم. پاش نەشتەرگەری مێشك، دایکم گەڕایەوە بۆ پلانۆ، مۆڵەتەکەی تەواو بوو بوو، نەشیدەتوانی مۆڵەتی بێ موچە وەربگرێت. هیچ حەزی نەدەکرد بڕوات. پێیوابوو کە هەر بوونی ئەو لەوێ، بەسوودە.

ئەو کاتەی قوتابی دواناوەندی بووم، دایکم لەو باوەڕەدا بوو کە ئەگەر لای من بێ، هیچ شتێکی خراپ روونادات. کاتی زستان و بەستن و خز بوونی شەقامەکان، کە دەهات بۆ پلانۆ، من و هاورێکانم دەچووین بۆ گەراجی رۆژهەڵات و خزاك (کالیسکەی خزینی سەر بەفر)مان بەدوای ئوتۆمبێلەکەوە دەبەست و بەرێدەکەوتین.

دایکیشم لەگەڵمان دەهات و لە نێو ئوتۆمبێلەکەوە سەیری دەکردین. هەمیشە دەیووت: "هەست دەکەم ئەگەر لێرە بم، هیچ رووداوێکت بۆ پێش نایەت." هەستی ئەو سەبارەت بە چارەسەری کیمیاییەکەشم هەر

بەو جۆرە بوو، بەڵام هیچ دەروی نەبوو...

ئۆچ جێی بەتاڵی دایکمی بۆ پڕ دەکردمەوە. ئەو هەموو ڕۆژێك لە ویسکانسەوە، کە زۆر لە نەخۆشخانەوە دوور بوو، دەهاتە لام. ئۆچ شارەزای کاریگەرییە هێواش و لەنێوبەرەکانی چارەسەری کیمیایی لەسەر دەروونی نەخۆش بوو، ئاخر باوکیشی هەر بە شێرپەنجە کۆچی دوایی کردبوو.. ئەو دەیزانی کە نەخۆش، هیوای خۆی لەدەست دەدات و پرۆسەی چارەسەرکەرییەکە بڕست بڕە، هەر بۆیە، هەمیشە بەشوێن ڕێگایەکەوە بوو کە زەین و هۆشی من پەرتەوازە بکات. ئۆچ منی فێری یاری کۆنکەن کرد. کارمان بوو بووە ئەوەی کە ڕۆژانە، لەگەڵ بیل و لیزا، چوار کەسی کۆنکەن بکەین. هەندێکجاریش کە زۆر وەڕز بووم، ڕۆژنامەی بۆ دەخوێندمەوە و نامەکانی کۆنترۆڵ دەکرد..

جارجارەش بۆ پیاسەکردن دەیبردم بۆ حەوشەی نەخۆشخانەکە، موغەزییەکەی بەدەستەوە دەگرت و لە هەموو بابەتێك قسەی دەکرد. هەر لە پاسکیلسوارییەوە بگرە تا دەگاتە پشکە ئەنتەرنێتییەکان.. ڕۆژێکیان دەمەو عەسر، پێکەوە باسی مردنمان دەکرد. وتم: "ئۆچ، ئامادەی ڕۆشتن نیم، هەڵبەت لە مردن ناترسم، بەڵام هێشتا بە قەناعەت نەگەیشتووم کە ناتوانم بەسەر نەخۆشییەکەدا زاڵ ببم.."

بەڵام چارەسەری کیمیایی، وەك ئەوە وایە بە زیندوویی بمریت. لەسەر قەرەوێڵەکە دەکەوتم و حسێبی کاتم لەدەستدا نەدەما.. هەندێکجار هەر حسێبی شەو و ڕۆژیشم لەدەست دەرەچوو، ئەم بارودۆخەشم هیچ

پێخۆش نەبوو. گێژ بوو بووم و کونترۆڵی هەموو شتێکم لەدەست دەرچوو بوو. ئوچ بەرنامەیەکی رۆژانەی دانا و بەمجۆرە، من دەمتوانی مەزندەی ئەوە بکەم کە چ کاتێکی رۆژە. بەیانیان بە پاکەتێك کلوچەوە دەهاتە لام و پێکەوە دەکەوتینە قسە، تا ئەوەی لە نێوەڕاستی گفتوگۆکەدا، خەو دایدەگرتم. چەناگەم دەکەوتە سەر سنگم و ئوچ، بە ماتەمات لە ژوورەکە دەچووە دەر.. دوای چەند کاتژمێر، ئوچ بە قاپێك سەوزەوە بۆ نانی نیوەڕۆ دەگەڕایەوە. هەندێکجاریش لە دەرەوەی نەخۆشخانە لەفەیەکی دەکڕی. دوای نانی نیوەڕۆ، کۆنکەنمان دەکرد، تا ئەوەی کە دیسان چاوەکانم قورس دەبوون، سەرم بەردەوام بەلادا دەهات و باوێشکم دەدا. ئوچ وەرەقەکانی کۆنکەنی هەڵدەگرت و بەهێواشی لە ژوورەکە دەچووە دەر.

بیل و لیزاش بۆ هەر خولێك، سەردانیان دەکردم و ئەوانی دیکەش، بەردەوام لە هاتوچۆدا بوون. سپۆنسەرە بەئەمەك و هاوڕێ خۆشەویستەکانم، بۆ چاوپێکەوتن سەرەیان دانابوو. ئوچ، بیل و لیزا گروپی سەرەکی بوون. هەموو شەوێك، هەر سێکیان خواردنی ئێوارەیان بۆ دەهێنام. هەندێکجار ئەگەر باردۆخم باش بووایە، پێکەوە دەچووین بۆ کافتریا و خۆم قاچی موغەزییەکەم هەڵدەگرت. هەڵبەت زۆرتر حەزم بۆ خواردن نەدەچوو، تەنیا دەمەویست لەو حاڵەتە وەك یەك و دووبارەیە دەربێم. پاشان کەمێك سەیری تەلەفزیۆنم دەکرد، تا ئەوەی خەو دایدەگرتم. ئەوانیش دەوروبەری کاتژمێر ٧، نەخۆشخانەیان جێدەهێشت و ئیدی بەدرێژایی شەو، تەنیا بووم.

بیل و لیزا و نۆچ، هەموو شەوێك پێکەوە نانی ئێوارەیان دەخوارد، ئەگەر کریس یان سکاتیش لە نەخۆشخانە بووایە، لەگەڵیان دەڕۆشتن. دوای خواردنی نانی ئێوارەش، بۆ جگەرە کێشان دەچوونە کافتریای هوتێل کانتربێری (Canterbury Hotel). هەموو دڵخۆشی من ئەوە بوو کە ئەو کاتانەی باش بووم، لەگەڵیان بڕۆم. شەوان کە دیانەویست بڕۆن، حاڵەتێکی مەزڵومانەم بەخۆمەوە دەگرت و دەمووت: "دیسان دەچن بۆ بەڕەڵایی"

کە لاتریس بۆ چارەسەری کیمیایی دەهاتە ژوورەکەم، هەرچەند نەخۆشیش بوومایە، لە جێی خۆم هەڵدەستام و چەند پرسیارێکم لێدەکرد: "چ دەرمانێکم پێدەدەی؟... ئەم تێکەڵەیە چییە؟" ئیتر دەمتوانی وەك پزیشکەکان لە تیشکە وێنەی سنگ تێبگەم و تێکڕای زاراوە و دۆزەکانی دژی هێڵنجدانم دەزانی. بە پرسیار "لاتریس"م دادەگرت، تەنانەت هەندێکجار ڕێنماییشم دەکرد، "کەمتر لەم دەرمانە بەکار بهێنە" یان "لەوی دیکەیان زیاترم بەرێ، هێڵنج دانەکەم کەمتر دەکات."

من تووشبوویەکی شێرپەنجەیی گوێڕایەڵ نەبووم. ڕەزا سووك، شەڕاشۆ و کەلەڕەق بووم. من شێرپەنجەم بە "حەرامزادە" ناودەبرد. شێرپەنجە وەك دوژمن و ڕکابەری من بوو. کاتێك کە لاتریس دەیووت: "پێنج پەرداخ ئاو بخۆرەوە، من پانزە پەرداخ ئاوم دەخواردەوە، تا ئەو رادەیەی کە ورگم بای دەکرد".

چارەسەری کیمیایی، سەربەخۆیی و ئازادی کردەوەی لە من زەوت کردبوو، ئەمەش بۆ من سوکایەتی ئامێز بوو. بەدرێژایی شەو و ڕۆژ بتلێك ئاوم پێهەڵواسرابوو، من حەزم نەدەکرد کە ئیختیاری من لەدەست پەرستار و پزیشکەکاندا بێت. جۆرێك ڕەفتارم دەکرد کە وەك بڵێی ڕۆڵێکی چالاکم لە پرۆسەی چارەسەرییەکەدا هەیە. بەوردی تاوتوێی پشکنین و وێنەکانی رادیۆلۆژیم دەکرد و هێندەم پرسیار لە لاتریس دەکرد کە بەدەستمەوە وەزاڵە دەهات.

"لاتریس، ئەمڕۆ پەرستارەکانم کامانەن؟"

"لاتریس، ناوی ئەم دەرمانە چییە؟"

"لاتریس، ئەم دەرمانە چ کاریگەرییەکی هەیە؟"

بەردەوام پرسیارم لێدەکرد، وەك بڵێی یەکێك لە بەرپرسانی نەخۆشخانە بم. لاتریس، بەرنامەی چارەسەری کیمیایی منی لەگەڵ پەرستارەکانی بەشەکەدا هەماهەنگ کردبوو: ئەو خشتەی کاتبەندی و دەرمانە دژە هێڵنجەکانی ڕێکدەخست و کونترۆڵی نیشانەکانی دەکرد.

من هەموو شتێکم خستبووە ژێر چاودێرییەوە و ڕێك دەمزانی کە چ دەرمانێکم لە چ کاتێکدا پێبدەن، هەستم بە هەر چەشنە گۆڕانێکی بچووك لە بەرنامەکەمدا دەکرد و لێم ون نەدەبوو.

لاتریس، زۆر ئارامگری پیشان دەدا.

"لاتریس، چ دۆزێك، بەکار دەهێنێت؟"

"لەسەر چ بنەمایەك؟"

"دوێنیش هەر ئەم دەرمانەت بەكار هێنا ؟"

"بۆچی ئەمڕۆ دەرمانێكی دیكە بەكار دەهێنیت؟"

"لاتریس، كەی دەست پێدەكەیت؟"

"لاتریس، كەی تەواو دەبێت؟"

بەردەوام سەیری كاتژمێرەكەی دەستم دەكرد و چاوم دەبڕیە كیسە موغەزییەكان. خێرایی بەتاڵ بوونەوەی موغەزییەكانم رادەگرت، كاتی تەواو بوونەكەیم تا دوا چركە دەزانی؟"

بەتێپەڕبوونی كات، من و لاتریس سەری گاڵتە كردنمان پێكەوە كرایەوە. پێم دەووت، تۆ بەهۆی لاساری و كەلەڕەقییەوە، دەرمانی دژە هێڵنجدانم پێنادەیت. ئاخر، تەنیا شتێك كە دەبووە هۆی ئەوەی كە لەهەمبەرە كاریگەرییەكانی چارەسەری كیمیاییدا خۆم راگرم، ئەم دەرمانە دژە هێڵنجانە بوون. بەڵام هەر چوار كاتژمێرێك تەنیا دەمتوانی یەكجار بەكاریان بهێنم و بەردەوام لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵ ئەودا مشتومڕم بوو.

لاتریس دەیووت: "ناتوانم لەوە زیاترت پێبدەم، سێ كاتژمێر پێش ئێستا پێمدای.. دەبێ كاتژمێرێكی دیكەش خۆت راگری."

—"ناخۆشی مەكە. خۆشت دەزانی كە دەتوانی، بەڵام حەز ناكەی ئەم كار بكەیت."

–ناوە ناوە تووشی هێڵنجدان دەبووم و وەها دەڕشامەوە کە پێموابوو ئیدی، کۆتاییمە. کاتێك بارودۆخم باشتر دەبوو، بە تەوسەوە بەوم دەووت: "زۆر باشتر بووم."

–هەندێکجار، خواردنەکان و بەتایبەت خواردنی بەیانی، تێکی دەدام. هەر لەبەر ئەمە بەوانم وت، چیتر خواردن نەهێننە ژوورەکەم. بەیانییەك چاوم بڕییە ئەو قاپەی کە هێلکەی تێدابوو، بە لینجایی دەهاتە پێش چاوم، نانە برژاوەکەش لە توێژاڵێکی گەچ دەچوو. لەپڕ تەقیمەوە و وتم: "ئەم زبڵ و خاشاکە چییە؟! لاتریس، سەیرکە، بزانم خۆت دەتوانی ئەمە بخۆیت؟ دەکرێ کەسێك لە دەرەوە شتێکم بۆ بکڕێت؟" لاتریس زۆر ئارام و لەسەر خۆ وتی: "لانس، چیت حەز لێیە بیخۆ." لاتریس، تەنانەت ئەو کاتانەش کە زۆر بێ واز بووم، سەری دەخستە سەر سەرم و بە حاڵەتێکی دڵسۆزییەوە دەیووت: "هەر لەبنەڕەتدا نەکا هۆکارەکەی منم، بەهۆی منەوە بارودۆخت تێکدەچێت؟"

وردە بزەیەکم بۆ دەکرد و پاشان دیسان بارودۆخم خراپ دەبوو.. بەرەبەرە خەریکبوو دەبووین بە هاوڕێ. لە نێوان جارەکانی چارەسەری کیماییدا، بۆ ماوەی دوو هەفتە دەگەڕامەوە بۆ ئاستین تا ماوەی پشووی دوای وەرگرتنی چارەسەری کیمیاییەکەم لەوێ بگوزەرێنم. لە ماوەی ئەو دوو هەفتەدا، لاتریس بەردەوام پەیوەندی پێوە دەکردم تا بزانێ بارودۆخم چۆنە و لەوە دڵنیا ببێتەوە کە وەك پێویست، شلەمەنی دەخۆمەوە.

چارەسەری کیمیایی زیان بە مێزەڕۆ دەگەیەنێ، هەر لەبەر ئەمە، لاتریس بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم شلەمەنییەکان بخۆمەوە. شەوێك کە تەلەفۆنی کرد، خەریکی یاریکردن بووم بە دیارییەك کە کۆمپانیای ئۆکلی بۆی ناردبووم. کۆمپانیای ئۆکلی، ئوتۆمبیلێکی کۆنتڕۆڵی بۆ ناردبووم کە لە تیتانیۆم دروست کرابوو، خێراییەکەی ٧٠ میل لە کاتژمێردا بوو.

لاتریس وتی: "ئەمە چ دەنگێکە؟" وتم: "لە گەراجم." وتی: "لە گەراج چی دەکەی؟" وتم: "خەریکم بە ئوتۆمبیلێکی یاری منداڵان، وازی دەکەم." وتی: "دەبێ وا بکەیت!"

ڕۆژێکیان لەسەر پێستم، هەستم بە چەند پەڵەیەکی رەنگ سپی کرد. وادیاربوو شوێنەواری سووتانی چارەسەری کیمیاییەکە بوو. دەرمانەکان، شانەکانی لەشی منیان لە ناوەوە سووتاندبوو، ئەم پەڵە کەم ڕەنگانەشی لەسەر لەشم دروست کردبوو. ئیتر چووبوومە نێو قۆناغی سێیەمی چارەسەری کیمیاییەوە و ئەو لانسەی پێشوو نەبووم. لەچاو یەکەم ڕۆژ کە چارەسەرییەکەم دەستی پێکردبوو، لە رەنگ و ڕوو کەوتبووم. ڕۆژانە، بە شەلەشەل خۆم کێش دەکرد تا بڵێم کەمێك وەرزشم کردووە. دەتووت لەشم، بەرەبەرە دەپووکێتەوە: ماسولکەکانم بچووك و شل بوو بوونەوە.

بە خۆم وت: "نابێ بەزێن و باڵام تێکبچێت." بەڵام سەرەڕای هەوڵەکانم، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کێشم کەمتر دەبوو. لەشم هێندەی چەوری تێدا نەبوو کە بیسووتێنێ، بەڵام ئەو ژەهرانەی کە بەهۆی چارەسەری کیمیاییەوە چووبوونە نێو لەشمەوە، زەڕە زەڕە منی دەپووکاندەوە. بە

نیگەرانییەوە دەمووت: "لاتریس، خەریکە کێشم دادەبەزێ، دەبێ چی بکەم؟ سەیری ماسولکەکانم بکە چییان بەسەر هاتووە.. من دەبی پاسکیلسواری بکەم."

لاتریس، بە سەبر و حەوسەڵەوە دەیووت: "لانس، ئەمە بەهۆی چارەسەرە کیمیاییەکەوەیە. بتەوێ و نەتەوێ، کێشت دادەبەزێت. ئەو نەخۆشانەی چارەسەری کیمیایی وەردەگرن، هەموویان کێشیان دادەبەزێت."

چیتر نەمدەتوانی لە قەرەوێڵەکەمدا بخەوم، کاتێك خۆم لە نێو چەرچەفەکاندا دەبینی، خۆم وەك شتێك دەهاتە پێش چاو کە ئاوی دەریا، لایدابێتە رۆخی دەریا.

"لاتریس، من دەتوانم وەرزش بکەم؟"

"لاتریس، ئێوە لێرە وەرزشگاتان نییە؟"

-"لانس ئێرە نەخۆشخانەیە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، بۆ ئەو نەخۆشخانەی کە ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانە دەخەوێندرێن یان کەسانی وەك تۆ، پاسکیلی جێگیرمان هەیە."

خێرا وتم: "دەتوانم بەکاریان بهێنم؟"

لاتریس، لە بارەی ئەم بابەتەوە راوێژی لەگەڵ نیکۆلز کرد، بەڵام نیکۆلز وەڵامی نەرێنی دایەوە. لەبەر ئەوەی کە سیتسمی بەرگری لەشم، زۆر لاواز بوو بوو بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی کاری قورس بکەم.

لاتریس سەرەڕای تووڕەیی ڕواڵەتیانەی، لەم هەستەی من تێدەگەیشت، دوانیوەڕۆیەك دەبوو MRI لە مێشکم بگرن، بەڵام هەموو ئامێرەکان لە ڕۆژی پێشووەوە گیرابوون، بۆیە ناچار بوون، من بنێرن بۆ نەخۆشخانەیەکی منداڵان کە لەو نزیکانە بوو. ئەم دوو بینایە لەڕێی تونێلێکی ژێر زەمینییەوە بەیەکترەوە دەبەسترانەوە کە درێژییەکەی نزیکەی میلێك بوو. زۆرتر نەخۆشەکانیان بە ئەمبۆلانس دەگواستەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیە یان ئەوەی کە بە عارەبانە و لەڕێی، ئەو ڕێگا ژێر زەمینییەوە دەیانبردن.

بەڵام من حەزم دەکرد بەپێ بچم بۆ ئەوێ. هەر بۆیە کاتێك کە پەرستارێك بە عارەبانەوە هات، وتم: "بە هیچ شێوەیەك لەسەری دانانیشم." ئێمە بەپێ دەڕۆین، تەنانەت ئەگەر ناچار بم، بەدرێژایی شەو بەڕێدا بڕۆم. لاتریس هیچی نەوت، تەنیا وەك نیشانەی پشتیگیری کردنی من، سەری لەقاند. پەرستارەکەش، قاچی موغەزییەکەی پاڵنا و ڕێکەوت.

بە کێشەکێش بە تونێلەکەدا ڕێم دەکرد. وەك پیرە پیاو چەمابوومەوە. چوون و هاتنەوەمان نزیکەی کاتژمێرێکی خایاند. کاتێك لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵ کەوتم، هێزم لەبەر بڕابوو، لەشیشم سەر ئارەق کەڕابوو، بەڵام سەرکەوتوو بووم. ڕۆشتن بۆ من بوو بووە گەورەترین بەرەنگار بوونەوە. لە ڕۆژی پێنجەمی چارەسەری کیمیاییەکەدا، چیتر تەنانەت نەمدەتوانی لە قاوشەکەشدا پیاسە بکەم. بەدرێژایی ڕۆژ لەسەر قەرەوێڵەکەم خەوتبووم بۆ ئەوەی شەو وزەم تێدا بێ تا بچمەوە بۆ

ماڵەوە. بەیانی ڕۆژی دوو شەممە، یەکێك لە خزمەتکارەکان بە عارەبانەوە هات تا من بەرێ بۆ هۆڵی چاوەڕوانی. بەڵام من ڕازی نەبووم، بە تووڕەییەوە پاڵێکم بە عارەبانەکەوە نا و ووتم: "هەرگیز شتی وا ناکەم، خۆم دێم."

ڕۆژێك، پیاوێکی فەڕەنسی بە بتڵێك ئارەقی ٥٠٠ دۆلارییەوە سەردانی کردم. چاوم تێبڕیبوو، کەمێك هۆشم هەبوو، هێندە هێڵنجم دەدا کە نەمدەتوانی هیچ کاردانەوەیەك پیشان بدەم. بەڵام هێندەم هۆش هەبوو کە کارەکەی ئەوم بەلاوە سەیر بێت. ئاخر ئەو بە چ ئەقڵ و لۆژیکێك، خواردنەوەیەکی کحولی گران بەهای بۆ تووشبوویەکی شێرپەنجە هێنابوو.

ئەو کەسە بەڕێز ئالن بۆندو (Alain Bondue)، بەڕێوەبەری ڕێکخراوی پاسکیلسواری کوفیدیس بوو، هاتبوو تا بەجۆرێك ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات. بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی قسەی لەگەڵ بکەم. لەو کاتەدا لەخولی سێیەمی چارەسەری کیمیاییەکەمدا بووم و تەواو ڕەنگم زەرد هەڵگەڕابوو، هەروەها دەوروبەری چاوەکانیشم، ڕەش بوو بوون. هەموو قژی سەرم و برۆکانم وەریبوو. چەند خولەکێك، لە تەنیشت قەرەوێڵەکەم وەستا و بەڵێنی دا کە تیمەکەی ئەوان، لە هیچ یارمەتییەك بۆ من دریغی نەکات و پاشان ژوورەکەی جێهێشت.

"لانس، ئێمە تۆمان خۆشدەوێ و بەڵێن دەدەم پشتگیریت بکەین."

ئەمەی وت و حواحافیزی کرد، بەڵام کاتێك ژوورەکەی جێهێشت، بە ئاماژە، بیلی تێگەیاند کە شوێنی کەوێت. بیل لەگەڵ ئەودا چووە

ڕاڕەوەکە. لە دەرەوەی ژوورەکە، بە تووڕەییەوە بە بیلی وتبوو کە دەیەوێ لە پەیوەندی لەگەڵ هەندێك بابەتی کارکردنەوە لەگەڵ مندا قسە بکات و دەبێ بچنە شوێنێکی بێدەنگ.

بیل و بۆندو، لەگەڵ یەکێك لە دۆستانی بەناوی پاول شێروین ( Paul Sher-wen) کە بە زمانی فەڕەنسی قسەی دەکرد، لە ژووری کۆنفراسی هوتێلی بەرامبەر نەخۆشخانەکە پێکەوە قسەیان کرد. پاول قسەکانی بۆندوشی وەردەگێڕا. ئەو بە زمانی فەڕەنسی بە بیلی وتبوو کە بەوپەڕی داخەوە، کوفیدیس ناچارە بە گرێبەستەکەی مندا بچێتەوە. گرێبەستی من لەگەڵ ئەو یانەدا، بە بڕی دوو ملیۆن دۆلار و نیو و بۆ ماوەی دوو ساڵێش بوو، بەڵام چیتر ئەوان نەیاندەتوانی گرێبەستەکە وەك خۆی بهێڵنەوە.

بیل کە بە بیستنی ئەم قسانە گێژ بوو بوو، سەرێکی بۆ بادابوون و وتبووی: "ببورە، لە مەبەستەکەتان تێنەگەیشتم؟" بیل وتبووی مەگەر ئێوە بە بەرچاوی میدیاکانەوە ڕاتانەگەیاند کە پشتگیری لانس دەکەن. ئێستا و ڕێك لە ناوەڕاستی چارەسەری کیمیایی ئەودا، کاتی قسە کردن لەسەر گرێبەست نییە.

بۆندو لە وەڵامدا وتبووی: "ئێمە لانسمان خۆش دەوێ و ئاگامان لێی دەبێت. بەڵام ئێوەش دەبێ لە ئێمە تێبگەن، ئەمە بابەتێکی کولتورییە. خەڵکی فەڕەنسا لەم بابەتە تێناگەن کە کەسێك کار نەکات، بەڵام لە پای ئەوەدا موچە وەرگرێت."

بیل تووشی سەرسوڕمان بوو بوو: "هیچ باوەڕ ناکەم!" بۆندو وتبووی لە یەکێك لە ماددەکانی گرێبەستەکەدا هاتووە کە لایەنی دووەمی گرێبەستەکە دەبێ پشکنینی پزیشکی بۆ بکرێت. بێگومان من لە بارودۆخێکدا نەبووم کە پشکنینی پزیشکیم بۆ بکرێ و لەبەر ئەم هۆکارە، کۆفیدیس دەیتوانی گرێبەستەکە هەڵوەشێنێتەوە. ئەوان دەیانەویست بەپێی دۆخە نوێکە، گرێبەستێکی نوێ بنووسن. لەڕاستیدا ئەوان بەشێك لە گرێبەستەکەیان قبوڵ بوو، بەڵام هەموویان قبوڵ نەبوو. ئەگەر من مەرجە نوێکانم قبوڵ نەکردبایە، ئەوان پشکنینی پزیشکیان بۆ دەکردم و کۆتاییان بە گرێبەستەکە دەهێنا. بیل لە جێی خۆی بەرز بوو بۆوە و جنێوێکی بە بۆند دابوو. کابرای داماو لەم ڕەفتارەی ئەو شۆك بوو بوو.

"هیچ باوەڕ ناکەم لە وەها دۆخێکدا، ئەم هەموو ڕێگایەت بڕیبێ تا داوا لە من بکەی ئەم قسە پڕوپوچانە بە لانس بڵێم.."

بیل زۆر تورە بوو بوو، هەڵبەت نەك لەبەر ئەوەی کە کوفیدیس بیەوێ خۆی لە بەڵای ئەم گرێبەستە رزگار بکات، نا.. ئەمە مافی ڕەوای ئەوان بوو. ئەو لەبەر ئەمە تووڕە بوو بوو کە ئەوان لەم بارودۆخەدا بیریان لەم کارە کردبۆوە. کوفیدیس، بە هەموو دنیای ڕاگەیاندبوو کە پشتگیریم دەکات، بەڵام لە پشت دەرگا داخراوەکاندا، شتێکی دیکە لەئارادا بوو. بیل بەرگری لە من کردبوو، زۆر ڕاشکاوانەش بەوانی وتبوو کە لە وەها دۆخێکدا، بەهیچ شێوەیەك، بابەتەکە لەگەڵ مندا باس ناکات.

"من کاری لەو شێوەیە ناکەم. هەر کارێکتان پێ باشە، ئەو کارە

بکەن." بۆندوش دیسان دووبارەی کردبووەوە کە: "کەواتە لەم حاڵەتەدا، دەبێ پشکنینی پزیشکی بۆ بکەین."

بیل لە وەڵامدا وتبووی: "کەواتە دەتانەوێ پزیشکێك بنێرن تا پشکنینی بۆ ئەو بکات؟"

-"باشە، ڕەنگە ناچار بین ئەم کارە بکەین."

"زۆر باشە، لەم حاڵەتەدا منیش هەموو میدیاکان ئاگادار دەکەم."

بۆندو دیسان دووبارەی کردبووەوە کە ئەوان تەنیا هەندێك لە مەرجەکانی گرێبەستەکەیان قبول نییە. بیل، کەمێك هێواش بوو بووەوە و وتبووی، ئێوە سەیری ڕواڵەتی ئەو مەکەن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بارودۆخی باشتر دەبێت. بەڵام بۆندو لەسەر قسەی خۆی سوور بوو. ئەم گفتوگۆیە نزیکەی دوو کاتژمێری خایاندبوو، دواجاریش بە هیچ ئەنجامێك نەگەیەشتبوون. ئاخرەکەی بیل لە شوێنی خۆی هەستابوو، بەوانی وتبوو: "بە هەمووان ڕادەگەیەنم کە ئێوە ئەوتان بەتەنیا جێهێشت." بەمجۆرە کۆتایی بە دانیشتنەکە هێنابوو.

بیل گەڕایەوە بۆ نەخۆشخانە. سێ کاتژمێرێك دەبوو کە بەجێی هێشتبووم، من تێگەیشتبووم کە شتێك بووە. هەر بۆیە، لەگەڵ ئەوەی کە دەرگای ژوورەکەی کردەوە، وتم: "چی بووە؟"

"هیچ نییە، نیگەران مەبە."

بەڵام بە ڕوخساریدا دیاربوو کە زۆر نیگەرانە، مەزندەی ئەوەم دەکرد

که دەبێ چی روویدابێت.

"چی بووە؟"

–"نازانم بڵێم چی. کوفیدیس دەیەوێ گۆڕانکاری لە گرێبەستەکەدا بکات و ئەگەر ناچاریش بن، دەیانەوێ پشکنینی پزیشکی بۆ تۆ بکەن."

–"زۆر باشە، ئێمە دەبێ چی بکەین؟"

–خۆشم دەمزانی کە بۆندو بۆ هەواڵپرسینی من نەهاتووە. هەستم دەکرد کە ئەو بۆ بڕیاردان هاتووە بۆ نەخۆشخانە ئەگەر بارودۆخم باش بووایە، گرێبەستەکە وەك خۆی دەمایەوە. بەڵام ئەگەر ناساز بوومایە، ئەویش سیاسەتی رێکنەکەوتنی دەگرتە پێش و دانوستاندنی دەکرد، یان ئەوەی کە گرێبەستەکەی هەڵدەوەشاندەوە. لەڕاستیدا هاتنی ئەو بۆ نەخۆشخانە، تەنیا بۆ سیخوڕی کردن بوو: "بزانێ ئارمێسترانگ، دەمرێ یان نا؟" بۆندوش سەیرێکی منی کردبوو، بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە دوایین هەناسەکانم هەڵدەکیشم.

بیل وتی: "زۆر بەداخم کە ئەم هەواڵەم پێڕاگەیاندی."

بەڵام شتانی زۆر گرنگتر لە کوفیدیس هەبوو کە بیریان لێبکەمەوە. بەهەڵە تێمەگەن، بێگومان منیش نیگەرانی پرسە داراییەکان بووم و لەوەی کە ئەوان، ئەم کاتەیان بۆ گفتوگۆ هەڵبژاردبوو، بەڵێنەکانیشیان نەبردبووە سەر، نیگەران بوو بووم. بەڵام لە لایەکی دیکەوە کێشەیەکی گرنگترم هەبوو.. رشانەوە بەرۆکی بەر نەدەدام.

بیل وتی: "ئێمە ئەم بابەتە دوا دەخەین." بیل پێیوابوو ئەگەر ئەم بابەتە تا مانگی شوبات دوا بکەوێ، تا ئەو کات، بارودۆخم باشتر دەبێ و دەتوانم خۆم بۆ پشکنینە پزیشکییەکە بگرم. هێندەم هێلنج دەهات هیچ گوێم بە قسەکانی ئەو نەدەدا. حەزم نەدەکرد لەوە زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بدوێین.

لە ماوەی هەفتەکانی دواتردا، کوفیدیس بەردەوام شوێن ئەم بابەتە دەکەوت. ئەوان سەبارەت بەم بابەتە زۆر جددی بوون و هیچ کێشەیەکیشیان بۆ پشکنینی پزیشکی نەبوو. دەیانتوانی پزیشکی خۆیان لە فەڕەنساوە بنێرنە نەخۆشخانە و هەموو گرێبەستەکە هەڵوەشێننەوە. من سەبارەت بەم بابەتە، هیچ قسەم لەگەڵ بیل نەدەکرد، چونکە لە خراپترین بارودۆخدا بووم. دواجار، ڕۆژێك بیل لە تەنیشتم دانیشت و وتی: "لانس، ئەوان زۆر جددین، ئێمەش جیا لەوەی کە بە مەرجەکانی ئەوان ڕازی بین، هیچ ڕێگایەك شك نابەین."

دواجار کوفیدیس یەك لەسەر سێی گرێبەستی دوو ساڵەی یەکەمی لەئەستۆ گرت و خاڵێکیشی بۆ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨، بۆ خۆی لەبەر چاو گرت.

هەستم دەکرد دەنگی متمانەیان بە من نەداوە. ئەوان پێیان وابوو من دەمرم. من پەیامی کوفیدیسم پێگەیشت: "من ڕوو لە مردن بووم."

خۆش ئەوە بوو کە تا کات تێدەپەڕی، زیاتر بەرەو چاکبوونەوە دەچووم، بەڵام وەزعم خراپتر دەبوو. هەندێکجار بارودۆخم هێندە خراپ

بوو، تەنانەت نەمدەتوانی قسەش بکەم. ئەوەندە نەخۆش بووم نەمدەتوانی هیچ بخۆم، سەیری تەلەفزیۆن بکەم، نامەکانم بخوێنمەوە یان تەنانەت بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ دایکمدا بکەم. دوانیوەڕۆیەك دایکم لە شوێنی کارەکەیەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، بە بێتاقەتییەکەوە وتم: "دایکە دوایی پەیوەندیت پێوە دەکەم." ئەو ڕۆژانەی کە وەزعم زۆر خراپ بوو، بەتانییەکم لە خۆمەوە دەپێچا و دڵ تێکەڵهاتن و گەرمای بەتینی تای لەشم تەحەمول دەکرد.

کاریگەرییەکانی چارەسەری کیمیایی بەڕادەیەك بوو کە شتێکی ئەوتۆم لەو ڕۆژانە بیر نایاتەوە، بەڵام هەر ئەوەندە دەزانم کە بەرەبەرە خەریك بوو بەسەر شێرپەنجەکەدا زاڵ دەبووم. هەموو ڕۆژێك پزیشکەکان بە دوایین ئەنجامەکانی پشکنینی خوێنەوە دەهاتنە ژوورەکەم، ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ئەنجامەکان ڕوو لە باشی بوو. لە نەخۆشی شێرپەنجەدا ئاماژەندەرە خوێنییەکان پیشاندەری هەموو شتێکن. ئێمە بەدواداچوونمان بۆ هەر بەرزی و نزمییەکی بچووکیش دەکرد. بەرزبوونەوە کەم یان دابەزینی کەمی ئاماژەدەرەکانی (HCG یا AFP)، بە واتای پەرەسەندن یان باشبوونی نەخۆشییەکە بوو.

ڕەقەم و ژمارەکان بۆ من و پزیشکەکان گرنگییەکی زۆریان هەبوو. بۆ نموونە، لە ڕێکەوتی دووی ئۆکتۆبەرەوە کە زانیم تووشی شێرپەنجە بووم، تا ١٤ی ئۆکتۆبەر کە زانیم شێرپەنجەکە گەیشتۆتە مێکشم، ڕادەی (HCG) خوێنم لە (٤٩.٦٠٠)ەوە گەیشتە (٩٢.٣٨٠). لە ڕۆژانی هەوڵی

چارەسەرییەکەدا، کاتێك پزیشکەکان دەهاتن بۆ بینیم زۆر جددی بوون، لەڕاستیدا ئەوان دەیانەویست لێکدانەوەکەیان دوابخەن.

بەڵام بەرەبەرە رازیتر دیاربوون: ئامازەدەرەکانی لوو، کەم بوو بوونەوە. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەکان کەمتر دەبوونەوە. ژمارەکان بەشێوەیەکی وەها خێرا کەم بوونەوە کە پزیشکەکان بەلایەنەوە سەیر بوو. خشتەیەکم لە ئامازەدەرە خوێنییەکان ئامادە کرد. لە ماوەی خولێکی سێ هەفتەیی لە مانگی نۆڤەمبەردا، ژمارەکان لە ٩٢,٠٠٠وە کەمبوونەوە بۆ نزیکەی ٩٠,٠٠٠. نیکۆلز وتی: "چارەسەرە کیمیاییەکە دەوری باشی هەبووە." من براوەی گڕەپانەکە بووم. ئەگەر بمویستبایە چاك ببمەوە، ئەمە تاکە رێگا بوو کە دەبوو هێرش بەرم، رێك وەك پێشبرکێی پاسکیلسواری. نیکۆلز پێی وتم: "پێش بەرنامەکە کەوتوویتەوە." ئەو ژمارانە گرنگترین ڕووداوی هەموو ڕۆژێکی من بوون، لەڕاستیدا بۆ من حوکمی کراسی زەردیان هەبوون. لە پێشبڕکێکانی تۆردۆ فرانس، رێبەری گرووپ، کراسی زەرد لەبەر دەکات تا لەوانی دیکە جیا بکرێتەوە.

ئیتر هاوشێوەی راگەیاندنی کاتژمێر لە پێشبڕکێکانی تۆردۆ فرانس، سەیری رزگاربوون لە نەخۆشییەکەم دەکرد. کە سەیری ئەو پاسکیلسوارانەم دەکرد کە لە پشت سەرمەوە دەهاتن، تینم وەبەردەهاتەوە و لە هەموو کۆنترۆڵ پۆینتێکیشدا، بەرپرسی تیمەکە دەهاتە پشت رادیۆ و رایدەگەیاند: "٣٠ چرکە، لەوانی دیکە

لەپێشتری.."، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە خێراتر پایدەر لێبدەم. بۆ وەڵامی پشکنینەکانم، ئامانجێکم دیاری دەکرد، بۆ نموونە نیکۆلز پێی دەووتم، هیوادارم لە پشکنینی دواتردا، ٥٠٪ کەمبوونەوەت هەبێت. من بیر و هۆشی خۆم لەسەر ئەو ژمارەیە چڕ دەکردەوە، وەك بڵێی بەم کارە دەمتوانی ئەو ژمارەیە بەدەست بهێنم.. پاش ئەنجامی پشکنینەکە، نیکۆلز دەهاتە لام و دەیووت: "ئەوان بۆ نیوە کەم بوونەوە." من هەر بەڕاستی هەستم دەکرد شتێکم بردۆتەوە. ڕۆژێکیان هات و وتی: "یەك لەسەر چواریان ماون."

هەستم دەکرد لەم ململانێیەدا، من براوەی گۆڕەپانەکەم. تواناکانی پاسکیلسواریم دووبارە سەیانهەڵدابوەوە. حەزم دەکرد قاچی شێرپەنجە بشکێنم، ڕێك وەك ئەوەی کە قاچەکانی پاسکیلسوارەکانم لە هەورازەکاندا تێکدەشکاند.. من زۆر لە شێرپەنجە دوور کەوتبوومەوە. ڕۆژێك بە "کوین"م وت: "شێرپەنجە کەسێکی گونجاوی هەڵنەبژارد، کاتێك بە شوێن کەسێکدا دەگەڕا تا لە لەشی ئەودا درێژە بە ژیانی خۆی بدات، هەڵەی کرد کە منی هەڵبژارد، هەڵەیەکی گەورە!"

ڕۆژێك دکتۆر نیکۆلز هاتە ژوورەکەم و ژمارەیەکی نوێی بۆخوێندمەوە: (HCG) خوێنم گەیشتبووە ٩٦.

دوایین و ژەهراویترین بەشی چارەسەریەکەم مابوو، تاڕادەیەك مەترسییەکە نەمابوو. لە نێوان خولەکانی چارەسەری کیمیاییدا چووم بۆ تەکساس و بەرەبەرە توانای لەشم باشتر دەبوو، ئیدی دەمتوانی بڕۆم.

دڵم بۆ هەوای تازە و وەرزش کردن لێی دەدا. هاوڕێکانم هیچ بەڕووی خۆیاندا نەدەهێنا کە لاواز بووم. ئەو هاوڕێیانەی لە دەوروبەرە سەردانیان دەکردم، وادیاربوو بە بینینی روخساری رەنگ پەڕیو و سەری رووتاوەم، شۆك دەبوون، بەڵام ئەوانیش هیچیان نەدەووت. کریس و ئەیدی و ئێریك، بۆ ماوەی هەفتەیەك لە ماڵی ئێمە مانەوە. ئەوان خواردنیان بۆ دروست دەکردم و هەندێکجاریش بۆ ڕێپێوانێکی کورت یان پاسکیلسواری پێکەوە دەچوینە دەرەوە.

لە ماڵ دەردەچووین و بە جادەیەکی قیرتاوی پێچاوپێچدا سەردەکەوتین کە دەیگەیاندینە مۆنت بۆنەل (Mount Bonnell). پێشتر هیچکام لە هاوڕێکانم لەگەڵ من پێیان نەدەکرا، بەڵام ئێستا زۆر هێواش دەڕۆشتین. من تەنانەت لە جادەیەکی تەختیشدا هەناسەبڕکێم پێدەکەوت.

هێشتاش باوەڕم بەوە نەکردبوو کە چارەسەری کیمیایی کاریگەری لەسەر لەشم داناوە. من بەدڵنیایی و بوێرییەکی تەواوەوە بەرەنگاری شێرپەنجە بوومەوە و لە هەر قۆناغێکی چارەسەری کیمیاییدا، دەمبینی کە چۆن توانا جەستەییەکانم لەدەست دەدەم، بەڵام نەمدەزانی ئەوندە بێ هێزی کردووم، تا ئەوەی ڕۆژێك، لە بەردەم حەوشەی ماڵێکدا، لەهۆش خۆم چووم.

دکتۆر نیکۆلز پاسکیلسواری لێ قەدەغە نەکردبووم، بەڵام دەیووت: "ئێستا کاتی ئەوە نییە بتەوێ هێزەکانت نوێ بکەیتەوە." نیکۆلز

بەردەوام دەیووت فشار بۆ لەشت مەهێنە، بەڵام من گوێم بە قسەکانی ئەو نەدەدا. لەوە دەترسام کە بەهۆی چارەسەرە کیمیاییەکەوە هێندە لاواز ببم ئیدی هەرگیز نەگەڕێمەوە سەر بارودۆخی پێشووم. لەشم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاوازتر دەبوو.

هەر کات بارودۆخم باش بووایە بە کوین و بارتم دەووت: "با بچینە دەر پاسکیلسواری بکەین." لە هەوەڵەوە، ڕێگایەکی دیاریکراومان نەبوو، تەنیا ٣٠ بۆ ٥٠ میل پایدەرمان لێدەدا. خۆم بە کەسێکی ماندوونەناس دەبینی. سەرم دادەخست و بەدرێژایی جادەکە پایدەرم لێدەدا. بەڵام ڕاستی شتێکی دیکە بوو، جوڵەکانم سست و لاواز بوو بوون.

لە کۆتایی خولەکانی چارەسەری کیمیاییدا، نزیکەی نیو کاتژمێر پاسکیلسواریمان دەکرد. هەر لە دەوروبەری ماڵەوە سووڕێکمان لێدەدا و بە خۆم دەووت، تا ئەو کاتەی ئەم کارە دەکەم، بەژن و ڕواڵەتم ناشێوێت. بەڵام دوو ڕووداوم بۆ پێشهات کە تێیگەیاندم لە ڕووی جەستەییەوە چەندە لاواز بووم. ڕۆژێك عەسر بوو، لەگەڵ کوین و بارت و باربارای دەستگیرانی بارت، چووینەدەر. لە نێوە ڕێدا گەیشتینە نزمە هەورازێك. لای خۆم وام بیرم دەکردەوە کە منیش وەك ئەوانی دیکە پایدەر لێدەدەم، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە هاوڕێکانم، موراعاتی منیان دەکرد. لەڕاستیدا ئەوان هێندە هێواش پایدەریان لێدەدا کە ناوە ناوە هاوسەنگیان تێکدەچوو. هەندێکجار کە بەڕێکەوت پێشم دەکەوتن، بە نیگەرانییەوە لە پشتیانەوە دەمووت: "ئێوە خەریکە من دەکوژن." ئەوان

زۆر وریای ئەوە بوون کە ماندووم نەکەن. بۆیە، من هەر هیچ هەستم نەدەکرد کە بە چ خێراییەك دەڕۆین و پێموابوو منیش وەك ئەوانی دیکە پایدەر لێدەدەم.. لەپڕ بینیم پاسکیلسوارێك، بەخێرایی لە پاڵمەوە دەرچوو. ژنێکی تەمەن پەنجا ساڵە بوو کە پاسکیلێکی قورسی شاخی پێبوو.

زۆر ئاسان و بێ ئەوەی هەناسەی سوار بێ، لە تەنیشتمەوە تێپەڕی و من بەو پاسکیلە سووکە پیشەییەوە، هەناسەم لێبڕابوو. بە هیچ شێوەیەك پێی نەدەگەیشتمەوە. من بە هەموو توانامەوە بەرەو پێشەوە دەچووم، بەڵام واش هەر پێی نەدەگەیشتمەوە.

من خۆم فریو دابوو. خۆم بەو قەناعەتە گەیاندبوو کە باش پایدەر لێدەدەم و بارودۆخیشم زۆر باشترە. بەڵام ژنێکی وەنێوکەوتوو (تەمەن مامناوەند)، پێشم کەوتەوە و تازە تێگەیشتم کە جارێ لە کوێم. من دەبوو ئەوە قبوڵ بکەم کە لە بارودۆخێکی باشدا نیم.

لەو ڕۆژە بەدواوە، بەردەوام لە نێوان جارەکانی چارەسەری کیمیاییدا، پاسکیلسواریم دەکرد. بەڵام چیتر ئامانجم لەم کارە باش بوونی توانا جەستەییەکانم نەبوو. ئێستا ئیدی تەنیا لەبەر خاتری خۆم پاسکیلسواریم دەکرد و ئەم بابەتەش بۆم تازە بوو. من تەنیا نیو کاتژمێر پاسکیلسواریم دەکرد. پێشتر بەو شێوەیە نەبوو کە تەنیا بۆ نیو کاتژمێر پاسکیلسواری، لە ماڵ بچمەدەر.

پێش ئەوەی تووشی شێرپەنجە ببم، هیچ حەزم بە پاسکیلسواری

نەبوو: من بەهۆی کارەکەمەوە، پایدەرم لێدەدا و لەو کارەشدا سەرکەوتوو بووم. لەڕاستیدا پاسکیلسواری، ئامرازێك بوو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانم.

کاتێك دایکم منی بوو، تەمەنی تەنانەت لە ١٧ ساڵیش کەمتر بوو. بەشێوەیەك لە شێوەکان دەتوانم بڵێم کە ئێمە پێکەوە گەورە بووین. لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا، مەلەوانێکی بەلەز بووم و بەرنامەیەکی خۆراکی باشیشم هەبوو. هەموو ڕۆژێك، چەندین کاتژمێرم لەگەڵ باشترین هاوڕێ و گەورەترین هاندەرم، لە چێشتخانەدا بەسەرم دەبرد.

وێڕای هەموو ئەم شتانە، من شاری پلانۆم جێهێشت. بەڵام لە رووی هەستی شاعیرانە یان هەوەسەوە ئەم کارەم نەکرد، پاسکیلسواری پیشەی من بوو، من لەڕێی ئەم کارەوە بژێوی خۆم دابین دەکرد، بەڵام هەرگیز حەزم لێی نەبوو.

پێش ئەمە، هیچکات لەبەر خاتری خۆم پاسکیلسواریم نەکردبوو، هەمیشە ئامانجێکی لە پشتەوە بوو. بۆ نموونە پێشبڕکێ یان ڕاهێنان. لە رابووردوودا تەنانەت بۆ نیو کاتژمێر یان کاتژمێرێك پایدەر لێدان، سوار پاسکیل نەدەبووم. پاسکیلاسوارە پیشەییەکان، هەرگیز تەنیا بۆ ماوەی یەك کاتژمێر پاسیکیلەکەیان لە گەراج ناهێننەدەر.

هەندێکجار بارت تەلەفۆنی بۆ دەکردم و دەیووت: "وەرە با بڕۆین بۆ دەرەوە و کەمێك پاسکیل لێبخورین."

من لە وەڵامی ئەودا دەمووت: "بۆچی؟"

بەڵام لە ماوەی چارەسەرە کیمیاییەکەدا، نەك هەر پاسکیلسواریم خۆشدەویست، بەڵکو هەستم دەکرد پێویستم پێیەتی. من پێویستم بەوە بوو بۆ ماوەیەکی کورت، لە گرفتەکانم رزگارم ببێ و شتێك بە خۆم و هاوڕێیکانم بڵێم. من بۆ پاسکیلسواری هۆکارم هەبوو: دەمویست هەموو ببینن کە من وەزعم باشە و هێشتا دەتوانم پاسکیلسواری بکەم، رەنگیشە ویستبێتم ئەم شتە بۆ خۆم بسەلمێنم.

خەڵك بەردەوام پرسیاریان دەکرد: "بارودۆخی لانس چۆنە؟"

حەزم دەکرد هاوڕێکانم لە وەڵامدا بڵێن: "زۆر باشە، ئێستا رۆژانە پاسکیلسواری دەکات."

دەشێ ویستبێتم بە خۆم بڵێم کە من هێشتاش پاسکیلسوارم، نەك تووشبوویەکی شێرپەنجە و ئەوە گرنگ نییە کە چەندە لاواز بووم. لەم رێگایەوە بەرەنگاری نەخۆشییەکەم دەبوومەوە و دیسان ئەو کۆنترۆڵەم بەدەستەوە دەگرتەوە کە نەخۆشییەکە لێی سەندبووم. بە خۆمم دەووت هێشتا دەتوانم پاسکیلسواری بکەم. رەنگە وەك پێشوو نەتوانم پایدەر لێبدەم، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە هێشتا دەتوانم پایدەر لێبدەم.

رۆژێکیان، کوین و جیم وۆدمن، کە یەکێك لە پاسکیلسوارە خۆجییەکان بوو، سەردانیان کردم تا وەك هەموو رۆژەکانی دیکە بچین بۆ پاسکیلسواری. هێشتا شوێنەواری برینی نەشتەرگەرییەکە بە سەرمەوە مابوو، هەر لەبەر ئەوە کڵاوی پاسکیلسوارییەکەم لەسەر کرد و بێ ئەوەی شوێنێکی تایبەت دیاری بکەین، زۆر هێواش کەوتینە رێ. پێشتر من

ئەمجۆرە پاسکیلسوارییەم هەر بە پاسکیلسواری نەدەزانی.

لەنێو رێدا، گەیشتینە هەورازێکی بچووك، هەر هیچ شتێکی قورس نەبوو، تەنیا پێویست بوو لەسەر کورسییەکە بەرز ببمەوە و یەك دوو پایدەری بەهێز لێبدەم. پێشتر بە ملیۆنان جار ئەم کارەم کردبوو. بەرز دەبوومەوە و دەهاتمەوە خوار و پاشان دووبارە لەسەر کورسی پاسکیلەکە دادەنیشتمەوە و بێ ئەوەی پێویست بە پایدەر لێدان بکات، دەچوومە پێش و لەو شوێنە دوور دەکەوتمەوە.

بەڵام من نەمتوانی ئەم کارە بکەم. کە گەیشتمە ناوقەدی هەورازەکە، هەناسەم لێبڕا. قاچەکانم خستە سەر زەوی و وەستام. خەریکبوو دەبووڕامەوە. هەوڵم دەدا هەناسە بدەم، بەڵام نەمدەتوانی هەوای پێویست بگەیەنمە سییەکانم. چاوم لە رەشەوە دەهات. لە پاسکیلەکە دابەزیم، لەسەر لێواری جۆگەلەی یەکێك لە ماڵەکان دانیشتم و سەرم نایە سەر ئەژنۆم.

کوین لە چاو تروکانێکدا خۆی گەیاندە من. "وەزعت باشە؟" بە خیزەخیز وتم: "بێڵە با هەناسەم وەك خۆی لێبێتەوە.. ئێوە بڕۆن، منیش دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە."

جیم وتی: "رەنگە پێویست بێ بانگی ئەمبولانس(ئیسعاف) بکەین." وتم: "نا، کەمێك دانیشم، باش دەبم." کە هەناسەم دەدا گوێم لە دەنگی خیزەخیزی سنگم بوو. بەگران سەرم لەسەر ئەژنۆکانم بەرز دەکردەوە، پاشان وەك ئەو کاتانەی کە لەپڕ لە شوێنی خۆمان بەرز دەبینەوە،

چاوەکانم تاریك بوون، هەڵبەت بەو جیاوازییەی کە من دانیشتبووم.

لەسەر چیمەنەکان دانیشتم و چاوم بڕییە ئاسمان.. پاشان چاوەکانم نوقاند. کوین وەك شێت لە ژوور سەرمەوە خولەی دەهات، لەپڕ بە دەنگی بەرز وتی: "لانس، لانس.." چاوم کردنەوە.

"من بانگی ئەمبولانس دەکەم."

بە توورەییەوە وتم: "نا، نا تەنیا پێویستە کەمێك پشوو بدەم."

وتی: "باشە، باشە.." و ئیتر هەر دووکمان کەمێك ئارام بووینەوە.

هێواش هێواش هەناسەم ئاسایی بووەوە. هەستام، دانیشتم و هەوڵمدا خۆم کۆنترۆڵ بکەم. پاشان لە جێی خۆم بەرز بوومەوە. بە دوودڵییەوە، قاچەکانم لەملاولای پاسکیلەکە دانا.

قاچم دەلەرزی، بەڵام دەمتوانی بە لێژاییدا بڕۆمە خوار. زۆر هێواش هەر لەو ڕێگایەوە کە هاتبووین، گەڕاینەوە. کوین و جیم، لە تەنیشت منەوە دەڕۆشتن و بۆ ساتێکیش چاویان لەسەر من هەڵنەدەگرت.

چەند هەناسەی قوڵم هەڵمژی و هۆکاری ئەم ڕووداوەم بۆ ڕوون کردنەوە. پێم وتن کە بەهۆی چارەسەری کیمیاییەوە، ڕادەی خانەکانی خوێن و هیمۆگلۆبین کەم دەبێتەوە. ئەرکی هیمۆگلۆبینیش ئەوەیە کە ئۆکسیجن بە هەموو بەشە جیاوازەکانی لەش بگەیەنێ و ڕادەکەشی لە کەسانی ساغدا لە نێوان ١٣ بۆ ١٥ەیە.

ڕادەی هیمۆگلۆبینی من ٧ بوو. لەڕاستیدا من کەمخوێن بووم.

دەرمانەکانی چارەسەری کیمیایی، هەموو دوو هەفتە جارێك، لە دوو شەممەوە تا هەینی، پەلاماری خانە خوێنییەکانی منیان دەدا.

من لە پاسکیلسواریدا زێدەڕۆییم کردبوو، بۆیە ئەو رۆژە باجەکەیم دا. بەڵام واش هەر وازم نەهێنا.

لە چوار دەوری ئێمە کۆمەڵێك فریشتەی زەمینی دەژین و بە بڕوای من لاتریس یەکێك لەو فریشتە زەمینیانە بوو. بە رواڵەت ئەویش پەرستارێکی کارامە بوو وەك باقی پەرستارەکانی دیکەی کە کراسێکی ئوتوکراوی لەبەردابوو، هەمیشەش سرنج و تەختە شاسی بەدەستەوە بوو. شەو و رۆژ لە نەخۆشخانە کاری دەکرد و چەند کاتژمێرێکیش لە ماڵەوە بوو، دەبوو بە هاوسەر و منداڵەکانیشی رابگات. راندی (Randy) شووی لاتریس، شۆفێری لۆری بوو. منداڵەکانی ناویان تیلۆر (Taylor) و مۆرگان (Morgan) بوو، یەکەمەکەیان تەمەنی ٧ ساڵ و دووهەمەکەیان تەمەنی ٤ ساڵ بوو. لاتریس، هیچکات وای پیشان نەدەدا کە ماندووە. هەرگیز دڵگران نەدەبوو، بە باشی ئەرکەکانی خۆی دەزانی و قورس و گران چاودێری نەخۆشەکانی دەکرد. ئەگەر کەسێکی لەو شێوەیە پێینەوتری فریشتە، ئەی دەبێ چ ناوێکی لێبنێین.

من زۆربەی شەوان تەنیا بووم، بەڵام لاتریس نەیدەهێشت تەنیا بم و هەر کات وەزعم باش بووایە، قسەمان لێگەرم دەکرد. من لەگەڵ زۆر کەسدا ئاسوودە نەبووم، بەڵام لەگەڵ لاتریسدا زۆرم قسە دەکرد، رەنگە لەبەر ئەوەی کە زۆر میهرەبان و بەهەست بوو.

لاتریس تەمەنی تەنیا بیست و حەوت، هەشت ساڵێك دەبوو، خانمێکی لاو و جوان بوو. بەڵام متمانە بەخۆبوون و تێگەیشتنەکەی زۆر زیاتر لە تەمەنەکەی بوو. لە کاتێکدا کە زۆربەی هاوتەمەنەکانی ئێمە، کاتی خۆیان لە نادییەکانی شەوانەدا بەسەر دەبرد، ئەو سەرپەرشتی کردنی سەنتەری ئانکۆلۆژی لە ئەستۆ بوو. من سەرم لە کارەکانی دەسوڕما، بەڵام ئەو دەیووت: "کە یارمەتی نەخۆشەکان دەدەم هەست بە ڕەزامەندی و خۆشحاڵی دەکەم."

ئەو لە بارەی پاسکیلسوارییەوە پرسیاری لە من دەکرد و منیش بە حەز و تاسەوە وەڵامی پرسیارەکانیم دەدایەوە. تا ئەو کاتە نەمزانیبوو کە حەز و تاسەیەکی لەو شێوەیەم تێدایە. ڕۆژێك پرسیاری لێکردم: "چۆن بوو دەستت کرد بە پاسکیلسواری؟" منیش باسی یەکەم پاسکیلەکانی خۆم بۆ دەکرد، باسی هەستی سەربەستی و ئەوەی کە لە تەمەنی ١٦ ساڵی بەدواوە، تەنیا پایدەرم لێدەدا. هەندێکجاریش لەبارەی هاو تیمییەکانم و گاڵتەکانیان و لەخۆبوردوویی ئەوانە قسەم بۆ دەکرد. باسی دایکشم بۆ دەکرد و دەمووت کە چەندە لام ئازیز و خۆشەویستە.

باسی گەشتەکانی ئەورووپا، شتانێك کە لەو ماوەیەدا فێریان بوو بووم و سەروەت و سامانەم بۆ دەکرد کە بەدەستم هێنابوو. بە لووتبەرزییەکی تەواوەوە یەکێك لە وێنەکانی خانووەکەم پیشان دا و دەعوەتم کرد کە ڕۆژێك، بێ بۆ ماڵەکەم. هەر وەها ئەو وێنانەشم پیشان دا کە بە پاسکیلەوە گرتبوومن. ئەو سەیری یەك بە یەکی ئەو وێنانەی دەکرد کە

له فەرەنسا و ئیتالْیا و ئیسپانیا گرتبوومن، پاشان ئاماژەی بە یەکێك لەوان دەکرد و دەیووت: "ئەم وێنەت لە کوێ گرتووە؟"

بابەتی "کوفیدیس"یشم بۆ باس کرد و وتم لەو پەیوەندییەدا لە فشاردام. بەردەوام پێمدەوت: "نابێ ناشیرین ببم.. نابێ ناشیرین ببم.." لاتریس، لە وەڵامدا بە ئارامی دەیووت: "لانس، بەقسەی لەشت بکە، بەقسەی دڵت مەکە.. دەزانم بەردەوام پێت دەڵێ هۆی، هەستە بچین بۆ پاسکیلسواری، بەڵام بەقسەی لەشت بکە و بێڵە با پشوو بدات."

باسی پاسکیلەکەی خۆم بۆ دەکرد کە بەش گەلی زۆر سووك و تایەی ئیرۆدینامیکی هەیە، هەر وەها باسی ئەوەم بۆ دەکرد کە هەر پارچەیەکی بەچەندەیە، کێشی چەندە و چ کارێك دەکات.. بۆم باس دەکرد کە چۆن دەتوانرێ پارچەکانی پاسکیل لێك جیا بکرێتەوە، بەجۆرێك کە لە گیرفاندا جێی ببێتەوە، هەروەها باسی ئەوەم بۆ دەکرد کە هەموو پارچەکانی پاسکیلم بەتەواوی دەناسی و لە ماوەی چەند خولەکدا، دەمتوانی سەر لەنوێ بیانخەمەوە سەریەك.

بۆ لاتریسم روون دەکردەوە کە دەبێ پاسکیل لەگەڵ لەشی کەسەکەدا بگونجێ، باسی ئەوەشم بۆ دەکرد کە هەندیکجار هەستم دەکرد پاسکیلەکەم بەشێکە لە خۆم. بۆم باس دەکرد کە تا پاسکیلەکە سووکتر بێ باشترە. کێشی پاسکیلی پێشبڕکێکەی من، تەنیا ١٨ پۆند بوو. سەبارەت بە هێزی دوورکەوتنەوە لە چەق دەدوام کە تایەکان دەیانخستە سەر پاسکیلە، باسی ئەوەم بۆ دەکرد کە تا رادەی ئەم هێزە زیاتر بێ،

خێراییەکەی زیاتر دەبێت. لەڕاستیشدا هۆکاری سەرەکی خێرایش هەر ئەمە بوو.

لاتریس پرسیاری لێ دەکردم: "ماندوو نابی لەوەی کە ئاوا دادەنیشیت؟"

لە وەڵامدا دەمووت: "بۆچی نا، بە رادەیەك کە هەندێکجار پشتم هێندە دەیداتە ئازار کە هەست دەکەم شکاوە، بەڵام ئەم ئازارە، باجی خێراییە." پانی سوکانەکە، بەڕادەی پانی شانەکانەی پاسکیلسوارە، سوکانەکە بەرە خوارەوە حاڵەتێکی کەوانەیی پەیدا دەکات و ئەمەش تایبەتمەندی ئێرۆدینامیك بە پاسکیل دەبەخشێت.

"بۆچی کورسی پاسکیلەکانتان ئەوەندە بچووکە؟"

کورسی ئەم پاسکیلانە باریکە، لەبەر ئەوەی کاتێك بڕیار بێ بۆ نموونە ٦ کاتژمێری لەسەر یەك، لەسەری دانیشی، پێویستە شتێك بێ کە قاچەکان بریندار نەکات. کەواتە تەحەمول کردنی کورسییەکی رەق، زۆر لە کوتراوی باشترە. تەنانەت جلوبەرگی پاسکیلسوارەکانیش تایبەتە. جلەکانیان زۆر ناسك و چەسپناکە، چونکە دەبێ لە هەوای سارد و گەرمدا، لەبەریاندا بێت. لەڕاستیدا، جلوبەرگ وەك پێستی دووەمی ئەوان وایە و دەبێ رێ لە هەر چەشنە هەستیارییەك بگرێت.

کاتێك کە لەبارەی پاسیکلەوە هیچ شتێکم بە مێشکدا نەدەهات، لەبارەی لێدانی با لە دەموچاو قسەم بۆ دەکرد. باسی هەوای ئازاد، داوێنی ئاڵپ و بریسکانەوەی دەریاچەکانم دەکرد. هەندێکجار هەڵکردنی با بە قازانج بوو، بەڵام هەندێکجاریش دەبووە سەرسەختترین دوژمن،

هەندێکجاریش وەك بڵێی لە لایەن خواوە راسپێدرابوو کە لە جادەکەدا بەرەو پیچشم بەرێت. باسی هاتنەخوار لە سەرەو لێژاییەکانی کێوم بۆ دەکرد: بە تایە گەلێکەوە کە ئەستوورییەکەی تەنیا یەك ئینج بوو، دەخزام و دەهاتمەخوار.

"لەم کارەدا هەستێکی رزگاربوونی سەیر هەیە."

"حەزت بەم حاڵەتە بوو؟"

"بەڵێ"

"تەواو بە چاوەکانتەوە دیارە."

دوانیوەڕۆی رۆژێك، لە کاتێکدا کە دوایین خولی چارەسەری کیمیاییم وەردەگرت، زانیم کە لاتریس هەر بەڕاستی فریشتەیە. لەسەر لا پاڵکەوتبووم، لەخەو و بەئاگاییدا بووم و دڵۆپەکانی شلەی نێو بتڵەکەم سەیر دەکرد کە یەك لەدوای یەك دەچووە خوێنبەرەکانمەوە. لاتریس، لە تەنیشتم دانیشتبوو، هەرچەند نەمدەتوانی بە باشی قسە بکەم، لەگەڵم بوو.

"تۆ ئەڵێی چی لاتریس؟ بە بۆچوونی تۆ من چاك دەبمەوە؟"

"بەڵی چاك دەبیتەوە."

"هیوادارم بەو جۆرە بێت.."، پاشان چاوەکانم داخست.

لاتریس، هاتە لامەوە و وتی:

"لانس هیوادارم رۆژێك بێ کە من ببمە بەشێك لە بیرەوەرییەکانی تۆ. رۆژێك کە نەزانی من لەراستیدا هەبووم یان خەیاڵات بووم.. من لێرە نیم تا بۆ هەمیشە لە ژیانی تۆدا هەنتەش(حزور)م هەبێت. دوای ئەوەی کە لە

نەخۆشخانە ئیزن درای، حەز ناکەم چیتر هەرگیز تۆ لێرە ببینمەوە. هیوادارم کاتێك کە چاك بوویتەوە، ئیتر لەڕێی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکانەوە تۆ ببینم، نەك لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە.. حەز دەکەم تا ئەو کاتەی پێویستت بە منە یارمەتیت بدەم، پاشان بۆ هەمیشە لە ژیانت بچمەدەر و تۆ ڕۆژێك لە خۆت بپرسی: "ئەو پەرستارە کێ بوو؟" "ئایا لە خەودا ئەوم دەبینی...؟

ئەمە جوانترین ڕستەیەك بوو کە تا ئەو کات پێیان وتبووم، وشە بە وشەی ئەو ڕستەیە بۆ هەمیشە لە زەینمدا دەمێنێتەوە.

دوایین جاری چارەسەری کیمیاییەکەم، ڕۆژی ١٣ی دیسەمبەری ١٩٩٦ ئەنجام درا. ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.

کەمێك پێش ئەوەی دوایین بڕ(دۆز)ی دەرمانەکەم وەرگرم، نیکۆلز هاتە ژوورەکەم. ئەو دەیویست لە بارەی ئەرکەکانی کەسێکەوە قسە بکات کە چارەسەری کیمیایی وەرگرتووە. ئەم بابەتە بۆ من زۆر گرنگ بوو. بەدرێژایی سێ مانگی ڕابووردوو، بەردەوام بە نیکۆلز ولاتریسم دەووت: "خەڵك پێویستە زانیاری گەلێکیان لەم بوارەدا هەبێت."

لە ڕەوتی چارەسەرییەکەدا، لەگەڵ نەخۆشەکانی دیکەدا تەواو بوو بووم بە برادەر. زۆر جار بارودۆخم هێندە خراپ بوو کە نەمدەتوانی لەگەڵیان هەستم و دانیشم. بەڵام ڕۆژێك، لاتریس داوای لێکردم بچم بۆ قاوشی منداڵان و قسە لەگەڵ کوڕێکی تازە لاودا بکەم کە بڕیاربوو چارەسەری کیمیایی بۆ بکەن.

کوڕەکە تەواو ترسابوو، زۆریش تووڕە دیاربوو. ماوەیەك پێکەوە بووین،

بەوم وت: "منیش بارودۆخم زۆر خراپ بوو، بەڵام ئێستا باشتر بووم.." پاشان ئیجازەی شۆفێریەکەم پیشان دا. لە نێوەی چارەسەری کیمیاییەکەمدا، ماوەی ئیجازەکەم بەسەرچوو. دەمتوانی نوێکردنەوەکەی دوا بخەم بۆ ئەو کاتەی کە بارودۆخم باشتر بوو بێ و قژیشم روابێتەوە، بەڵام ئەم کارەم نەکرد، بەزەحمەت چووم بۆ بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆ و لەبەردەم کامێرادا وەستام. قژم پێوە نەمابوو، برۆ و مژۆڵیشم وەریبوون و پێستیشم وەك رەنگی سنگی کۆتری لێهاتبوو، بەڵام سەیری لێنزی کامێراکەم کرد و پێکەنیم.

دەمەویست هەر کات چاوم بەم وێنەیە دەکەوێ، بیرم بێتەوە کە بارودۆخم چەندە خراپ بوو. "تۆش دەبێ بەرەنگاری ببیتەوە و لەگەڵیدا بنجەنگێیت." دوای ئەم بابەتە، لاتریس داوای لێکردم قسە بۆ نەخۆشانێکی زۆرتر بکەم. وادیاربوو کاتێك ئەوان دەیانبینی وەرزشکارێك، شان بە شانی ئەوان لەگەڵ ئەم نەخۆشییەدا دەجەنگێ، هەستێکی باشتریان بۆ دروست دەبوو. رۆژێك لاتریس پێی وتم، خۆت هەستت کردووە ئەو پرسیارانەی ئێستا لە منی دەکەی، زۆر لەگەڵ هەوەڵ جیاوازن؟ سەرەتا، ئەو پرسیارانەی کە دەمپرسین تەنیا پەیوەندی بە خۆم، شێوازی چارەسەرییەکەم، دەرمانەکانم و کێشە تایبەتەکانمەوە بوو. بەڵام ئێستا سەبارەت بە کەسانی دیکەش پرسیارم دەکرد. کاتێك کە زانیم هەشت ملیۆن ئەمریکی نەخۆشی شێرپەنجەیان هەیە، هەر بەڕاستی راچڵەکیم. چۆن وا بیرم دەکردەوە کە من تەنیا کەسم کە شێرپەنجەم هەیە؟! هیچ نەدەکرا تەسەوری ئەوە بکەی کە ئەو هەموو

مرۆڤە بەدەست ئەم نەخۆشییەوە دەناڵێنن.

لاتریس بە ڕەزامەندییەوە سەرێکی جوڵاند و وتی: "تۆ گۆڕاوی. چیتر تەنیا بیر لە خۆت ناکەیتەوە." دکتۆر نیکۆلز وتی، هەموو بەڵگە و نیشانەکان، ئەوە پیشان دەدەن کە بەسەر نەخۆشییەکەدا زاڵ بووم.

لەگەڵ باشتر بوونی بارودۆخدا، هەستم دەکرد ئامانجی زیاتر لە خۆم هەیە: شێرپەنجە، دەتوانێ حوکمی دەرفەت و بەرپرسیارێتییەکی هەبێت. دکتۆر نیکۆلز، زۆر تووشبووی شێرپەنجەی بینیبوو کە دوای ڕزگاربوون لە نەخۆشییەکەیان، ببوونە ئەندامی چالاکی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ نەخۆشیدا و هیوادار بوو کە منیش بچمە ڕیزی ئەو کەسانەوە.

خۆشم هیوادار بووم. ئیتر هوستم دەکرد، من لەبەر چاکەی هەمووان تووشی ئەم نەخۆشییە بووم و هەر بۆیە بڕیارمدا دامەزراوەیەك دروست بکەم.

بۆچوونی دکتۆر نیکۆلزیشم لەم بوارەدا پرسی. هێشتا بەڕوونی نەمدەزانی ئەم دامەزراوەیە، چ ئامانج گەلێکی دەبێت. تەنیا هەستم دەکرد لەهەمبەر ئەوانی دیکەشدا، بەرپرسیارێتییەکم لەسەر شانە و ئەم بەرپرسیارێتییەش لە هەر شتێکی دیکە لە دنیادا بایەخی زۆرتری هەبوو.

من ئامانجێکی نوێم لەبەرچاو بوو کە لەگەڵ سەربەگۆبەندییەکانی پاسکیلسواریدا هیچ خاڵێکی هاوبەشیان نەبوو. ڕەنگە هەندێك کەس نەتوانن لەم بابەتە تێبگەن، بەڵام هەستم دەکرد ڕۆڵی من لە ژیاندا، چیتر تەنیا پاسکیلسواری نییە. ڕەنگبوو دەبێ من ڕۆڵی ڕزگاربوویەکی شێرپەنجەم ببینیبایە. هەموو هۆشم لای ئەو کەسانە بوو کە شێرپەنجە

بەرۆکی گرتبوون و هەمان پرسیاری هەمیشەیی منیان دەکرد: "من خەریکە دەمرم؟"

لەم بوارەدا، قسەم لەگەڵ "ستیڤ وۆڵف"یشدا کرد. ستیڤ لەو باوەڕەدابوو کە چارەنووس وابووە کە من تووشی ئەم نەخۆشییە ببم. یەکەم لەبەر ئەوەی کە بەسەریدا زاڵ دەبووم و دووەم لەبەر ئەوەی کە توانا وەگەڕنەخراوە مرۆییەکانی من، زیاتر لەوە بووە کە تەنیا پاسکیلسوارێك بم و هیچی دیکە.

لە کۆتایی خولی سێیەمی چارەسەری کیمیاییەکەدا، پەیوەندیم بە "بیل"ەوە کرد و وتم: "دەتوانی پرسیار بکەی کە بۆ دامەزراندنی دامەزراوەیەکی خێرخوازی، دەبێ چی بکەین؟" ڕۆژێك من و بیل و بارت لەگەڵ یەکێك لە دۆستەکانمان بەناوی جۆن کۆریۆس ( John Korioth) کە لە پاسکیلسوارە ئاماتۆرەکان بوو، لە یەکێك لە ڕێستورانتەکانی ئاستین کاتمان دیاری کرد تا سەبارەت بەم بابەتە پێکەوە قسە بکەین. ئێمە هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بە چۆنێتی دامەزراندنی دامەزراوەیەکی خێرخوازی یان کۆکردنەوەی پارەی پێویست بۆ ئەو شتە نەبوو. دواجار پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە پێشبڕکێیەکی پاسکیلسواری لە ئاستین ساز بکەین و ناوی بنێین "پێشبڕکێ لەپێناو گوڵە سورەکاندا". لە کوڕەکانم پرسی کامیان کاتی هەیە تا چاودێری پرۆژەکە بکات، کۆریۆس دەستی هەڵێنا. کۆریۆس لە کافتریایەك کاری دەکرد کە لە رابوردوودا زۆر دەچووم بۆ ئەوێ. کۆریۆس وتی کارەکەی بەشێوەیەکە کە دەتوانێ کەمێك کات بۆ ئەم

پرۆژەیە دانێت. ئەمە باشترین ڕێگاچارە بوو، چونکە ئێمە نەماندەتوانی پارەی زۆری بۆ تەرخان بکەین و هەرچیشمان دەستبکەوتبایە دەبوو خەرجی وەدیهاتنی ئامانجەکانمان بکردبایە.

بەڵام هێشتا سەبارەت بە ئامانجە بنەڕەتییەکان دڵنیا نەبووین. دەمزانی لەبەر ئەوەی کە حاڵەتی نەخۆشییەکەی من، تایبەت و جیاواز بوو لە هەموو تووشبووانی دیکەی شێرپەنجە، گوێیان بۆ قسەکانم دەگرت، بەڵام نەمدەویست تەنیا لەم ڕێگایەوە باسی حاڵەتەکەی خۆم بکەم. بە بۆچوونی خۆم، من جیاوازیم لەگەڵ ئەوانی دیکەدا نەبوو، بەتەواوی نەمدەزانی چەندەم ڕۆڵ لە چاکبوونەوەمدا هەبووە. تەنیا دەمەویست بە هەموو تووشبووانی شێرپەنجە بڵێم: "بە هەموو تواناتانەوە بەرەنگار ببنەوە، ڕێك وەك من."

کە لەم پەیوەندییەدا قسەم لەگەڵ دکتۆر نیکۆلز کرد، بەو ئەنجامە گەیشتم کە بەشێك لە کارەکە لەسەر توێژینەوە چڕ بکەینەوە. من زۆر قەرزاربارى زانینەکانی دکتۆر ئاینهۆرن و دکتۆر نیکۆلز بووم و دەمەویست سووچێك لەو زەحمەتانە قەرەبوو بکەمەوە کە لەگەڵ مندا کێشابوویان. لەبەر ئەم هۆکارە، لە زەینی خۆمدا شورایەکی زانستیم بۆ ئەم دامەزراوەیە لەبەرچاو گرت تا لە داواکارییەکانی سەرمایەگوزاری بکۆڵنەوە و باشترین و بایەخدارترینینان هەڵبژێرن.

لە بەرەنگاربوونە دژی شێرپەنجەدا، چەندین فاکتەر ڕۆڵیان هەبوو کە من نەمدەتوانی تەنیا تەرکیز لەسەر یەکێك لەوان بکەم. ژمارەیەکی زۆر هاوڕێی نوێم پەیدا کردبوو کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، لەم

بەرەنگاربوونەوەدا، یارمەتیدەرم بوون. نەخۆشەکان، پزیشکەکان، پەرستارەکان، خێزانەکان و... تەنانەت زیاتر لە هەندێك لە هاوڕێیانی پێشووم لێیان نزیك بوو بوومەوە. لەمە بەدوا بەهۆی ئەم دامەزراوەوە، پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ یەکتردا دەمایەوە.

دەمەویست لەڕێی ئەم دامەزراوەوە، هەموو ئەو شتانەی لە ماوەی سێ بۆ چوار مانگی رابووردوودا بەسەرم هاتبوون و ئەزموونم کردبوون، بە هەمووانی رابگەیەنم: سازان لەگەڵ ترسدا، گرنگی راوێژکردن، زانیاری تەواو سەبارەت بە نەخۆشی، رۆڵی نەخۆش لە پرۆسەی چارەسەری و لە هەمووان گرنگتر ئەوەی کە شێرپەنجە بە واتای مردن نییە، بەڵکو دەشێ رێگایەك بەرەو لەدایکبوونەوە نوێ و ژیانێکی باشتر بێت.

پاش دوایین قۆناغی چارەسەری کیمیایی، چەند رۆژێکی دیکەش لە نەخۆشخانە مامەوە تا تواناکانم بەدەست بهێنمەوە و کارە ناتەواوەکانیش تەواو بکەم. یەکێك لەو کارانەی کە مابوو، کاتتری سنگم بوو. ئەو رۆژەی کە دەریانهێنا، رۆژێکی گرنگ بوو، چونکە نزیکەی چوار مانگ دەبوو کە ئەوەیان خستبووە سنگمەوە. بە نیکۆلزم وت: "دکتۆر دەکرێ ئەمە دەربهێنن؟"

دکتۆر نیکۆلز لە وەڵامدا وتی: "بێگومان"

خەیاڵم ئاسوودە بوو، ئەگەر بیانویستبایە کاتترەکە دەربهێنن، کەواتە ئەوەی دەگەیاند کە چیتر پێویستم بەو نییە و چارەسەری کیمیایی تەواو بووە.

رۆژی دواتر یەکێك لە یاریدەدەرەکان هاتە ژوورەکەم تا ئەو ئامێرە

ناشیرین و ئازاردەرە دەربهێنێ، بەڵام کارەکەی هێندە سادە نەبوو. چونکو ماوەیەکی ئەوەندە زۆر بوو لەوێدا بوو کە بە لەشمەوە نووسابوو. یاریدەدەرەکە، چواردەورەکەی بەتاڵ کرد، دیسان هەر دەرنەهات. بۆیە یارمەتی لە پزیشکێکی بەئەزموونتر وەرگرت و ئەو پزیشکە کاترەکەی هەڵکەند. بەڕاستی بەئازار بوو.. تەنانەت هەستمکرد دەنگێکی پچڕانیشم بیست.

چەند ڕۆژ دواتر شوێنی کاترەکە هەوی کرد و ئەوان ناچار بوون نەشتەرگەرییەکی دیکەم بۆ بکەن، کێم و جەراحاتەکەی دەرکەن و شوێنەکەی بدوورنەوە. بەڕاستی سامناك بوو. دەکرێ بڵێم کە ناخۆشترین ئەزموونی من لەو چوار مانگەدا، ئەمە بوو. ئەم کارە هێندەی ئازار دام کە داوام لێکردن ئەو کاترە بدەن بە من. دەمەویست وەك یادگاری لای خۆم رایگرم و ئێستاش ماوەمە.

هێشتاش شتێکی دیکە مابوو: نیکۆلز بارودۆخی جەستەیی خۆمی بۆ روون کردمەوە، هێشتاش دۆخی لەشساغی من یەکلا نەبووبوەوە. دوایین جاری چارەسەری کیمیاییەکە هەموو شوێنەوارەکانی شێرپەنجەی ریشەکێش نەکردبوو، دەبوو هەموو مانگێك پشکنینی خوێن و پشکنینە پێویستەکانی دیکە ئەنجام بدەم تا بەتەواوی لە نەمانی نەخۆشییەکە دڵنیا ببمەوە. نیکۆلز وتی، ئاماژەدەرە خوێنییەکان هێشتا بەتەواوی نۆرماڵ نین و لە تیشکەوێنەکانی سنگمدا، هەر شانە زیان بەرکەوتووەکان دەبیندرێن.

لەبەر ئەم هۆکارە نیگەران بووم. دکتۆر نیکۆلز وتی: "ئێمە ئەم

حاڵەتەمان زۆر بینیوە. لەڕاستیدا ئەمانە کۆمەڵێك نارێکی بچووکن و بەئەگەری زۆر نامێنن." ئەگەر من چارەسەر بووبێتم، بەرەبەرە شانە زیان بەرکەوتووەکان و ئاماژەدەرەکان شی دەبوونەوە، بەڵام هیچ گرەنتییەکیش نەبوو. ساڵی یەکەم چارەنووسساز بوو. ئەگەر بڕیار بوو نەخۆشییەکە سەرهەڵبداتەوە، لە ماوەی یەك ساڵی یەکەمدا دەردەکەوت. من دەمەویست هەر لەو کاتەدا لە لەشساغی خۆم دڵنیا ببمەوە و هیچ حەزم نەدەکرد ساڵێك چاوەڕوانی ئەنجامەکەی بکەم.

گەڕامەوە بۆ ماڵ و هەوڵمدا ژیانم بگەڕێنمەوە بۆ دۆخی ئاسایی. لەهەوەڵەوە زۆر سەختگیریم نەدەکرت، ڕۆژانە کەمێك یاری گۆڵفم دەکرد و کارم لەسەر بەرنامەکانی دامەزراوەکە دەکرد. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات کە دەرمانەکان لە لەشم کرانەدەر، هەستمکرد، لەشم بەهۆی چارەسەرە کیمیاییەکەوە زیانی بەرنەکەوتووە و لەم بابەتەوە خەیاڵم ئاسوودە بوو. بەڵام هێشتاش هەستی کەسێکی تووشبووی شێرپەنجەم هەبوو، ئەو هەستەی کە لە ماوەی سێ مانگی ڕابوردوودا هەمبوو، سەری هەڵدایەوە.

ڕۆژێك لەگەڵ بیل و یەکێك لە هاوڕێکانمان بەناوی درو دانوۆرس ( Dru Dunworth) کە لە ڕزگاربووانی شێرپەنجەی ڕژێنە لیمفاوییەکان (Lymphoma) بوو، چووین بۆ یانەی ئانیۆن کریك بۆ ئەوەی کەمێك یاری گۆڵف بکەین. هێشتا قژم نەڕوابۆوە و هەتاویش زۆر باش نەبوو بۆ من، هەر بۆیە یەکێك لەو کڵاوە گاڵتەجاڕانەیەم لەسەر کرد کە تا سەر گوێچەکانم دەهێنایە خوار. چوومە دووکانێك تا چەند تۆپێك بکڕم. پیاوێکی لاو لەسەر دووکانەکە بوو، سەیرێکی کردم و بە زڕە

پێکەنینێکەوە وتی: "هەروا ئەم کڵاوەت لەسەر کردووە؟"

یەك وشەم وت: "بەڵێ"

"باشە پێتوانییە کە هەوا گەرمە؟"

کڵاوەکەم لابرد تا سەرە ڕووتاوەکە و برینەکانی سەرم ببینێت. وتم: "ئەم برینانە دەبینی؟"

دووکاندارەکە کشاوە دواوە. "لەبەر ئەوەیە کە کڵاو لەسەر دەکەم، لەبەر ئەوەی من تووشی شێرپەنجە بووم."

کڵاوەکەم کردەوە سەرم و لە دووکانەکە هاتمە دەر. هێندە تووڕە بوو بووم هەموو لەشم دەلەرزی.

دەبێ دان بەوەدا بنێم کە زۆر نیگەران بووم. هەروا کاتێکی زۆرم لە نۆرینگەی پزیشکەکان بەسەر دەبرد. بەردەوام لەژێر چاودێریدا بووم. لە نەخۆشی شێرپەنجەدا، بەدواداچوون و پشکنین، ڕۆڵی سەرەکی هەیە و کەسەکە بەهۆی ئەنجامەکانی پشکنینەکانی خوێن، سی تی سکان و (MRI) و ئاگادار بوون لە ڕادەی پەرەسەندنی نەخۆشییەکەی، دەژی. سەبارەت بە من نەخۆشییەکە بەخێرایی پەرەی سەندبوو، خێرا نەمابوو، بەڵام ئەگەری ئەوە هەبوو دیسان بگەڕێتەوە و هەموو شتێك تێکبدات.

چەند هەفتە دوای ئەوەی کە گەڕامەوە بۆ ئاستین، لاتریس پەیوەندی بە "دکتۆر یومان"ەوە کردبوو تا ئەنجامی پشکنیەکان و ژمارە و ڕەقەمە بەدەستهاتووەکان لەو بپرسێت. "لاتریس"یش هەموو ژمارەکانی یادداشت کردبوو، دابووی بە دکتۆر نیکۆلز. دکتۆر نیکۆلز سەیرێکی ئەو کاغەزەی کردبوو کە لاتریس پێیدابوو، ئەویش بە بزەیەکی پڕ لە

ڕەزامەندییەوە کاغەزەکەی دابۆوە بە لاتریس. "بۆچی پەیوەندی پێوە ناکەیت؟"

لاتریس، پەیوەندی بە ژمارەی ماڵەوەمان کردبوو. ژمارە و داتاکان زۆر بەلامەوە گرنگ بوون و هەمیشە بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی لێدانی زەنگی تەلەفۆن بووم. خێرا تەلەفۆنەکەم هەڵگرت.

"ئەنجامی پشکنینی خوێنەکەتم وەرگرتەوە."

"باشە، چی بوو؟"

"لانس ئەنجامی پشکنینەکە سروشتییە."

لە مێشکمدا بابەتەکەم هەڵسەنگاند: چیتر نەخۆش نیم. بەڵام دیاریش نەبوو، ساڵێکی دوور و درێژم لەپێش بوو. ئەگەر نەخۆشییەکە دیسانەوە بگەڕابایەتەوە، لە ماوەی ئەم دوانزە مانگەدا خۆی دەردەخست. بەڵام لەو ساتەدا –ئەو ساتە کورت و پڕ بایەخە– هیچ نیشانەیەکی شێرپەنجە لە لەشمدا نەبوو.

نەمدەزانی بڵێم چی.. دەترسام ئەگەر دەمم بکەمەوە، هاوار بکەم. لاتریس وتی: "زۆر خۆشحاڵم کە هەواڵی باشم بۆ تۆ پێبوو." منیش هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵمژی.. ئا....ی..

کیك و شێرپەنجە هەردووکیان هاوڕێیانێکی غەریب بوون، بەڵام هەردووکیان لە یەك کاتدا هاتنە نێو ژیانمەوە. هەرگیز کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ ناسینی هاوسەری داهاتووم، بەڵام ڕووی دا. ژن و پیاوێك بە چ هیوایەك پەیوەندی هاوسەرایەتی لەگەڵ یەکتردا دروست دەکەن؟ بێگومان بۆ ئەوەی لە داهاتوو پێکەوە بن. بەڵام پرسیارەکە ئەمە بوو کە ئایا هیچ داهاتوویەك چاوەڕێم دەکات؟

چیتر شێرپەنجەم نەبوو، بەڵام زۆریش ڕوون نەبوو. لەڕاستیدا من لە قۆناغی کەمبوونەوەی نیشانەکانی نەخۆشییەکەدا بووم و لە لایەکیشەوە ئەگەری گەڕانەوەی نەخۆشییەکە هەبوو. هەندێکجار لە نیوەی شەودا لە سنگمدا هەستم بە ئازارێك دەکرد، لەخەو هەڵدەستام، لەشم سەر ئارەق دەگەڕا و گوێم لە دەنگی هەناسەکانم دەبوو. لای خۆم دەمووت، بێگومان لووەکان دروستبوونەوە. بەیانی ڕۆژی دواتر، ڕاستەوخۆ سەردانی پزیشکم دەکرد و پێم دەووت، تیشکە وێنەیەك لە سنگم بگرێ بۆ ئەوەی خەیاڵم ئاسوودە بێت.

دکتۆر ئاینهۆرن پێی وتبووم: "لە هەندێك حاڵەتدا، چارەسەری کیمیایی کاریگەری دەبێ و لە هەندێك حاڵەتیشدا دەروێکی نابێت." ئەگەر کاریگەری هەبێ، ئەوا کەسەکە دەتوانێ ژیانی سروشتی بەسەر بەرێ، بەڵام ئەگەر دەوری نەبێ و سەر لەنوێ نەخۆشییەکە سەر هەڵبداتەوە، لە ماوەی سێ بۆ چوار مانگدا، کەسەکە دەکوژێت. ڕێك بەو

سادەییە.

دەستپێکردنەوەی ژیان زۆر دژوار بوو. ڕێکەوتی ١٣ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٩٦، چارەسەرە کیمیاییەکە کۆتاییهات و ڕێك یەك مانگ دوای ئەو ڕێکەوتە، بۆ یەکەم جار، لە کۆنفڕانسێکی ڕۆژنامەوانیدا، چاوم بە کریستین ریچارد (Kristin Richard) کەوت. لەو دانیشتنەدا بڕیاربوو، لەبارەی دامەزراندنی دامەزراوەی شێرپەنجە و پێشبڕکێی گوڵە سوورەکان، قسە بکەین. دەمەتەقێیەکی کورتمان پێکەوە هەبوو. کچێکی بەلەبارێك و قژ ئاڵتوونی بوو. هەمووان بە کیك بانگیان دەکرد. وادیاربوو بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی ریکلام کردن بوو، بۆ ڕێکلام کردنی ئەم پلانە هاتبوو بۆ ئەوێ. ڕەنگە پێیتان وابێت لەو کاتەدا وشك بووم، بەڵام هیچ وانەبوو. بە کچێکی ژیر و جوان هاتە پێش چاوم. "کیك"یش دواتر پێی وتم کە لە ساتەوەختی یەکەمدا، هەستێکی تایبەتی لەئاست مندا هەبووە. منی وەك کوڕێکی زیرەك و کەچەڵ بینیوە کە پێکەنینیی تایبەتیم هەبووە. (پێش ئەوەی هەستەکانمان لەهەمبەر یەکتر قوڵتر ببێتەوە، بەهار و هاوین تێپەڕی، چونکە هەر دووکمان لەگەڵ کەسانی دیکەدا بووین و تازە یەکەمجاریش کە بۆ ماوەیەکی زۆر پێکەوە قسەمان کرد، شەڕمان بوو.)

مەسەلەکە بە تەلەفۆنێك دەستی پێکرد، ئەو مشتەرییەکی بە ئێمە ناساندبوو تا سپۆنسەری "پێشبڕکێ لەپێناو گوڵە سورەکان" بکات، ئەو پێیوابوو کە من کاری پێویستم بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو

نەکردبوو. ڕۆژێك بە زمانێکی زبر قسەی لەگەڵ فەرمانبەرێکی دامەزراوەکەدا کردبوو.

وتم: "ئەم جووجوڵە کێیە؟" خێرا پەیوەندیم پێوەکرد و هەر کە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، وتم: "من لانس ئارمێسترانگم. تۆ بە چ مافێك، بەو زمانە، قسەت لەگەڵ فەرمانبەری مندا کردووە؟" دەستم بە هات وهاوار کرد. لە پشت تەلەفۆنەکەوە، کیك لە دڵی خۆیدا وتبووی: "جۆرێك قسە دەکات وەك بڵێی کەسێکی زۆر گرنگە."

نزیکەی دە خولەك پێکەوە مشتومڕمان کرد تا ئەوەی کە کیك وتی: "وادیارە ئەم قسەو باسە ئەنجامی نابێت." منیش لە وەڵامدا وتم: "نا، هیچ ئەنجامێکی نابێت." کیك وتی: "دەزانی چییە، پێویستە لە کافتریایەکدا پێکەوە قسە بکەین. تەنیا دەتوانم ئەوە بڵێم."

تووشی سەرسوڕمان بووم. "باشە، باشە لە کافتریایەك یەکتر دەبینین." کیك و چەند کەس لە هاوڕێکانم دەعوەت کرد بۆ کافتریا. هیچکام لە ئێمە چاوەڕوانی ئەوە نەبووین کە ئەوەندە لێك نزیك ببینەوە. من هێشتا ڕەنگ زەرد و لاواز بووم، بەڵام ئەم شتانەی هەر هیچ بەلاوە گرنگ نەبوو. خوێن شیرینتر و ئارامگرتر لەوە بوو کە بیرم لێی دەکردەوە، زۆریش بەکەیف و زیتەڵە دەهاتە پێش چاوان. داوام لێکرد لە کۆبوونەوەی هەفتانەی دامەزراوەکەدا بەشداری بکات و ئەویش قبوڵی کرد.

دامەزراوەکە، وەڵامێکی تەواو بوو بۆ ئەو زینەخ(بەرزەخ)ەی کە تێیدا

بووم: چارەسەری کیمیایی کۆتایی هاتبوو، جارێ نەخۆشییەکە نەمابوو، ئێستا دەبوو بڕیار بدەم کە دەمەوێ چی بکەم. بەخۆم وت، من بە پلەی یەکەم، رزگاربوویەکی شێرپەنجەم و بە پلەی دووەم، وەرزشکارم. زۆرێك لە وەرزشکاران بەشێوەیەك دەژین وەك بڵێی کێشەکانی دنیا پەیوەندی بەوانەوە نییە. سەروەت و سامان، چەقی سەرنجی ئێمەی بەرتەسك کردۆتەوە و نوخبەسالاریش دیوارێکی بە چوار دەوری ئێمەدا لێداوە. بەڵام یەکێك لە لایەنە باشەکانی وەرزشکاربوون ئەمەیە کە سەرلەنوێ توانا مرۆییەکان پێناسە دەکاتەوە. ئێمە خەڵك هان دەدەین تا سەر لەنوێ سنوورەکانیان تاوتوێ بکەنەوە. رەنگە ئەو شتەی کە وەك دیوار دەبیندرێ، تەنیا لەمپەرێك بێ لە زەینی خودی کەسەکەدا. نەخۆشیش تاڕادەیەك لەم بابەتە دەچوو: ئێمە ئاگامان لە توانای مرۆیی خۆمان نییە و من هەستم دەکرد کە پێویستە ئەم پەیامە بە هەمووان بگەیەنم.

یەکێك لەو رووداوانەی کە لە نێوان زستان و بەهاری ئەو ساڵەدا روویدا، ئەمە بوو کە جێف گارڤی (Jeff Garvey)م ناسی. جێف لە سەرمایەدارە ناسراوەکانی ئاستین بوو. لەو کاتەدا، تەنیا ئاواتی ئەوەم هەبوو کە ئەو، لە بواری کاروباری دامەزراوەکەدا رێنماییمان بکات، بەڵام ئێستا جێف یەکێك لە دۆستە نزیکەکانی منە. کەسێك کە هاوڕێی هەردووکان بوو، ئێمەی بە یەکتر ناساند و جێف منی بۆ نانی نیوەڕۆ دەعوەت کرد. بە جلوبەرگێکی نارەسمییە چوومە لای. لەکاتی ناخواردندا، باسی پاسکیلسواریشمان دەکرد –جێف لە پاسکیلسوارە ئاماتۆرەکان بوو، هەموو ساڵێك سەردانی ئیسپانیای دەکرد تا بەشداری

گەشتی بەناوبانگی کامینۆ دی سانتیاگۆ ( Camino de Santiago)دا بکات. جێف دایك و باوکی بەهۆی شێرپەنجەوە گیانیان لەدەستدابوو، بەشوێن ئەنجامدانی کاری خێرخوازییەوە بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم نەخۆشییە. چەند هەفتە دواتر، داوام لە جێف کرد تا دووبارە نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین. لەکاتی خواردنەکەدا، پرسیارم لێکرد کە ئایا ئامادەیە بەڕێوەبردنی ئەو دامەزراوەیە قبوڵ بکات. ئەویش پێشنیارەکەی قبول کردم و بەمجۆرە بوو بە بەڕێوەبەری جێبەجێکاری دامەزراوەکە.

لە ماوەوی دوو مانگی دواتردا، من و کیك، پێکەوە کاتمان بۆ کارەکانی دامەزراوەکە تەرخان دەکرد. لە نیگای یەکەمدا کچێکی ڕێکپۆش دیاربوو کە هەمیشە وەڵامێکی ڕەقی ئامادەی هەبوو. بەرەبەرە قژە درێژ و ئاڵتوونییەکانی سەرنجی منیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا. زۆرم خۆشی لەوە دەهات کە دەیتوانی جلوبەرگە سادە و ناڕەسمییەکان بەشێوەی جوان و ئەمڕۆیی ڕێکبخات. شێوەی پێکەنینەکەیشیم پێ جوان بوو، وەك ئەو کچانە پێدەکەنی کە ریکلام بۆ هەویری ددان دەکەن. قورس بوو بتوانی خۆت بگری و نوقمی ئەو تابلۆ جوانە نەبیت. قسە نالەبارەکانیشیم بەلاوە جوان بوو. "کیك"یش لەکاتی دەست بەتاڵیدا، بە بیانووی لێکۆڵینەوە لە کارەکان، لێکۆڵینەوەی لەسەر من دەکرد. بەڵام هیچ کام لە ئێمە هیچمان بەرووی خۆماندا نەدەهێنا.

پێشبڕکێی گوڵە سورەکان، لە مانگی مارسدا ئەنجام درا و زۆریش

سەرکەوتوو بوو. بڕی دوو سەد هەزار دۆلارمان کۆ کردەوە و گرووپی واڵفلاورز (Wallflowers)یش کۆنسێرتێکیان ساز کرد. هاوڕێیان و هاوکارەکانیشمان بۆ نموونە میگویل ئیندۆراین، ئەیدی مێرکس و ئەیك هایدن، لە سەرانسەری دنیاوە هاتبوون تا لەم ڕێوڕەسمەدا پایدەر لێبدەن.

هەرگیز ڕێوڕەسمی پێشکەش کردنی یارمەتییەکانم لەبیر ناچێتەوە. لە پشت مێزێکەوە دانیشتبووین و ڕیزێکی دووریش لە بەردەمم بوو تا واژۆیان بۆ بکەم. خێرا خێرا، ناو و ناوی خێزانی خۆمم بۆ دەنووسین. یەك لەدوای یەکیش واژۆم بۆ دەکردن و هیچ سەیری ڕوخساری کەسەکانم نەدەکرد، لەپڕ دەستە چەکێك، کەوتە سەر مێزەکە، کەسێك کە لەپێش مێزەکە وەستابوو، وتی: "چەندە بنووسم؟" بێ ئەوەی سەرم هەڵبڕم، وتم: "بەنەفرت بی."

پاشان دام لە قاقای پێکەنین و سەرێکم بۆ جوڵاند. من ئەو دەنگەم دەناسییەوە. پیاوێك کە یەکەم پاسکیلی دا بە من و کامیرۆ خۆشەویستەکەمی لێسەندم، ڕێك بەرامبەرم وەستابوو، ڕۆندا (Rhonda)ی هاوسەریشی لەگەڵدا بوو. دوای ئەو شەرە ناخۆشەمان، واتە دە ساڵ پێشتر، چیتر یەکترمان نەبینیبوو. چاوم بڕیە چاوی.

وتم: "بەداخم." هەستم دەکرد داوای لێبوردنێك بەو قەرزارم.

-"قبوڵتە، ئێستا چەند بنووسم؟"

"جیم پێویست ناکات ئەم کارە بکەیت."

-"نا، حەز دەکەم یارمەتیتان بدەم."

"نا پێویست ناکات."

-"پێنج هەزار باشە؟"

دام لە قاقای پێکەنین. ئاخر نرخی ئەو کامێرۆیە، پێنج هەزار بوو.

وتم: "باشە"

ئەویش چەکەکەی نووسی و پێکەوە تەوقەمان کرد.

لەو کاتە بەدواوە، جیم هەموو ساڵێك لە ڕێوڕەسمی پاسکیلسواریدا بەشداری دەکات و بێ هیچ چاوەڕوانییەك، پارەیەکی زۆرمان وەك یارمەتی پێدەدات.

دوای کەمێکی دیکە، کەسێکی دیکە لە پێش مێزەکە وەستا: کچێکی منداڵ، کە وەك من، سەری رووتابووەوە. کە چاومان بە یەکتر کەوت، خێرا منی ناسییەوە. هەروا کە خەریکی واژۆ کردن بووم بۆی، هەموو رستەکانی منی لەبەر دەوتەوە. ناوی کێلی دەیڤیدسۆن (Kelly Davidson) بوو، ئەویش تووشی شێرپەنجە بوو بوو. تا چەند رۆژ هەر بیرم لای ئەو بوو، تا ئەوەی کە دواجار ناونیشانەکەیم پەیدا کرد، پەیوەندیم پێوە کرد و لەو کاتە بەدواوە پێکەوە هاوڕێین.

دوای کۆتاییهاتنی ڕێوڕەسمەکە، من و کیك بە بیانوو گەلی جۆراوجۆر کاتی چاوپێکەوتنمان دادەنا، بەردەوام نامەی ئەلکترۆنیمان بۆ یەکتر دەنارد، بە تەلەفۆن قسەمان دەکرد و بە بیانووی جۆراوجۆر، جیا لە

کۆبوونەوەکانی دامەزراوەکە، چاومان بە یەکتر دەکەوت. ئەو هەموو هەفتەیەك لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداری دەکرد کە لە ماڵی ئێمە ساز دەکرا. شەوێك هەمووان ڕۆشتبوون، بەڵام کێك هێشتا نەڕۆشتبوو. هەر من و ئەو بووین. لە ژووری میوان دانیشتبووین، چاو و قاوە و شتی لەو بابەتەمان دەخواردەوە و قسەمان دەکرد. لەبیرمە بەردەوام بەخۆم دەووت: "خەریکی چ کارێکم؟ بۆچی لەگەڵ ئەم کچە بەتەینا مامەوە؟" "کیك"یش ڕێك بیری لەم بابەتە دەکردەوە. دواجار هەستا بانگی تاکسی بکات، بەڵام من پێشنیارم کرد، خۆم بیگەیەنم.

بە شەقامە چۆڵ و تاریکەکاندا ڕێمان دەکرد، هیچ قسەیەکمان پێکەوە نەدەکرد، هەستم دەکرد شتێك لە نێوان ئێمەدا ڕووی داوە، بەڵام هیچ کام لە ئێمە، ئامادەیی پێویستی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو شتەدا نەبوو. هەر بۆیە تەنیا شۆفێریم دەکرد. بەهاری ساڵی ١٩٩٧ بوو، من هێشتا توانای جەستەیی پێویستم بەدەست نەهێنابۆوە. هێشتاش ئەو ناڕوونییە پزیشکییە وەك خۆی مابوو. پرسیارم لە دکتۆر نیکۆلز کرد: "تەکلیفم چییە؟ ئایا دەمرم یان دەژیم؟"

دەمویست دەست بە پاسکیلسواری بکەمەوە، بەڵام هێشتا لە توانای جەستەیی خۆم ڕانەدەبینی. بەردەوام دارایی خۆم دەژمارد و لای خۆم بیرم دەکردەوە: ئایا چیتر دەتوانم لەڕێی پاسکیلسوارییەوە، دە سەنت پەیدا بکەم؟ دواجار بڕیارم دا هەوڵ بدەم لە پێشبڕکێکاندا بەشداری بکەم. هێشتاش دەمتوانی گرێبەستی ساڵی دووەم لەگەڵ کوفیدیسدا

بیرێنمەوە و بۆ ماوەیەك، خەیاڵم لە بابەت نیگەرانییە داراییەکانم ئاسوودە بێت. بەس دەبوو لە چوار پێشبڕکێدا بەشداری بکەم. بە "بیل"م وت: "وەرە چەند پێشبڕکێیەك بدۆزینەوە."

مانگێك دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە هاتمەدەر، چووم بۆ فەرەنسا تا لە کۆنفرانسی رۆژنامەوانی کوفیدیس ئامادە بم. بەرپرسانی یانەکە بە بینینی من شۆك بوون، بەڵام دەمەویست ببینن کە من چیتر ئەو قوربانییە رەنگپەڕیو و لەسەر جێکەوتووە نیم کە لە ئیندیا پۆلیس بینیبوویان. بەوانم وت هەوڵ دەدەم تا بەهار بگەڕێمەوە و تەنانەت چەند رۆژێکیش لەگەڵ تیمەکەدا راهێنانم کرد. بەڕواڵەت پێیان خۆش بوو. بەشێوەیەکی جددی دەستم بە راهێنان کردەوە، هەر بە رێگا پێشووەکاندا کە حەزم لێی بوو، مەودای نزیکەی ١٠٠ میل لە ئاستینەوە تا ڤێمبرلی و لەوێوە تا دریپینگ و سویدی نوێ، پایدەرم لێدەدا، بەڵام زۆر رازی نەبووم. هەندێکجار تەنیا کاتژمێرێك پاسکیلسواریم دەکرد، بەڵام زوو ماندوو دەبووم و دوای ئەوە دەبوو چەند کاتژمێرێك بخەوم. خێراییەکی مامناوەندم هەبوو، دڵم لە خولەکێکدا ١٣٠ جار لێی دەدا، بەڵام رۆژێك وزەم تێدابوو، رۆژێك بێ هێز بووم.

هەستم بە ماندوویی دەکرد و ئەم هەستەش بەلامەوە نامۆ نەبوو: پێش ئەوەش کە دەربکەوێ شێرپەنجەمە، هەر ئەم حاڵەتەم هەبوو، پاشانیش تووشی هەڵامەت بووم. ئەو شەوە هەر هیچ خەو نەچووە چاوم و هێندە ترسابووم، ئیفلیج بوو بووم. هەر بیرم لای گەڕانەوەی شێرپەنجە بوو.

پێش ئەوەی نەخۆش بکەوم، لەهەمبەر هەڵمەتدا هیچ هەستیار نەبووم. ئەگەر خەریك بوو تووشی نەخۆشی ببم، بێگومان ئەم نەخۆشییە شێرپەنجە بوو.

سبەینی بەیانییەکەی، سەردانی "دکتۆر یومان"م کرد، لای خۆم وام بیر کردەوە کە دکتۆر یومان دەڵێ، دووبارە تووشی شێرپەنجە بوویتەوە. بەلام تەنیا هەوکردنێکی ئاسایی بوو کە لەشم دەیتوانی بەرەنگاری ببێتەوەو خۆی بۆ بگرێت. لەڕاستیدا سیستمی بەرگری لەشم تێکچووبوو. لە زمانی پزیشکیدا، بەم دۆخەی من دەوترێ نوترۆپینك (Neutropenic): ژمارەی خڕۆکە سوورەکانی خوێنم هەروا لەخوارەوە بوو، بۆیە لە ئاست هەر میکرۆبێکدا هەستیار بووم.

وێنەکانی رایدیۆلۆژی، هێشتا بەتەوای سروشتی نەبوون، هەندێك پەڵە هەروا لە بەشی سکمدا دەبیندران. پزیشکەکان نەیاندەزانی چین، بەڵام بڕیاربوو بەردەوام بیانخەنە ژێر چاودێرییەوە. زۆر شپرزە بووم.

دکتۆر نیکۆلز پێشنیاری ئەوەی کرد کە پشوو بدەم، منیش بە پێشنیارەکەی ئەو رازی بووم. ساڵی ١٩٩٧ هیچ پاسکیلسوارییەکی جددیم نەکرد. نیکۆلز بۆی روون کردمەوە کە هێشتاش لە قۆناغی پشوو وەرگرتنی دوای نەخۆشییەکەدام و سیستمی بەرگری لەشم، هێشتاش بەهۆی کاریگەری دەرمانەکانی چارەسەری کیمیاییەوە، نەگەڕاوەتەوە دۆخی جارانی. کەواتە لاوازای جەستەیی من، بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بە لاوازی ئیرادەوە نییە، بەڵکو بەهۆی کاریگەرییەکانی نەخۆشییەکەوە.

هاوڕێیان و هاوکارەکانیشم وەك من تووڕە بوون. ئۆچ دەیووت: "هەر بڕیارێك کە دەیدەی، پێویستە پزیشکەکانیشت ئاگادار بن و بزانن کە تۆ چ کارێك دەکەی و چەندە ڕاهێنان دەکەیت. هەموو وردەکارییەکان بەوان بڵێ تا سنوور و ئاستی گونجاوت بۆ تۆ دیاری بکەن."

دەبوو قبوڵی بکەم: چیتر هەرگیز نەدەبوو لە ئاستی بەرزدا بەشداری پێشبڕکێ بکەم. ڕەنگبوو لەشم نەتوانێ بەرگەی قورسی ڕاهێنانی بەردەوام بگرێت.

کریس کارمایکل پەیوەندی کرد تا بزانێ هەواڵ چییە. "کریس دەترسم ڕاهێنان بکەم. دەترسم ئەگەر زۆر فشار بۆ خۆم بهێنم، دووبارە سەرهەڵباتەوە."

لانیکەم لە ماوەی چارەسەری کیمیاییەکەدا، خەریکبوو کارێکم دەکرد و لانیکەم چاوەڕێی ئەوە نەبووم بزانم ئایا نەخۆشییەکە سەرهەڵدەداتەوە یان نا!

هەندێك ڕۆژ خۆم بە پاسکیلسوار دەزانی، هەندێك ڕۆژیش، بەهیچ شێوەیەك ئەم ناوەم لەسەر خۆم دانەدەنا. ڕۆژێك لەگەڵ بیل، چوین بۆ یانەیەکی وەرزشی خۆجێی، بۆ ئەوەی یاری گۆڵف بکەین. بیل لێدانێکی جوانی لێدا. من بە ستایشەوە وتم: " منیش ڕۆژێك دەتوانم ئەمجۆرە لێدانە لێبدەم."

بیل لە وەڵامدا وتی: "ئەو ڕۆژەش، زۆر دوور نییە."

وتم: "بیل، وەك شتی هەر تێناگەیت. من ئیدی خانەنشین بووم."

من و بیل، هەمیشە سەبارەت بەم بابەتە پێکەوە قسەمان دەکرد. من دوودڵ بووم. ڕۆژێك بەرنامەڕێژیم بۆ گەڕانەوەم دەکرد و ڕۆژی دواتر، دەمووت چیتر هەرگیز ناتوانم پایەدر لێبدەم. سەرەتای یاری دەمووت: "لەم ساتە بەدواوە، پەیوەندی ئێمە تەنیا پەیوەندییەکی دۆستانەیە، چونکە من تازە هیچ پێویستم بە پارێزەر نییە و ئیدی هیچکات پاسکیلسواری ناکەم." ساتێك دوای ئەوە، داری گۆلفەکەم رادەوەشاند دەمووت: "کاتێك دەستم کردەوە بە پاسکیلسواری چی بکەین؟ بەرنامەکەمان چۆن بێت؟" پاشان دیسان، رام دەگۆڕا و دەمووت: "هیوادارم لەپێناو پارەدا لەگەڵ من نەبی، چونکە من وازم لە پاسکیلسواری هێناوە."

بیل دەیزانی کە قسەی بێبنەما زۆر دەکەم، ئیدی فێر بوو بوو کە هەر کات لەم قسانەم کرد، بیکات بە گاڵتەجار، یان ئەوەی کە قسەو باسەکە بگۆڕێت: "زۆر باشە، سبەینێ سەبارەت بەم بابەتە قسە دەکەین."

شتێك روویدا کە ئەم دوودڵییەی منی زیاتر کرد: ئیستیسی، فەرمانبەری بیل و هاوڕێی باشی من، تووشی شێرپەنجە بوو. بەدرێژایی ماوەی نەخۆشییەکەی من، ئیستیسی لە هیچ یارمەتییەك درێغی نەکرد و بۆ دامەزراندنی دامەزراوەکەش ئەو یەکێك لە ئەندامە چالاکەکان بوو. ئیستیسی تەمەنی ٥٥ ساڵ بوو، لە تەکساس دەژیا و جگەرەکێشێکی غەددار بوو. دەنگێکی گڕی هەبوو، رەفتارێکی زۆر جوان و لەبەردڵانی

هەبوو. ئەگەر لە تەلەفۆندا بیوتبایە تۆ گەمژەترین کەسی دنیای و چیتر پەیوەندی بێرەوە مەکە، تەلەفۆنەکەت دادەخستەوە و لەبەر خۆتەوە دەتووت "چەند ژنێکی خوێن شیرین بوو."

بەڵام ئیستیسی، وەك من شانسی نەبوو، شێرپەنجەکەی ئەو چارەسەری نەبوو. هەمووما‌ن گێژ بوو بووین. تەنیا کارێك کە دەمانتوای بۆ ئەوی بکەین، ئەمە بوو کە پشتگیری بکەین و دڵنەوایی بکەین. دایکم بەڕێکەوت دوو خاچی جوانی بینیبوو کە مەسیحیان لەسەر ئەو لە خاچ دابوو، ئەو خاچانەی بۆ من کڕیبوو. منیش یەکێك لەوانم لە مل کرد و ئەوی دیکەیانم دا بە ئیستیسی. "ئیستیسی"ش وەك من ئیمانی بەهێز نەبوو، بەڵام من پێمووت: "ئیستیسی، حەز دەکەم ئەم خاچە بدەم بە تۆ، ڕێك خۆشم خاچێکی وەك ئەوەم هەیە. ئەم خاچە نیشانەی پەیوەندی ئێمەیە لەگەڵ یەکتردا. لەو کاتەدا کە چارەسەر وەردەگری، یان هەر کات حەزت کرد، لە ملی بکە. منیش تا کۆتایی تەمەنم لە ملی دەکەم. ئێمە کارێکمان بەسەر ئایینەوە نییە، ئەم ملوانکەیە سیمبولی هاوشێوە بوونی نەخۆشییەکەمانە."

بارودۆخی ئیستیسی، بەخێرای بەرەو خراپبوون دەچوو. ئیستیسی بۆچوونی وا بوو کە ئەگەر بارودۆخی باشتر نابێ، با چارەسەری کیمیایی وەرنەگرێت. دکتۆر یومان هەموو هەوڵی خۆی بۆ چارەسەری ئەو دەدا، بەڵام چارەسەری کیمیایی دەوری نەبوو. تەنیا ئەوی نەخۆشتر دەکرد. دواجار ئەو وازی لە چارەسەری کیمیایی هێنا و پزیشکەکەشی بە ئێمەی

وت، تەنیا چەند هەفتەیەکی دیکە دەژی.

ئیستیسی کوڕێکی هەبوو بەناوی پۆل کە لە هێزی دەریاییدا خزمەتی دەکرد. دەمەویست چەند ڕۆژێك مۆڵەتی بۆ وەرگرم، بەڵام مۆڵەتیان پێ نەدەدا. پەیوەندیم بە ئەندامانی پەرلەمان و سیناتۆرەکانەوە کرد، بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبوو. دواجار بڕیارمدا یارمەتی لە یەکێك لە هاوڕێکانم وەرگرم، ئەویش چارلز بۆید (Chales Boyd)ی ژەنراڵی چوار ئەستێرەی بە ڕەگەز ئەڵمانی بوو، ناوبراو دوای خانەنشینی چووبوو بۆ واشنتۆن. پەیوەندیم پێوەکرد و وتم: "ژەنراڵ بۆید، دەبێ چاکەیەکم لەگەڵدا بکەیت." بەسەرهاتی "ئیستیسی"م بۆ گێڕایەوە و وتم: "ئەم ژنە خەریکە دەمرێ و کوڕەکەشی لەسەر کەشتییە." ژەنراڵ قسەکەی پێ بڕیم و وتی: "لانس پێویست ناکا هیچ بڵێی. من خۆم دوو ساڵ پێش ئێستا هاوسەرەکەم بە شێرپەنجە لەدەست دا. بزانم چیم پێدەکرێت." ڕۆژی دوایی، ڕازی بوون مۆڵەت بە پۆل بدرێت. ئەمە واتای "دامەزراوەی شێرپەنجە"یە.

بەڵام پێش ئەوەی پۆڵ بێتەوە بۆ ماڵەوە، ئیستیسی بۆ چەند ڕۆژێك چوو بۆ خانەی بەساڵاچووان. من و دایکم و بیل، بۆ سەردانیکرنی چووین بۆ ئەوێ.

شوێنێکی قەرەباڵغ و نالەبار بوو، پەرستاری پێویستی نەبوو. ئیستیسی دەیووت: "ئازارم زۆرە. نیوەشەوان، زەنگ لێدەدەم بەڵام ئازارشکێنم بۆ ناهێنن." ترسناك بوو.

وتم: "کەلوپەلەکانت کۆکەرەوە و لێرە دەڕۆین. دەتبەمەوە بۆ ماڵەوە، خۆم پەرستارێك بۆ دەگرم تا بەردەوام ئاگای لێتبێت."

یەکێك لە بەرپرسانی ئەوێ وتی: "ناتوانی ئەو ببەیت."

لە وەڵامدا وتم: "لێرە دەڕوا، هەر ئێستاش دەڕوا."

بە بیلم وت: "پاشەوپاش وەرە و دەرگای ئوتۆمبێلەکە بکرەوە."، لەوێ ڕۆشتین. ئیستیسی چەند هەفتەی کۆتایی ژیانی لە ماڵەوە گوزەراند. کوڕەکەی هاتەوە بۆ ماڵەوە و پەرستارێکیشمان گرت تا یارمەتی پۆل بدات. ئیستیسی بە هەموو توانایەوە، لە دژی نەخۆشییەکە جەنگا و سێ هەفتە زیاتر لەوەی کە پزیشکەکان پێشبینیان کردبوو، بەرگەی گرت. ڕێك دوای ئەوەی کە چارەسەرە کیمیاییەکەی من تەواو بوو، واتە لە مانگی جەنیوەری، دەرکەوت کە ئیستیسی تووشی ئەو نەخۆشییە بووە. لە مانگی فێبریوەردا وازی لە کارەکەی هێنا، دەوروبەری مانگە مارس، باروبدۆخی زۆر خراپ بوو، دواجار کۆچی دوایی کرد و هەموومانی خەمبار کرد.

خەمبار بووم و سەبارەت بە باروبدۆخی خۆشم هەروا تووڕە بووم. لەوەی کە زیندووم هەستم بە تاوان دەکرد. پاش مردنی ئێستیسی، چیتر پاسکیلسواریم زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو، تەنانەت بیرم دەکردەوە کە هەر هیچ واقیعبینانانە نییە. ستیڤ لویس لە پلانۆوە هات بۆ سەردانی کردنم و هەستیکرد کە چەندە گۆڕاوم. تا ئەو کاتەی کە ستیڤ منی لە نزیکەوە نەبینیبوو، نەیدەزانی نەخۆشی چی بەسەر هێناوم. تەنیا مشتێك پێست و

ئێسقانم لێمابووەوە. تیشکەوێنەکانی سییەکانم پیشان دا و وتم: "بەڕاستی پێموابوو ئیتر دەمرم."

بەردەوام هەوڵم دەدا ئەم بیرکردنەوە لە مێشکم دەرکەم، بەڵام بەتەواوی نەمدەزانی دووبارە لە کوێوە دەست پێبکەم. بڕیاردان سەبارەت بە پێشبڕکێکان یان گرێبەست لەگەڵ باکوفیدیس، لە توانای من بەدەر بوو. بەتەواوی نەمدەزانی چیم دەوێ، یان هەر لە بنەڕەتدا دەتوانم چ شتانێك بکەم. بەردەوام بیرم دەکردەوە کە پاسکیلسواری هیچ بایەخی نییە. ستیڤ سەیری وێنەی قۆناغێکی تۆردرفرانسی کرد کە لەودا براوە بووم و وتی: "کەی دووبارە ئەم یادەوەرییە زیندوو دەکەیتەوە؟"

وتم: "زۆر دڵنیام کە بۆ هەمیشە وازم لێهێناوە، چونکە فشارێکی زۆر بۆ لەشم دەهێنێت."

-"گاڵتەم لەگەڵ دەکەی!"

"من چیتر هەرگیز ناتوانم لەو پێشبڕکێیەدا بەشداری بکەم."

ستیڤ تەواو شۆك بوو بوو. من کەسێك نەبووم واز لە شتێك بێنم. وتم: "چیتر بە سەر پاسکیلەوە هەستێکی باشم نییە." پێمووت، زۆر نیگەرانی لەدەستدانی خانووەکەمم و هەموو هەوڵەکانم ئەوەیە کە ئەوەندەی دەکرێ خەرجییەکانم کەم بکەمەوە. لەڕاستیدا دەمەوێ بەرنامەڕێژییەکی نوێ بۆ ژیانم بکەم و لەم بەرنامەدا، پاسکیل هیچ شوێنێکی نییە. ستیڤ هەمیشە منی بە کەسێکی گەشەکەر دەزانی، بەڵام ئێستا قوربانییەکی لە بەرامبەرە خۆی دەبینی. چیتر شوێنەوارێك لەو زمانە توند و زبرە نەمابوو

کە ئەو لە منی بینیبوو. سەبارەت بە ژیانی شەخسیشم هەر بەو شێوەیە بووم. من و لیزا دەبوو سەبارەت بە داهاتوومان بڕیار بدەین و من زۆر بەجددی بیرم لە هاوسەرگیری دەکردەوە. ئەو بەدرێژایی ماوەی بەربەرەکانی لەگەڵ شێرپەنجەدا، لە تەنیشتم بوو، ئەم لەخۆبووردوویيە واتایەکی قووڵی هەبوو. لەو سەردەمەدا، لیزا بەچکە پشیلەیەکی بۆ هێنابووم و ئێمە ناومان نابوو چارەسەری کیمیایی (Chemo).

بە ستیڤم وت: "پێموایە لیزا زۆر گونجاوە بۆ من. ئەو بەدرێژایی ئەم ماوەیە، منی تەنیا جێنەهێشت و دوای ئەوەش هەر بەتەنیا جێم ناهێڵێت."

بەڵام تا دوو مانگی دیکە کە ستیڤ دووبارە سەردانی کردمەوە، من و لیزا پەیوەندیمان پێکەوە نەمابوو. هەر لەمەوە دەتوانن تێبگەن کە هەستم تا چەند پەرێشان و ئاڵۆز بوو. شێرپەنجە بە دوو شێوە کاریگەری لەسەر پەیوەندییەکان دادەنێ: کەسەکان لێك نزیکتر دەکات، یان ئەوەی کە بەتەواوی پەیوەندییەکە دەپچڕێنێت. بەرەبەرە کە وەزعم باشتر دەبوو، قسەیەکی ئەوتۆمان نەبوو پێکەوە بیکەین. ڕەنگبوو هۆکارەکەی ماندوو بوون بوو بێت. ئێمە وزەیەکی زۆرمان بۆ بەرەنگابوونەوە لەگەڵ نەخۆشیدا بەکار هێنابوو، لە هەموو قۆناغە دژوارەکانیش پەڕیبووینەوە، بەڵام لە کۆتاییدا، چیتر هێزێکی ئەوتۆمان تێدا نەمابوو. یەکێك لە ڕۆژەکانی مانگی مارس بوو کە لیزا وتی: "وەرە با هاوڕێی دیکە بدۆزینەوە." و منیش ڕازی بووم.

ئەو لە نەخۆشییەکەی من تێدەگەیشت، بەڵام هیچ نەیدەتوانی لەوە تێبگات کە بۆچی من لە رووی سۆزدارییەوە، سارد بوومەوە. جاروبار یەکترمان دەبینی، بەڵام دواجار ئەم پەیوەندییەش کۆتایی هات.

ئەو دوانیوەڕۆیەی کە لەگەڵ بیل، چووبووین بۆ پاسکیلسواری، هیچ نەمدەزانی کە دەمەوێ چی بکەم! (بەگشتی من لەگەڵ کەسانی تازەکاردا پاسکیلسواریم نەدەکرد.) هەروا کە بەئارامی لە چواردەوری ماڵەکە من پاسکیلمان لێدەخوڕی، وتم: "دەمەوێ لە بواری ئانکۆلۆژیدا درێژە بە خوێندن بدەم، رەنگیشە بازرگانی بخوێنم."

بیل تەنیا سەری بۆ لەقاند. ئەو ماجستەری لە بازرگانیدا خوێندبوو، هەروەها لە بواری یاسادا لە زانکۆی تەکساس خوێندنی تەواو کردبوو. وتی: "من یانزە ساڵ لە زانکۆ وانەم خوێند. لە سەردەمی خوێندندا، هەمیشە نیگەران بووم و باقی تەمەنیشم هەر دەبێ لە نیگەرانی و دڵەڕاوکێدا بم، تۆ ناچار نی بەمجۆرە بیت. هەموو رۆژێك کاتژمێر چوار و نیوی بەیانی بچی بۆ هۆڵی بۆرسە، لە کاتێکدا کە ناچار نی ئەم کارە بکەیت."

-"تۆ تێناگەی بیل، من تازە پاسکیلسوار نیم."

بۆ ماوەیەك، ئیتر کیك پەیوەندی پێوە نەدەکردم. هەرچی هەوڵم دەدا نەمدەتوانی بیدۆزمەوە. کیك هەندێك شتی لەبارەی ناوبانگی منەوە بیستبوو، بۆیە کەمێك دوودڵ بوو. بەڕاستی بەلامەوە قورس بوو کە لەپڕ پەیوەندییەك بپچڕێ، شێتی بوو بووم. بەردەوام پەیامم بۆ دەنارد. "چیتر

پەیوەندیم پێوە ناکەیت؟"

دواجار کیك کۆڵی دا. من بەم بابەتەم دەزانی، بەڵام ژیانی ئەویش گۆڕابوو. ئەیش وەك من پەیوەندییەکەی لەگەڵ دۆستەکەیدا تێکدابوو، لە ماوەی چەند هەفتەدا کارەکەشی گۆڕیبوو. دواجار ڕۆژێك کە تەلەفۆنم بۆ کرد، وەڵامی تەلەفۆنەکەی دایەوە.

وتم: "چ باسە؟"

"هەواڵی نوێم پێیە. کارێکی نوێم دەستکەوتووە و سەرم زۆر قاڵە."

هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی و وتم: "پێموابوو دەتەوێ بڵێی تەنیای."

-"ئێ، وایە. مەبەستم بوو ئەمەش بڵێم، من تەنیام. دوو ڕۆژ پێش ئێستا هەموو شتێك کۆتایی هات."

"بەڕاستی؟" هەوڵم دەدا وا پیشان بدەم کە پەیوەندی بە منەوە نییە.

"کەواتە تەنیای؟"

"وایە."

"باشە ئەمشەو بەرنامەت چییە؟"

"هەرچی تۆ بڵێی."

لەو کاتە بەدواوە ئێمە پێکەوەین.

زۆر زوو تێگەیشتم کە نیوە ونبووەکەی خۆم دۆزیوەتەوە. کێك توانای بەسەر خۆیدا دەشکا. ئەو کچێکی جددی، سەربەخۆ و ماقوڵ بوو.

هەرچەند لە خێزانێکی دەوڵەمەنددا گەورە بوو بوو –باوکی یەکێك لە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکانی فۆرچۆن[١٢] ٥٠٠ بوو– بەڵام ئەو دەیتوانی خۆی بەڕێوەبەرێ و هیچ چاوەڕوانییەکی لە کەس نەبوو.

لەپاڵ ئەودا هەستم بە ئەمان دەکرد. ئەو، من چۆن بووم بەو شێوەیە خۆشی دەویستم. بە بێ قژ، بە بێ برۆ، نەخۆشی...هتد. ئەو نیگەرانیانەی کە من سەبارەت بە قژم، برینەکانی سەر و لەشم، هیچ بۆ ئەو گرنگ نەبوو. کیك بوو بووە ئارایشکەری من. سەری منی دەخستە نێو دەستەکانی و بە نینۆککگیر، مووەکانمی چاك دەکرد، بەجۆرێك کە وەك ئەو کەسانەم لێهاتبوو کە لە شەستەکانی سەدەی بیستدا دەچوونە بۆشایی ئاسمان.

هەمیشە لە پەیوەندییەکانماندا من قسەی هەوەڵ و کۆتاییم دەکرد، بەڵام لە بارەی کیکەوە، بابەتەکە جیاواز بوو. هەندێکجار قسەکانی من سەری دەگرت و هەندێکجاریش قسەکانی ئەو. من زۆربەی جارەکان، کێك بۆ کوێ بیویستبایە دەچووین. ئێستاش هەر بەو جۆرەیە. باکوور، باشوور، ڕۆژئاوا، ڕۆژهەڵات و.. هاوینی ئەو ساڵە، کیك دەیەویست گەشتی ئەورووپا بکات. تا ئەو کاتە من گەشتم بۆ دەرەوەی وڵات نەکردبوو. یەکێك لە هاوڕێکانی کە لە ئیسانیا دەیخوێند، دەعوەتی کردبوو بچێت بۆ ئەوێ.

---

[١٢]– (Fortune ٥٠٠): فۆرچون ٥٠٠، لیستی ٥٠٠ باشترین و گەورەترین کۆمپانیاکانی دنیا بە هەڵبژاردنی گۆڤاری فۆرچون.

"بۆچی ئیسپانیا؟ ئیسپانیا وێرانەیە."

-"قسەی قۆڕ مەکە، خۆشییەکەم لێ تێك مەدە. چەند ساڵە خەریکم پارەی بۆ کۆدەکەمەوە."

گەشتەکەی یەك مانگی دەخایاند و من تاقەتی دووری ئەوم نەبوو. تەنیا یەك رێگا هەبوو: ئەویش ئەمەی کە منیش لەگەڵی بڕۆم. دەبوو بۆ رێز نواندن بۆ سپۆنسەرەکانم و هەروەها پیشاندانی خۆم لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس، لەوێ بم. هەر بۆیە بریارم دا، بەرنامەکەم لەگەڵ بەرنامەی کیکدا رێك بخەم. حەزم دەکرد لە روانگەی سەیرکەرێکەوە پێشبڕکێی تۆردۆفرانس ببینم، بەشکو بەم کارە دووبارە تاسەم بۆ پاسکیلسواری تێدا زیندوو ببێتەوە. قسەم لەگەڵ کیك کرد، ئەویش ئەم کارەی منی بەدڵ بوو.

هەموو شتێك بۆ من تازە بوو. وەك بڵێی هەرگیز ئەورووپام نەبینیبوو، هەڵبەت بەڕاستیش رەنگە هیچکات ئەوێم نەبینبێت. من هەمیشە بە سواری پاسکیل و بەخێرایی ٤٠ میل لە کاتژمێردا، ئەورووپا گەڕابووم، بەڵام هیچکات وەك گەشتیارێکی ئەویندار، سەردانی ئەوێم نەکردبوو. بەردەوام دەچووم بۆ ئەملا و ئەولا و من بە شانازییەوە بە زمانی فەرەنسی، ئیتالی و ئیسپانی قسەم دەکرد.

من بەهاری لاوێتیم لەدەستدابوو. وەرزشی پیشەییم، هەموو کاتی گرتبووم، تازە لە تەمەنی ١٥ ساڵییەوە دەبوو خۆم خەرجی خۆم دابین بکەم، بۆیە نەمدەتوانی ئەو کارانە بکەم کە زۆربەی لاوەکان لە

تەمەنەکانی بیستساڵیدا دەیکەن، یان وەك کیك و هاوڕێکەی بژیم. من بەتەواوی بازم بە سەر ئەو قۆناغەی ژیاندا دابوو، بەڵام ئێستا مەجالی ئەوەم هەبوو بگەڕێمەوە بۆ دواوە و تاقی بکەمەوە. هێشتا لە بارودۆخی جەستەییم دڵنیا نەبووم، نەمدەزانی چەندەم لە ژیاندا ماوە. ڕۆژێك، دوو ساڵ یان تەمەنێکی دوور و درێژ. بە خۆم وت ئەمڕۆ بقۆزەرەوە. دەبوو ئەوەندەی بوارم هەبوو، بە باشی سوودم لێوەرگرتایە و ئەوەندەی بمتوانیبایە، ساتەکانی ژیان دەوڵەمەند و پڕ بەرهەم بکەم.

پێشتر هەرگیز ژیانم لە ئامێز نەگرتبوو. لە ژیاندا هەندێك پێشکەوتنم بەدەستهێنابوو، لەپێناویدا جەنگابووم، بەڵام هەرگیز چێژم لێوەرنەگرتبوو. کیك وتی: "تۆ ئەم بەهرەت هەیە. دەبێ فێرم بکەیت کە چۆن بە هەموو بوونمەوە ژیانم خۆش بوێ، چونکە تۆ تا لێواری مردن چووی و ئەوبەریشت بینیوە. کەواتە دەتوانی پیشانی منیشی بدەیت."

بەڵام لەڕاستیدا ئەوە کیك بوو کە پیشانی منی دەدا. ئەو دەیەویست هەموو شتێك ببینێ و ئەمە من بووم کە دەبوو ئەوان پیشانی ئەو بدەم، هەروا کە پیشانی ئەوم دەدا، خۆشم دەمبینی. لە ئیتاڵیا لە کافتریاکانی سەر شەقامەکان دادەنیشتین و هەمبەرگر بە پەنیری پارمیزانمان دەخوارد و کیك سەری دەخستە سەر سەرم.

پێکەوە چووین بۆ سن سباستین. ڕۆژێك کە لە سن سناستین، یەکەم پێشبڕکێی پیشەییم هەبوو، باران هێندە بەلێزمە دەباری کە نەمدەتوانی بەباشی پایدەر لێدەم و ئەمەش ئەو کاتە بوو کە پلەی کۆتاییم

بەدەستهێنا، تەماشچییەکان پێم پێکەنین. ئەمجارە سەیری میچە کاشی کراو و پێدەشتەکانی قەراغ دوورگەی بیسکی (Biscay Bay)م دەکرد و پێچەوانەی ئەو وشەی پێشتر بۆ ئەویم بەکار هێنابوو (وێرانە)، بەم ئەنجامە گەیشتم کە هیچ شتێك، جوانتر لە کەش و هەوای کۆنی ئیسپانیا نییە.

لە پامپلۆنا (Pamplona) سەیری ڕاکردنی گاکانمان کرد. کیك پێشنیاری کرد: "وەرە با ئەمشەو تا بەیانی بەخەبەر بین."

وتم: "لەبەر چی؟"

"خۆشە. مەبەستت ئەوەیە کە تا ئێستا هیچکات تا بەیانی بەخەبەر نەبووی تا لە گزنگی خۆری بەیانیدا پیاسە بکەیت؟"

-"نا"

"یانی چی، هیچکات تا بەیانی بەخەبەر نەبووی؟ گەمژانەیە."

ئەو شەوە تا بەیانی بەخەبەر بووین و پیاسەمان کرد، کاتێك کە خۆرهەڵات و بەردچنی خۆڵەمێشی شەقامی ڕووناك کردەوە، بە پێی بەرەو هوتێل بەرێکەوتین. بە بۆچوونی کیك، من هەست ناسك و ڕۆمانتیك بووم. هەرچەند، تەنیا ژمارەیەکی کەم لە هاوڕێیانم ئەم بۆچوونەیان لە بارەی منەوە هەبوو. کریس هەمیشە لە بارەری منەوە دەیووت: "لانس وەك شاخێکی سەهۆڵە کە تەنیا لوتکەکەی دیارە، بەڵام لەژێر ئەم شاخە سەهۆڵییەدا، دڵێکی بەسۆز خۆی شاردۆتەوە."

دواجار له مۆناکۆ پێمووت که خۆشم دەوێ. جلمان لەبەر دەکرد تا بچین نانی ئێواره بخۆین، لەپڕ هەردووکمان بێدەنگ بووین. تا ئەو ساته هەموو هەستەکانمان شاراوه بوسو، بەڵام هەروا که سەیری ئەوم دەکرد، تەواو تێدەگەیشتم که چ هەستێکم له ئاست ئەودا هەیه، ئەو هەستەش جیا له رایەڵه تێکتەنراوەکانی ئەوین، هیچی دیکه نەبوو. تەنیا بابەتی کیك بەلامەوه روون بوو، جیا لەو بابەته، من له سەرلێشێواویەکی رەهادا بووم. نەمدەزانی زیندوو دەمێنمەوه یان دەمرم و ئەگەر بڕیار بوو بمێنم، نەمدەزانی چ ئامانجێکم هەیه! چیتر نەمدەزانی چیم له پاسکیلسواری دەوێ، لەبنەڕەتدا نەمدەزانی که درێژه به پاسکیلسواری بدەم یان خانەنشین ببم، یان بچم بۆ زانکۆ و ببمه کارگوزاری بۆرسه. بەڵام له هەموو حاڵەتێکدا کیکم خۆش دەویست.

لەوبەری ژوورەکەوه پێمووت: "پێموایه ئاشقت بووم."

لەپێش ئاوێنه وەستا و وتی: "پێتوایه؟ یان دڵنیای؟ چونکه من دەبێ بزانم، بەڕاستی دەبێ بزانم."

"دڵنیام."

-"منیش دڵنیام."

ئەگەر هەمیشه ئاواتت ئەوه بووه که کەسێك بناسی و پاشان خۆشت بوێ، پێویسته له بەسەرهاتی ئێمەدا بەشدار بیت. پەیوەندی ئێمه پەیوەندییەکی زارەکی نەبوو، بەڵکو روانینی قوڵ و هەست بەسەر پەیوەندییەکانماندا زاڵبوو. خۆشییەکەی ئەوه بوو که ئێمه هەرگیز

سەبارەت بە شێرپەنجە پێکەوە قسەمان نەدەکرد، تەنیا کاتێك کە باسی منداڵ هاتبایە گۆڕێ، لە بارەی شێرپەنجەوە دەدواین. من دەمووت، منداڵم دەوێ و بەسەرهاتی چوون بۆ سان ئانتۆنیۆم بۆ دەگێڕایەوە.

دووگیانی بەمشێوەیە کەمێکیش ترسناك بوو. کیك بەردەوام دەیووت: "من هەرگیز لەبەر پیاوێك، کارێك ناکەم. هیچکات لەبەر پیاوێك ژیانم ناگۆڕم." کیکیش لە خۆم دەچوو، لە پەیوەندییەکانیدا سنووری هەبوو، هەستەکانی کۆنترۆڵ دەکرد، سەربەخۆ بوو، هەرگیز کەسێکی لەرزۆك نەبوو، هێندەش لووتەبەرز بوو کە چۆکی بۆ کەس دانەدەدا. بەڵام ئیدی هەر دووکمان قۆڵبەست بووبووین. شەوێك کیك دانی بەوەدا نا کە: "ئەگەر تەنیا دەتەوێ من لەنێو بەری، ئێستا ئیتر دەتوانی، چونکە هیچ شتێك ڕێگرت نییە. کەواتە وریابە کە چ کارێك دەکەیت."

دواجار چووین بۆ تۆردۆفرانس. باسی پێشبڕکێکەم بۆ کیك دەکرد، باسی یاری شەترەنجی نێوان پاسکیلسوارەکان و ئەو دە ملیۆن تەماشاچییەم بۆ دەکرد کە لە قەراغ جادە دەوەستن. بەڵام کاتێك کە خۆی ئاپۆرای پاسکیلسوارەکانی بینی، لەخۆشیان هاواری کرد.

کۆمەڵێك کارم هەبوون کە دەبوو ئەنجامیان بدەم، دەبوو سەردانی سپۆنسەرەکانم بکەم و قسە لەگەڵ هەواڵنێرەکاندا بکەم. من هێندە گرفتاری کێك بوو بووم و چێژم لە ژیانی دووەمم وەردەگرت کە سەبارەت بە پاسکیلسواری دوودڵ بوو بووم.

بە هەواڵنێرەکانم وت: "چیتر وەك پێشوو بەشوێن ڕکابەرایەتییەوە نیم.

ڕەنگە لەوە بەدوا هەر بۆ خۆشی پاسکیلسواری بکەم. لەمە بەدوا تەنیا بەشداربوویەکم، نەك ڕکابەرێك. ڕەنگە بەشداری لە تۆردۆفڕانسدا مەحاڵ بێت."

"ئەوەندە بزانن کە پاسکیلسواری کارو پیشەی من بوو. زۆریش باش بوو. نزیکەی پێنج شەش ساڵ پێیەوە خەریك بووم، لە وڵاتانی ئەورووپی دەژیام و بۆ زۆر وڵات گەشتم کرد. بەڵام ئێستا هەلێك ڕەخسابوو کە لەگەڵ خێزان و هاوڕێکانمدا بم و بەو کارانەوە خەریك بم کە لە هەموو سەردەمی منداڵیمدا لێیان بێبەش بووم."

لە کۆتایی هاویندا، وادیاربوو کە تەواو لەشساغم. چیتر ڕەنگ و رووم بە کەسە نەخۆشەکان نەدەچوو، قژیشم هاتبۆوە. بەڵام هەروەها نیگەرانی گەڕانەوەی نەخۆشییەکە بووم و لە سنگمدا هەستم بە ئازارێکی کەم دەکرد.

شەوان خەونی ناخۆش و مۆتەکەم دەبینی. لەشم کاردانەوەی ناسروشتی دەنواند. هەندێکجار بێ هیچ هۆکارێکی تایبەت لەشم ئارەقی دەکرد. بە بچووکترین سترێس و نیگەرانی ئارەقەم دەکردەوە.

لەو سەردەمەدا کە چارەسەرم وەردەگرت، چالاکانە خانە شێرپەنجەییەکانم لەنێو دەبرد، بەڵام لەگەڵ تەواو بوونی خولی چارەسەرییەکە، بەردەوام هەستم بە سستی و لاوازی دەکرد. وەك بڵێی هیچ کارێکم لەدەست نایات، تەنیا چاوەڕوان بووم. من بەڕادەیەك چالاك و بوێر بووم کە ئەگەر بۆ ماوەی یەك ساڵیش لەژێر چارەسەری کیمیاییدا

بوومایە، دیسان بێ هیوا نەدەبووم و هەستێکی باشترم پەیدا دەکرد. دکتۆر نیکۆلز بەردەوام دڵنەوایی دەکردم و دەیووت: "هەندێك کەس دوای تەواو بوونی خولی چارەسەرییەکە، کێشەی زیاتریان لە چاو کاتی چارەسەر وەرگرتنەکەدا هەیە. ئەمە شتێکی ئاسایی و باوە. چاوەڕوان بوون بۆ گەڕانەوەی نەخۆشی، زۆر قورسترە لە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ خودی نەخۆشییەکەدا."

پشکنینی مانگانە لە خودی نەخۆشییەکە خراپتر بوو. لەگەڵ کیك دەچووین بۆ ئیندیانا پۆلیس و لە هوتێلی نزیك نەخۆشخانەکە دەماینەوە. بەیانی ڕۆژی دواتر، کاتژمێر پێنج لەخەو هەڵدەستاین تا شلەی تایبەتی (MRI) و سی تی سکان و رادیۆلۆژی بخۆمەوە. تامێکی ناخۆشی هەبوو، شتێکی وەك ئاسنی تواوە. ئەزموونێکی ترسناك بوو کە دووبارە لەو هوتێلە، لەخەو هەستی، بچی بۆ نۆڕینگەی پزیشك و پێت بڵێ شێرپەنجەت هەیە.

"کیك"یش لەگەڵ من لەخەو هەڵدەستا. کاتێك ئەو تێکەڵەیەم دەخواردەوە، دەستی بە پشتمدا دەهێنا. جارێك بۆ ئەوەی دڵخۆشم بکات، قومێکی لێ خواردەوە.

دواییش بۆ ئەنجامدانی پشکنینەکانی خوێن و (MRI) چووین بۆ نەخۆشخانە. پزیشکەکان تێشکە وێنەکانیان لەسەر لایت باکس ریز دەکرد و گلۆپەکەیان دادەگیرساند. لە ترسی ئەوەی نەکا پەڵەی سپی ببینم، سەیرم نەدەکرد. کیك هیچ لەو وێنانە تێنەدەگەیشت، جارێك ئاماژەی بە

وێنەکە کرد و بە نیگەرانییەوە پرسی: "ئەمە چییە؟" وتم: "ئەمە پەراسووە."

کاتێك لەوێ دادەنیشتین، هەردووکمان بیرمان لە یەك شت دەکردەوە: من ئیتر ئەوینی ژیانی خۆم دۆزیوەتەوە، کەسێك کە لەم دنیایەدا هەموو شتێکی منە. ئەگەر بە هەر هۆکارێك ئەوم لەدەست بدایە، دەمردم. هەستێکی ناخۆش بوو، هێشتاش هەر کات بیرمان دێتەوە، نیگەران دەبین.

بەڵام هەموو وێنەکان روون بوون و پشکنینەکانی خوێنیش نۆرماڵ بوون. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، ئەگەری گەڕانەوەی نەخۆشییەکە کەمتر بوەوە.

ئیتر قۆناغی پشووی دوای نەخۆشی کۆتایی هاتبوو، من تەواو لەشساغ بووم. کاتێك لە تەواو بوونی ساڵەکە نزیك بووینەوە، کریس کارمایکل پێداگری دەکرد کە دووبارە پێشبڕکێ بدەین. خۆی هاتە ئاستین تا لەمبارەوە پێکەوە قسە بکەین. بە بۆچوونی ئەو، من پێویستم بەوە بوو کە دووبارە بگەڕێمەوە سەر پاسکیل و هێشتا کۆمەڵێك کاری نیوە تەواوم لە وەرزشدا هەبوو کە بەبێ ئەنجامدانی ئەوان، هەستم بە بۆشایی دەکرد.

کریس چەند کاتژمێرێکیش لەگەڵ بیل ستاپیلتۆن قسەی کردبوو، پێی وتبوو: "هەمووان پێی دەڵێن هەر کارێکت پێخۆشە بیکە، بەڵام هیچ کەس سەبارەت بە پاسکیلسواری قسەی لەگەڵ ناکات."

بە بڕوای ئەو، دەبوو کەسێك هانم بدات و پەیوەندی ئێمە هەمیشە جۆرێك بوو کە لەکاتی پێویستدا، کریس دەبوو هانم بدات. باش دەمزانی کە کریس ئەم گەشتەی لەبەر چی کردووە. بە جان کورێۆسم وت: "کریس هاتووە تا ناچارم بکات بەشداری لە پێشبڕکێکاندا بکەم، بەڵام خۆم هێشتاش لەم شتە دڵنیا نیم."

من و کریس بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ چووین بۆ ڕێستورانت و پێشبینییەکانی من تەواو وەڕاست گەڕان.

"لانس، بۆچی یاری گۆڵف دەکەیت؟ تۆ دەبێ دەست بە پاسکیلسواری بکەیتەوە."

سەرم بۆ لەقاند و وتم: "نازانم."

-"دەترسی؟"

دەترسام. پێشتر توانام لەسەر پاسکیل بەئەندازەی یەك جوانەگا بوو. بەڵام ئێستا چی؟

ئەگەر دیسان شێرپەنجەکە گەڕایەوە چی؟

کریس وتی: "هیچکام لە پزیشکەکان نەیانووتووە دەتوانی دووبارە لە پێشبڕکێکاندا بەشداری بکەی، بەڵام هیچ کامێکیشیان نەیانووتووە، چیتر ناتوانی پێشبڕکێ بکەیت. بە بۆچوونی من پێویستە جارێکی دیکەش تاقی بکەیتەوە. کەس نازانێ ئەنجامەکەی چی دەبێ، سەرچڵییەکی گەورەیە، ململانێیەکی گەورە و ترسێکی گەورەیە. هیچ شتێك دیار نییە. بەڵام تۆ

لێرەی، زیندووی و پێویستە دووبارە بگەڕێیتەوە بۆ ژیان."

ئەم بابەتە چەند ڕۆژێك بیر و زەینی منی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد. دەکرێ چارەسەری کیمیایی وەربگری و پاشان وەك ژمێریارێك کار بکەی، بەڵام پاسکیلسواری چی؟ دەکرێ ببم بە پاسکلیسوارێکی پیشەیی؟ نەمدەزانی. چارەسەری کیمیایی قورسترین هەورازەکانی ئاڵپیشی لەبەر چاومدا ڕێك و تەخت کردبوو.

شتێکی دیکەش هەبوو: بیمەی بێکاری بۆ ماوەی پێنج ساڵ مووچەی پێدەدام. بەڵام ئەگەر دەستم بە پاسکیلسواری بکردبایەوە، مووچەکەیان دەبڕیم.

کریس چاوی بە "کیك"یش کەوت و هەروا جەختی لە من دەکردەوە کە دەست بە پاسکیلسواری بکەمەوە. بۆم روون دەکردەوە کە من خۆشم نازانم چی لەو تەمەنە بکەم کە ماومە، بەڵام ئەو رازی نەدەبوو. دواجار رووی لە کێك کرد و وتی: "بۆچوونی تۆ لەسەر ئەم بابەتە چییە؟"

"هیچ جیاوازییەکی بۆ من نییە، ئێستا من شێتانە خۆشم دەوێت."

کریس سەیرێکی منی کرد و وتی: "زۆر باشە، لەسەر چی وەستاون، پێکەوە هاوسەرگیری بکەن."

دواجار بڕیاری خۆم دا: دووبارە بەشداری پێشبڕکێکان دەکەم. دەستمکردەوە بە پاسکیلسواری و ئەمجارە، هەستێکی باشم هەبوو. بە بیل و کیکم وت: "پێموایە دەتوانم." داوام لە کریس کرد بەرنامەیەکی

ڕاهێنانم بۆ دانێ و زۆر بە گرموگوڕی دەستم بە ڕاهێنان کرد. بەڵام بچم و فۆڕمی لەشم نەدەگەڕایەوە سەر دۆخی جاران. پێشتر کێشم ١٧٥ پۆند (نزیکەی ٨٧ کیلۆ) بوو، بەڵام ئێستا ٧٩ کیلۆ بووم. دەموچاوم باریك و درێژ بوو بوو، هەروەها دەمارەکانی قاچیشم بەتەواوی بەدەرەوە بوون.

بیل پەیوەندییەکی بە کوفیدیسەوە کرد و بابەتەکەی بۆ ڕوون کردنەوە. "دەمەوێ سەبارەت بە بەرنامەی لانس قسەتان لەگەڵ بکەم. ئەو ئامادەی گەڕانەوەیە." ئەوانیش داوایان لە بیل کردبوو بچێتە فەرەنسا تا لەم پەیوەندییەدا پێکەوە دابنیشن.

"بیل"یش هەر شەو بە فڕۆکە چووبوو بۆ پاریس. لە پاریسەوە تا نوسینگەی کوفیدیس بە ئوتۆمبێل ڕێی چوار کاتژمێر بوو. دواجار بۆ نانی نیوەڕۆ گەیشتبووە ئەوێ. میگرین، دوای بەخێرهێنانی بیل، پێنج خولەك قسەی کردبوو پاشانیش وتبووی: "سوپاست دەکەین کە بەشداریت لەم دانیشتنەدا کرد، بەڵام پێویستە ئەوە بزانی کە دەمانەوێ کۆتایی بە گرێبەستەکەمان بێنین." بیل سەیرێکی بوندیۆ دەکات و دەڵێ: "قسەکانی ئەو جددییە؟" بوندیۆش لە وەڵامدا، سەری دەادەخات و دەڵێ، "بەڵێ"

"تەنیا بۆ وتنی ئەم قسەیە منتان بانگ کرد بۆ ئێرە؟"

-"ئێمە پێمانوابوو ڕەنگە وا باشتر بێ ڕووبەڕوو باسی ئەم بابەتە بکەین."

"سەیربکەن، لانس چاوەڕوانی مووچەی زۆری لە ئێوە نییە، تەنیا

بواری پێبدەین بەشداری پێشبڕکێ بکات. ئەو هەر بەڕاستی دەیەوێ بگەڕێتەوە. ئێمە لەسەر بنەمای گومان و بۆچوون قسە ناکەین، بەڵکو زۆر لەم بابەتە دڵنیاین."

کوفیدیس دڵنیا نەبوو کە من بتوانم لەو ئاستەدا پێشبڕکێ بدەم. تەنانەت ئەگەر پێشبڕکێشم بکردبایە و دیسان نەخۆشییەکەم بگەڕایەتەوە، لە زەرەری ئەوان بوو.

بیل تەواو بێ هیوا بوو بوو. "ئەوە بزانن کە سەردەمانێك ئەو ئەندامی تیمەکەی ئێوە بووە و ئێوە مووچەتان بەو دەدا. لانیکەم پێشنیارێك بە ئێمە بدەن." دواجاریش بەرپرسانی کوفیدیس وتبوویان، بیرێکی لێدەکەینەوە.

بیل بێ ئەوەی نانەکەی تەواو بکات، بە ئۆتۆمبێل گەڕابۆوە بۆ پاریس. بیلی داماو نەیتوانیبوو ئەم هەواڵە بە من راگەیەنێت. دواجار لەپاڵ بورجی ئێڤڵ، کافتریایەکی پەیدا کردبوو، لەوێوە بە موبایلەکەی پەیوەندی بە منەوە کرد.

وتم: "خەبەر چییە؟"

-"کۆتاییان بە گرێبەستەکە هێنا."

هەڵوێستەیەکم کرد و وتم: "کەواتە بۆچی ئەو هەموو رێگایەیان بە تۆ برِێ تا بچیتە ئەوێ؟"

لە ماوەی چەند رۆژی دواتردا، لە دڵی خۆمدا خواخوام بوو بۆچوونی

بەرپرسانی کوفیدیس بگۆڕێ. دواجار ئەوان پەیوەندیان کرد و بڕی ١٨٠,٠٠٠ (سەد و هەشتا هەزار)یان پێشنیار کرد. هەڵبەت ئەگەر بمتوانیبایە ئیمتیازەکانی یەکێتی نێودەوڵەتی پاسکیلسوارەکان بەدەست بهێنم، ئەم بڕە پارەیە زیادی دەکرد. ئەو بڕە پێشنیارکراوە لانیکەمی بڕە پارەیەك بوو کە بۆ بەشداری لە پێشبڕکێکاندا پێشنیاریان دەکرد، بەڵام ئیتر چارەیەکمان نەبوو.

بیرێك بە مێشکی "بیل"دا هاتبوو. ئەویش ئەوە بوو کە هەموو ساڵێك لە یەکەم هەفتەی مانگی سپتەمبەردا، پێشانگایەکی گەورە لە ئاناهایم (Anaheim California)ی کالیفۆرنیا دەکرێتە و هەموو نوێنەری یانە ناودارەکان بەشداری تێدا دەکەن. بیل پێیوابوو ئەگەر لەو پێشانگایەدا بەشداری بکەم و گەڕانەوەی خۆم بۆ پاسکیلسواری رابگەیەنم، ئەنجامێکم وەردەگرت.

"لانس، پێویستە تۆ لەبەردەم هەواڵنێرەکان دەربکەوی و بە هەموان رابگەیەنی کە بڕیارت داوە پاسکیلسواری بکەیت و ئامادەی کە گرێبەست واژۆ بکەیت."

رێکەوتی چواری سپتەمبەری ١٩٩٧، لەگەڵ بیل چووین بۆ پێشانگاکە تا هەواڵی گەڕانەوەم بۆ وەرزی ٩٨ بە هەمووان رابگەیەنم. لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا بەشداریم کرد و بە ئامادە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە هەواڵنێران و پسپۆڕانی پاسکیلسواری، باسی بەرنامەکانی خۆم کرد. وتم لەبەر نەخۆشی یەك ساڵم لەدەستدا و پاش چاکبوونەوەم،

کوفیدیس لە توواناکانم بە گومانە. ئێستا ئیتر هەموو دنیای پاسکلیسواری ئاگایان لەم مزایەدە(هەڕاج کردنە)یە بوو. چاوەڕوانی پێشنیارەکانی ئەوان بووم، بەڵام هیچ رووی نەدا.

ئەوان منیان نەدەویست. یەکێك لە بەرپرسانی پاسکیلسواری فەرەنسا گفتوگۆیەکی کورتی لەگەڵ بیل کردبوو، بەڵام کاتێك بیل باسی ٥٠٠,٠٠٠ (پێنج سەد هەزار) دۆلاری کردبوو، ئەویش بە ساردییەکەوە وتبووی: "خۆ ئەمە مووچەی پاڵەوانەکانە. ئەو بڕە پارەی کە تۆ پێشنیاری دەکەی، بۆ پاسکیلسوارە گەورەکانە." تیمی سیکۆکانۆندل (Saeco-Canondale)یش بۆ رۆژی دوایی کاتی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بیل دانابوو تا لەم بارەوە گفتوگۆ بکەن. بەڵام لەکاتی دیاریکراودا نەهاتبوون. بیل هێندە بەشوێنیاندا گەڕابوو تا دواجار ئەوانی لە کۆبوونەوەیەکدا دۆزیبۆوە. ئەوانیش وتبوویان: "ئێمە پەشیمان بووینەوە."

هیچ یانەیەکی ئەورووپی ئامادە نەبوو گرێبەست لەگەڵ مندا واژۆ بکات. لە هەموو ٢٠ تەلەفۆنێکدا کە بیل دەیکرد، رەنگە تەنیا ٣ کەسیان، دووبارە پەیوەندیان بکردبایەوە.

رۆژان دەهاتن و دەچوون، لە کاتێکدا کە هیچ کەس هیچ پێشنیارێکی بە من نەدەدا و من تووڕە و تووڕەتر دەبووم. دواجار بیل ستاپیلتۆن، گوڕزی ئەو کارەی خوارد و ئەم رووداوانە، بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندی هاوڕێیەتی نێوانمان. ساڵ و نیوێك دەبوو کە ئەو هەموو رۆژێك هەواڵی ناخۆشی بۆ من دەهێنا، بیل ئاگاداری کردمەوە کە من بیمەی

تەندروستیم نییە، یان ئەوەی کە کوفیدیس کۆتایی بە گرێبەستەکە هێناوە و ئێستاش دەبوو بڵێ، هیچ کەس منی ناوێت.

پەیوەندیم بە دایکمەوە کرد، بابەتەکەی کوفیدیسم بۆ باس کرد و وتم هیچ تیمێکی دیکەش مەیلی یارمەتی تێدا نییە. هیچ تیمێك. لە پشت هێڵی تەلەفۆنەکەوە هەستم بە نیگەرانی ئەو دەکرد. بەڵام دووبارە هەمان شێوە دەربڕینە پڕ لە وزەکەی لە قسەکانیدا دەرکەوت.

"دەزانی چییە؟ ئەمە تەنیا شتێکە کە ئەوان دەتوانن بە تۆی بڵێن، چونکو تۆ بەوانت سەلماند کە هەڵەیەکی گەورەیان کردووە."

بەتەواوی متمانە بەخۆبوونم لەدەست دابوو. بەردەوام ڕوو بەڕووی کەسانێك دەبوومەوە کە سووکایەتیان پێدەکردم. شەوێك من و کیك بۆ میوانییەك دەعوەت کراین. هاوکارەکانی "کیك"یش لەوێ بوون. من و کیك، لە یەکتر دوورکەوتینەوە و کیك لەگەڵ دوو کەس لە هاوکارەکانی سەر گەرمی قسە بوو. یەکێك لەوان بە کیکی وتبوو: "ئەوە هاوڕێ کوڕە جدییەکەتە؟" پاشان بە جفرە، ئاماژەی بە زەکەرم کردبوو.

"دڵنیای بەکەڵکت دێ؟ ئاخر ئەو بە نیوە پیاو دادەندرێت."

کیك بە بیستنی ئەم قسەیە وشك بوو بوو، لە وڵامدا وتبووی: "قسەکەت هەر بایەخی وەڵامدانەوەشی نییە. گاڵتەیەکی باش نەبوو." لەنێو خەڵکەکەدا منی دۆزییەوە و باسەکەی بۆ گێڕامەوە. بە بیستنی ئەم قسەیە پێش چاوم تاریك بوو. بەڕاستی دەبێ کەسێك گەمژە بێ تا قسەیەکی لەو شێوەی بە زماندا بێت، یان ڕەنگە هێندەی ئارەق

خواردبێتەوە کە ئاگای لە خۆی نەمابێت. دەبوو تۆڵەی لێبکەمەوە، بۆیە کە لە پەنایەوە تێپەڕ بووم، توند خۆم پێداکێشا.

کریستین ئەم کارەی منی پێخۆش نەبوو، بۆیە لێمان بوو بە دەمەبۆڵە. پاش ئەوەی کە ئەوم گەیاندەوە، چوومەوە ماڵەوە و نامەیەکی زۆر توندم بۆ ئەو گرگنە پیاوە نووسی. لە نامەکەدا شێرپەنجەی گون و هەندێك ئامار و ژمارەم بۆ روون کردەوە. "باوەڕ ناکەم بتوانی ئەم قسەیە بە کەسێك بڵێی، چ جای ئەوەی بە هاوڕێ کچەکەمی بڵێی. ئەگەر بەڕاستی پێتوایە ئەم شتە سەرنجڕاکێشە، ئەوە بزانە کە کێشەت هەیە. باسی مەرگ و ژیانە. بابەتەکە ئەوە نییە کە من یەك گونم هەیە، دووەم هەیە یان پەنجا دانەم هەیە." بەڵام کە نامەکە تەواو بوو، هێشتاش خەمبار بووم، بۆیە دووبارە چووم بۆ ماڵی کیك و دیسان سەبارەت بەم بابەتە پێکەوە قسەمان کرد. بەڵام ئەمجارە کیك نیگەرانی کارەکەی بوو، دەترسا بەهۆی ئەم رووداوەوە لە کارەکەی دەری بکەن.

بیل هەر وا دەگەڕا تا یانەیەکی گونجاو بۆ من بدۆزێتەوە. وەك ئەوە وابوو کە بیەوێ بۆ مەلەوانێکی ئاستی "ب" یانەیەك بدۆزیتەوە و کەس ئامادە نەبێ قسەی لەگەڵدا بکات. هەمووان وەك مێروویەکی وەڕزکەر رەفتاریان لەگەڵ ئەودا دەکرد. "بیل"یش بەرگەی ئەم رەفتارانەی دەگرت و لە ئاست قسە ناخۆشەکانی خەڵکدا بۆ من بوو بووە قەڵغان. جارێك، کەسێك بەوی وتبوو: "ئەو هیچکات ناتوانی پێشبڕکێ بکات. ئەوەی کە ئەو بتوانێ جارێکی دیکە بەو خێراییەی جاران پاسکیلسواری

بکات، زیاتر لە نوکتە دەچێت."

دواجار بیل توانی لە یو. ئێس پۆستاڵ سێرڤیس ( U.S Postal Service) جێگایەك بۆ من وەدەست بخات. ئەم یانەیە لە لایەن ئەمریکییەکانەوە بنیات نرابوو، لە لایەن خۆشیانەوە پشتیوانی دەکرا. سەرمایەگوزاری سەرەکی یانەکە، توماس ویسل ( Thomas Weisel) بوو. ناوبراو خەڵکی سانفرانسیسکۆ و لە هاوڕێ کۆنەکانی من و خاوەنی پێشووی یانەی سوبارۆ مونتگۆمری بوو. کێشەی سەرەکی لەسەر پارە بوو. ئەوانیش مووچەیەکی کەمیان پێشنیار کردبوو.

بیل چوو بۆ سانفرانسیسکۆ و وتووێژی لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی یانەی مارك گرۆسکی (Mark Gorsky) کرد. ئەم وتووێژە چەند ڕۆژێکی خایاند، بەڵام هیچ ڕێکەوتنێکی لێنەکەوتەوە. دەمەویست واز لە هەموو شتێك بهێنم. هێشتا پێشنیارەکەی کوفیدیس وەك خۆی مابوو، بەڵام هێندە تووڕە بووم کە دەمویست واز لە پاسکیلسواری بهێنم. لە لایەن بیمەوە، بۆ ماوەی پێنج ساڵ و مانگانە بیست هەزار دۆلاریان دەدا بە من کە تێکڕا، یەك ملیۆن دۆلار و نیوی دەکرد. بەڵام ئەگەر دووبارە دەسستم بە پاسکیلسواری بکردبایەوە، لەم بیمەیە بێبەش دەبووم. بە خۆم وت ئەگەر بڕیارە کارێکی سەر پێی بکەم، دەبێ گوێ لە دڵم بگرم و ئەگەر زۆرم حەز لێی نییە، نابێ بیمەکەشم بخەمە مەترسییەوە.

پێش ئەوەی بیل سانفرانسیسکۆ جێبهێڵێ، بڕیاردرا کە بیل، جارێکی دیکە سەردانی نوسینگەی تۆرن ڤیسل بکات تا خواحافیزیان لێبکات و

سەبارەت بەوە قسەیان لەگەڵ بکات کە ئەگەر هەڵێك هەبوو ئاگادارمان بکەنەوە. نوسینگەی ئەو لە شوقەیەکی بەشکۆ لە بینای ترنس ئەمریکا بوو، بیل بە دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەوە چوو بوو بۆ ئەوێ.

بیل، لەگەڵ تۆرن و مارك گرۆسکی قسەی کردبوو، تۆرن بێ پێشەکی وتبووی: "بیل ئەو چی دەوێت؟"

"مووچەی بنەڕەتی ٢١٥,٠٠٠ (دوو سەد و پانزە هەزار) دۆلار و هەروەها ئەگەر پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی، خوازیاری مەرجی باشترە."

یەکێتی نێودەوڵەتی پاسکیلسواری بەگوێرەی دەرکەوتنی کەسەکە لە پێشبڕکێ گەورەکاندا، خاڵ دادەنێ و ئەگەر باشم پێشبڕکێ بکردایە، دەمتوانی کەمی مووچەکەم بەو خاڵانە قەرەبوو بکەمەوە. بیل بەوانی وتبوو کە من لە بەرامبەر هەر خاڵێکدا ٥٠٠ دۆلارم دەوێ تا ئەوەی دەگاتە ١٥٠ خاڵ و دوای ئەوە، لە بەرامبەر هەر خاڵێکدا ١٠٠٠ دۆلار وەردەگرم.

-"ئایا ئاستێکتان بۆ ئەم خاڵانە داناوە؟"

بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەم قسەیە بە ستایش دادەندرا، چونکە ئەوان نیگەرانی ئەوە بوون کە ئەنجامەکانی من ئەوەندە باش بن کە زۆریان لەسەر بکەوێت.

بیل لە وەڵامدا وتبووی: "هەرگیز."

تۆرن بە ساردییەکەوە سەیری بیل دەکات. چەند هەفتە بوو دانوستانیان لەسەر ئەم بابەتە دەکرد و بەهیچ ئەنجامێك نەدەگەیشتن.

تۆرن نەرم و جددی بوو. بەڵام لە لایەکیشەوە منی دەناسی و باوەڕی پێمبوو. دەمی کردبووەوە تا قسەیەك بكات. بیل بۆ بیستنی قسەی كۆتایی خۆی ئامادە كردبوو.

"قبوڵە."

بیل هەناسەیەكی ئاسوودەیی هەڵدەمژێت. دواجار رێككەوتین. ئێستا دووبارە دەمتوانی بەشداری پێشبڕكێكان بكەم. گرێبەستەكەم واژۆ كرد و كۆنفرانسێكی رۆژنامەوانی گەورە سازكرا تا من وەك یەكێك لە ئەندامانی یانەكە بناسێنن. لەو كۆنفرانسەدا وتم: "هەرگیز وا بیرناكەمەوە كە پاسكیلسوارێكی پێكراوم. هەست دەكەم بەتەواوی شیاوێتی خۆم لەدەست داوە و هەڵبەت هەر بەڕاستیش بەو شێوەیە." مانگی نۆڤەمبەر و دیسەمبەر لە ئەمریكا راهێنان دەكەم و مانگی ژانویە بۆ بەشداری كردن لە پێشبڕكێدا، دەچمە دەرەوەی وڵات. بەمجۆرە خەریكبوو دووبارە ژیانی رابووردووم دەست پێدەكردەوە، جانتایەك و گەڕان بە ئەورووپادا.

بەڵام كێشەیەك هەبوو ئەویش كیك بوو. بۆ بینینی دایكم چووم بۆ پلانۆ. كاتی نانی بەیانی خەریكی خواردنەوەی قاوە بووین كە وتم: "باشە با ئەمڕۆ بچین سەیری ئاڵتوون بكەین." دایكم بزەیەكی بۆ كرد، ئەو باش دەیزانی باسی چی دەكەم. ئەو رۆژە هەموو ئاڵتوون فرۆشییەكانی دالاس گەڕاین.

گەڕامەوە بۆ ئاستین و میوانییەكی دوو كەسیم رێكخست. لەسەر

دیواری پشتەوەی خانووەکەم و لەسەر رۆخی رووبارەکە دانیشتبووین و سەیری ئاوابوونی خۆرمان دەکرد. دواجار وتم: "دەبێ بگەڕێمەوە بۆ ئەورووپا، بەڵام بە بێ تۆ ناچم. حەز دەکەم تۆش لەگەڵم بێیت."

خۆر لە پشت کەناری رووبارەکە ونبوو، تاریکی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا. تەنیا رووناکی ماڵەکەی من ئەو دەوروبەری رووناک کردبۆوە.

هەستام و وتم: "ئەمڕۆ شتێکم کڕیوە. دەبێ پیشنات بدەم." دەستم کردە نێو گیرفانم و ئەو قوتووە بچووکە قەیفەییەم خستە چنگمەوە و وتم:

"بچینە شوێنێك کەمێك رووناك بێت."

"شووم پێبکە." و

"کیك"یش قبوڵی کرد.

هیچکات سەبارەت بە داهاتووی نەخۆشییەکەم پێکەوە قسەمان نەکردبوو. هەمیشە کیك بۆ پشکنینی مانگانە لەگەڵم دەهات و لە بەرامبەر وێنەکانی رادیۆلۆژی دادەنیشتین، بەڵام هیچکات لەم پەیوەندییەدا قسەم نەکردبوو. بەڵام کاتێك بووین بە دەزگیران، یەکێك لە هاوڕێیانی دایکی کیك بەوی وتبوو: "چۆن هێشتت کچەکەت لەگەڵ تووشبوویەکی شێرپەنجەدا هاوسەرگیری بکات؟" تازە ئەمە راچەنینێك بوو کە وای کرد ئێمە بیر بکەینەوە. کیك تەنیا وتی: "من ئەوەم پێ باشترە ساڵێك

ژیانێکی خۆشم هەبێ تا هەفتا ساڵ ژیانێکی ئاساییم هەبێ. بۆچوونی من ئەمەیە کە سناریۆی ژیان، پێشوەخت دیار نییە. تۆ نازانی بڕیارە چی ڕوو بدات. هیچ کەس نازانێت."

من و کیك کەلوپەلەکانمان کۆکردەوە و بەرەو سانتا باربارا بەڕێکەوتین. من دەستم بە بەرنامەیەکی ڕاهێنانی دوو مانگە کرد. لە ڕۆخی دەریادا خانوویەکی بچووکمان بەکرێ گرت و ئەوێمان ئەوەندە پێخۆش بوو کە بڕیارماندا هەر لەوێ زەماوەند بکەین. ڕێوڕەسمی بووکێنییەکەمان بۆ مانگی مەی دواخست.

مانگی جەنیوەری، چووین بۆ ئەورووپا و زستان و بەهاری ساڵی ۹۸مان لەوێ بەڕێ کرد. دووبارە چوومەوە یانە، ڕاهینانەکانی لەشجوانیم دەستی پێکرد و بەرەبەرە، ماوەی ڕاهێنان و پاسکیلسواریشم زیاد کرد. لە سانتاباربارا، بەڕادەیەك جوان پاسکیلسواریم دەکرد کە هەمووانم تووشی سەرسوڕمان کردبوو. ڕۆژێك لەگەڵ فرانکی ئاندرۆ چووبووین بۆ پاسکلیسواری، فرانکی وتە: "کوڕە تۆ خەریکە هەمووان دەپسێنی، تازە شێرپەنجەشت هەبووە."

ئێستا ئیدی من بە یەکێك لە ڕزگاربووانی شێرپەنجە دادەندرام. ڕێکەوتنی دووی ئۆکتۆبەر، واتە ئەو ڕێکەوتەی کە دەرکەوتبوو شێرپەنجەمە، ڕێوڕەسمی ساڵیادم سازکرد. بەپێی قسەی پزیشکەکان، ئەگەری گەڕانەوەی نەخۆشییەکە زۆر کەم بوو. ڕۆژێك، لە لایەن نیکۆلۆزەوە نامەیەکی کورتم پێگەیشت:

"کاتی ئەوە هاتووە لەگەڵ ژیاندا هەنگاو بنێیت." بەڵام چۆن لە دەست شێرپەنجە رزگارت بوو؟ لەم بارەوە هیچ کەس هیچ قسەیەکی بۆ وتن نییە. واتە چی؟ واتە ئەوەی کە کاتێك قۆناغی چارەسەری کۆتایی دێ، پزیشکەکان دەڵێن: باشە چاکبوویتەوە، برۆ ژیانی خۆت بکە. بەڵام هیچ سیستمێکی پشتیوانی بۆ یارمەتی بە مرۆڤ بۆ هەڵکردن لەگەڵ کاریگەرییە سۆزدارییەکانی گەڕانەوە بۆ ژیانی ئاسایی لە داوی ئەو ململانێ دوورودرێژە بوونی نییە.

بەمجۆرە نییە کە بەیانی رۆژێك لەخەو هەستی و بڵێی: "زۆر باشە، شێرپەنجەکەم چاك بۆتەوە و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بگەڕێمەوە سەر ژیانی پێشووم. ستیسی پۆندز، ئەم بابەتەی پێ سەلماندنم. من چیتر لە رووی جەستەییەوە کێشەیەکم نەبوو، بەڵام هێشتا لە رووی رۆحی و دەروونییەوە پێویستم بە سارێژبوونەوە هەبوو. لەڕاستیدا خەریکبوو دەچوومە نێو قۆناغی "گەڕانەوەی دووبارە بۆ ژیان". دەبوو ژیانم چۆن بێ؟ دەبوو ئێستا چ کارێك بکەم؟ چارەنووسی مۆتەکەی شەوانە و خەونەکانم چی دەبوو؟

ئەو کاتەی کە نەخۆش بووم، بەڵێنم بە خۆم دا کە چیتر جوێن نەدەم، خواردنەوە کحولییەکان نەخۆمەوە، و هەڵسوکەوتی ناشرین نەنوێنم. مەبەستم بوو لە دوای قۆناغی نەخۆشییەکە، پاکترین مرۆڤی ڕووی زەوی بم. بەڵام ژیان بەردەوام بوو. لەسەر ڕێی خۆی هەموو شتێکی دەگۆڕی و ئەو ویست و ئیرادەیەی لاواز دەکرد.

چۆن گەڕایتەوە دنیای ئاسایی؟ ئەمە پرسیارێك بوو کە دوای شێرپەنجەکە بەردەوام لە خۆمم دەپرسی، ئەو وتە کۆنەم دەکەوتە بیر کە دەڵێ: "دەبێ هەموو ڕۆژێك بەو شێوەیە بژی کە وەك بڵێی دواین ڕۆژی ژیانتە." بەڵام دیسان بێ سود بوو. لەڕاستیدا ئەمە هەستێکی باش بوو بەڵام لە کردەوەدا، جێبەجێ نەدەکرا.

خەڵك گەڕانەوەی منیان بۆ ژیان بە سەرکەوتن دەزانی. بەڵام ئەم گەڕانەوەیە لە هەوەڵەوە بەڕاستی بەئازار بوو. کاتێك ساڵێکی تەواو، بە ترس لە مردن بژی، شیاوی ئەوەی کە ئەو تەمەنەی ماوتە لە پشوودا بەسەر بەری. هەڵبەت ئەمە بۆ کەس نالوێ، چونکە دەبێ بگەڕێیتەوە نێو بنەماڵە و هاوڕێیانت و درێژە بە کار و پیشەی خۆت بدەیت.

مانگی جەنیوەری، لەگەڵ تیمی پۆستال ئەمریکا چووین بۆ ئەورووپا. کیك وازی لە کارەکەی هێنا، وازی لە سەگەکەی هێنا، خانووەکەی دا بەکرێ و هەموو کەلوپەلەکانی خۆی کۆکردەوە. شوقەیەکمان لە کاپ

فێرت (Cap Ferrat) لە نێوان نایس و مۆناکۆدا بەکرێ گرت و من ئەوم بەتەنیا جێهێشت، چونکە پێشبڕکێ شوێنی ژنان نییە. رێك وەك پیشەیەك و کارکردن لە فەرمانگەیە، هەر بۆیە نەمدەتوانی کیك لەگەڵ خۆمدا بەرم.

کریستین لە وڵاتێکی دیکە بەتەنیا دەژیا، هاورێیەکیشی نەبوو، زمانی ئەو وڵاتەشی نەدەزانی. بەڵام ئەو لە کارەکەی خۆیدا سەرکەوتوو بوو، خولێکی چڕی زمانی فەرەنسی بینی، شوقەکە ئاوەدان کردەوە و بەبێ هیچ ترس و سکاڵایەك، رێك وەك سەربەگۆبەندێك درێژەی بە ژیان دەدا. ئەو مایەی شانازی من بوو.

بەڵام من بارودۆخم زۆر باش نەبوو، چونکە دەبوو لەگەڵ دژوارییەکانی پێشبڕکێ لە ئەورووپادا هەڵبکەم. لە ماوەی نەخۆشییەکەدا، ئەمجۆرە ئاستەنگ و دژواریانەم لەیاد کردبوو. دوایین جار کە چووم بۆ ئەورووپا، ئەو کاتە بوو کە لەگەڵ کیك بۆ بەسەربردنی پشووەکان چووم بۆ ئەوێ. لەو گەشتەدا، لە باشترین هوتێلەکان ماینەوە و گەشتێکی تەواو توریستییانە بوو، بەڵام ئەمجارە دەبوو لە پانسیۆندا بمێنمەوە، بەو خۆراك و قەرەوێڵە ترسناکانەوە، دەبوو بەردەوام لە گەشتدا بوومایە، من هەر هیچ حەزم بەم گەشتانە نەبوو.

راستییەکەی ئەوە بوو کە من هێشتا ئامادەی ئەمجۆرە گەشتانە نەبووم. سەر لەنوێ گەڕانەوەی من بۆ ژیان، پڕ لە کێشە گەلی دەروونی بوو. بەڕاستی ماندوو بووم، لە ماوەی یەك ساڵدا، سێ نەشتەرگەری، سێ

مانگ چارەسەری کیمیایی و بە کورتییەکەی ساڵێکی دۆزەخیم بەرێ کردبوو. هەر لەبەر ئەوە بوو کە نەمدەتوانی بە باشی پاسکیلسواری بکەم. چیتر لەشم هەرگیز وەك جارانی لێنەدەهاتەوە، بەڵام شتێك کە دەبوو من بە خۆمی بڵێم ئەوە بوو: "وای دابنێ ڕۆژێکی زۆر خراپت پشت سەر ناوە."

بە شك و گومان و کەمێك پەشیمانی پایدەرم لێدەدا، داهاتەکەم تەنیا بەشێکی داهاتی پێشووم بوو، گرێبەستێکی نوێشم نەبوو. دەربڕینی کینە ئامێزی من بۆ ئەم دۆخە، "باجی ٨٠٪ی شێرپەنجە" بوو. پێموابوو لەگەڵ ئەوەی کە رایدەگەیەنم گەڕاومەتەوە، ئەوان شوێنم دەکەون، بەڵام بەو شێوە نەبوو، من لۆمەی "بیل"م دەکرد. ئەوم شێت کردبوو، بەردەوام لێم دەپرسی، بۆچی گرێبەستی نوێم بۆ پەیدا ناکەیت. دواجار ئەو کاتەی من لە ئەورووپا بووم و ئەویش گەڕابۆوە بۆ تەکساس، لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا، لێمان بوو بۆ دەمەقرە.

بیل وتی: "گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی، من پارێزەرێکی دیکەت بۆ پەیدا دەکەم. چیتر بەرگەی بۆڵە بۆڵەکانی تۆ ناگرم. دەزانم پێتوایە من پێویستم بەم کارەیە، بەڵام هەڵەی. کەواتە چیتر بەردەوام نابم."

پاش وەستانێکی کەم وتم: "بەڵام من ئەوەم ناوێت."

چیتر بۆڵە بە سەر "بیل"دا ناکەم، بەڵام هێشتاش پێموابوو کەس منی ناوێت. هیچ یانەیەکی ئەورووپی بانگهێشتی منی نەکرد و یانە ئەمریکییەکانیش منیان نەدەویست.

لەماوەی هەژدە مانگدا، رۆتا دل سۆل (Ruta del Sol) یەکەم پێشبڕکێم بوو، گەشتە پیاسەیەك بۆ ئیسپانیا. چواردە رۆژ بەسەر کاتی گەڕانەوە بۆ ژیان تێدەپەڕی، بەڵام من خەمۆك و تووڕە بووم. بەم شێوە گەشتانە راهاتبووم، بەڵام ئەوەی کە لەم پێشبڕکێیانەدا هەموو سەرنجەکان لەسەر من بوو، هەستێکی خراپم هەبوو. حەزم دەکرد بتوانم بێ ئەوەی ببمە جێی سەرنجی رۆژنامەکان، دیسان بگەڕێمەوە بۆ پێشبڕکێکان و بەبێ ئاگاداری ئەوانی دیکە، تەنیا خۆم لەگەڵ شك و دوودڵییەکانی خۆمدا بجەنگێم. حەزم دەکرد لە نێو پاسکیلسوارەکان ئامادە بم و قاچە بەهێزەکانم بەدەست بهێنمەوە.

دوو هەفتە دواتر، لە پێشبڕکێکانی پاریس–نایس (Paric-Nice)دا بەشداریم کرد، ئەم پیشبڕکێیە یەکێك لە قورسترین قۆناغەکانی پێشبڕکێیە کە لە دەرەوەی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس، ساز دەکرێت. رکابەرایەتییەکی هەشت رۆژە کە لە کەش و هەوایەکی نالەبار و سارددا بەڕێوە دەچێت. پێش بەڕێوەچوونی پێشبڕکێی سەرەکی، پێشبڕکێیەکی بەرایی ئەنجام دەدرێت. ئەنجامی ئەم پێشبڕکێیە، دیاری دەکرد کە لە گرووپی پاسکیلسوارەکان، کێ دەبێ لە پێش هەموانەوە پایدەر لێبدات. من بووم بە کەسی نۆزدەهەم، بۆ کەسێك کە تازە لە شێرپەنجە رزگاری بوو بوو، ئەنجامێکی خراپ نەبوو، بەڵام من بەو شێوەیە بیرم نەدەکردەوە، چونکە بە سەرکەوتن راهاتبووم.

بەیانی رۆژی دواتر، کەش و هەوا باراناوی بوو، بایەکی توندیشی

دەهات. هەر کە لەخەو هەستام، هەستم کرد نامەوێ لەم کەش و هەوایەدا پاسکیلسواری بکەم. بە بێتاقەتی نانی بەیانیم خوارد و بۆ قسەکردن لەسەر ستراتیژی ئەو ڕۆژە لە پێشبڕکێکاندا چوومە لای تیمەکەمان. بڕیار وابوو ئەگەر سەکردەی تیمەکەمان واتە جۆرج هینکاپی (George Hincapie) بە هەر هۆکارێك لەوانی دیکە دوا کەوت، چاوەڕێی بکەین تا پێمان بگاتەوە.

لە شوێنی دەستپێکردنی پێشبڕکێکە، چوومە نێو ئۆتۆمبیلەوە و هەوڵم دا خۆم گەرم ڕاگرم. بیرم لەوە دەکردەوە کە چەند باش بوو لێرە نەبام. کاتێك لەمجۆرە بیرکردنەوانە ڕوو لە مرۆڤ دەکەن، چاوەڕێی ئەوە ناکرێ کە ڕووداوێکی باش ڕوو بدات. کە چوومە نێو هەوا ساردەکەی دەرەوە، هیچ ورەیەکی باشم نەبوو. بە بێتاقەتییەوە تراکسودەکەم پۆشی و هەوڵم دەدا زۆر تەڕ نەبم.

سەرەتای ڕێگاکە تەخت بوو، باران هەروا دەباری و باکەش کەشەکەی ساردتر دەکرد. هیچ شتێك وەرزکەرتر لە پاسکیل لێخوڕین لە جادەیەکی ڕێك و لە ژێر باراندا نییە. لانی کەم پایدەر لێدان لە هەورازدا، لەش بە گەرمی دەهێڵێتەوە، بەڵام پاسکیل لێخوڕین لە جادەیەکی تەخت و ڕێکدا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ تا سەر ئێسقانی تەڕ ببێ و هیچ پێڵاو یان چاکەتێك ناتوانی لەش گەرم ڕاگرێت! تا پێش نەخۆشییەکە بەرگەی بارودۆخێکم دەگرت کە هیچ کەس خۆی بۆ نەدەگرت، بەڵام ئێستا نەمدەتوانی.

تایەی پاسکیلی سەرپەرشتی گرووپەکە پەنچەر بوو.

هەموومان وەستاین و پاسکیلسوارەکان لە ئێمە دوور کەوتنەوە. ئێمە بیست خولەك لە دوای یەکەم گرووپەوە بووین و لەم کەش و هەوایەشدا کاتژمێرێکی دەخایاند تا کاتی لەدەستچوو قەرەبوو بکەینەوە. گرووپەکانی دیکەش جێیان هێشتین کەچی ئێمە هەر لەژێر باراندا وەستابووین.

با دزەی دەکردە نێو جلوبەرگەکانم و توانای راگرتنی پاسیکیلەکەی پێنەهێشتم. لەپڕ دەستم لە سوکانی پاسکیلەکە بەردا و لە قەراغ جادەکە دانیشتم.

هاتمە قەراغ جادەکە و وازم لە درێژەدان بە پێشبڕکێکە هێنا، بلوزە ژمارەدارکەم داکەند و بیرم کردەوە: من نامەوێ ژیانم بەم شێوەیە بگوزەرێنم، نامەوێ تەر بم و رەق ببمەوە.

فرانکی ئەندرۆ رێك لە پشت سەری منەوە بوو، ئەو باش لەبیریەتی کە من لەو کاتەدا، لە چ بارودۆخێکدا بووم، بەجۆرێك لە زەوی بەرز بوومەوە کە ئەو دڵنیا بوو لەوەی کە بۆ ماوەیەك لە پێشبڕکێدا بەشداری ناکەم.

کاتێك ئەندامەکانی دیکەی تیمەکە لە کۆتایی قۆناغی یەکەمی پێشبڕکێکەدا هاتنەوە بۆ هوتێل، من کەلوپەلەکانم کۆکردبوەوە و بە فرانکیم وت: "چیتر بەردەوام نابم، چیتر نامەوێ لە پێشبڕکێدا بەشدار بم، من دەگەڕێمەوە بۆماڵەوە." هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو کە هاوتیمییەکانم لێم تێدەگەن یان نا. خواحافیزیم کرد، جانتاکەم کردە شانم و هاتمە دەر.

بڕیاری بەجێهێشتنی پێشبڕکێکە هیچ پەیوەندی بە بارودۆخی جەستەیی منەوە نەبوو. من بەهێز بووم، تەنیا حەزم نەدەکرد لەوێ بم، نەمدەزانی کە ئایا پایەدەر لێدان لە سەرما و بەئازارەوە، ویستی منە بۆ درێژەدان بە ژیان یان نا.

کاتێك پەیوەندیم بە "کیك"ەوە کرد، لە بازاڕ خەریکی شت کڕین بوو. پێموت: "ئەمشەو دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە." شەبەکەی تەلەفۆنەکەی باش نەبوو، باش گوێیێی لە دەنگم نەبوو، وتی: "چی؟ چی بووە؟"

وتم: "دوایی پێتدەڵێم."

وایزانی تووشی ڕووداو بووم، وتی: "شتێك بووە؟ زیانت پێگەیشتووە؟"

وتم: "هیچ نەبووە، ئەمشەوە دەتبینم."

چەند کاتژمێر دواتر، کیك هات بۆ فڕۆکەخانە. تا ئەو کاتەی سوار ئۆتۆمبێل بووین، هیچ قسەیەکمان پێکەوە نەکرد. دواجار وتم: "دەزانی، من نامەوێ لەم کارە بەردەوام بم".

وتی: " بۆچی؟"

وتم: "نازانم چەندەی دیکە دەژیم، بەڵام نامەوێ ئەو کاتەی ماومە بە پاسکیلسواری بیگوزەرێنم، لەم کارە و بارودۆخەکەی بێزارم، نامەوێ لە تۆ دوور بم. لەم شێوە ژیانە بێزارم، نامەوێ لە ئەورووپا بم، من لە پێشبڕکێی ڕۆتادل سۆل خۆم پیشان دا، پیشانم دا کە دەتوانم. ئیتر

شتێك نەماوە تا بە خۆم و کەسانی تووشبوو بە شێرپەنجەی بسەلمێنم، هەر ئەوەم."

خۆم ئامادە کرد تا وەلامم بداتەوە و بلێ: "هەر ئەوەندە، ئەی خولی زمان فەرەنسییەکەم چی لێدێ، کارەکەم چی. ئەی بۆچی منت هێنا بۆ ئێرە؟" بەلام هیچکام لەم شتانەی نەووت، بە ئارامی وتی: "باشە"

لەو کاتەدا کە سواری فرۆکە دەبووین بگەڕێینەوە بۆ کپ فێرت، ڕاگەیەندراوێکی هارلی دەیڤیدسۆن (hariey-Davidson)م بینی کە بەکورتی باسی لە بارودۆخی من کردبوو لە پێشبڕکێکانی ئەم دواییەدا. نووسیبووی: "ئەگەر بڕیارە دەست بە ژیانێکی نوێ بکەم.."، لە درێژەی بابەتەکەدا، چەندین رستەی وەك "...، خۆرئاوابوونی زیاتر دەبینم"ی ریز کردبوو. ئەو لاپەڕەم لە گۆڤارەکە کردەوە و لە کاتێکدا کە هەستی خۆم بۆ کیك روون دەکردەوە، ڕاگەیەندراوەکەم دا بەو. وتم: "سەیر بکە، کێشەی پاسکیلسواری ئەمەیە و هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە  کە چیتر نامەوێ درێژە بەم کارە بدەم."

کیك وتی: "چەند ڕۆژێك دان بەخۆدا بگرە با پشوو بدەین، پاشان بڕیار دەدەین." ڕۆژی دواتر کیك چوو بۆ خولی زمانەکەی ومنیش هیچ کارێکم نەکرد. بەدرێژایی ڕۆژەکە لە ماڵەوە تەنیا بووم و تەنانەت هەر سەیرێکی پاسکیلەکەشم نەکرد.

قوتابخانەکەی کیك، یاسا گەلێکی قورسی هەبوو، نەمدەتوانی پەیوەندی پێوە بکەم. سێ جار تەلەفۆنم بۆ کرد و وتم: "من ناتوانم لێرە

بێکار دانیشم، لەگەڵ نووسینگەی گەشتیاریدا قسەم کرد، ئێمە لێرە دەڕۆین، هەر ئەوەندە". کیك وتی: "من ئێستا لە پۆلدام."

وتم: "دێم بە شوێنتا، ئەم پۆلە کات بەفیڕۆ دانە." کیك لە پۆل هاتەدەر، لەسەر رەحلەیەك دانیشت و گریا، لەبەر ئەوەی چەندین هەفتە هەوڵی دابوو تا بە سەر کێشەی زماندا زاڵ ببێت. ئەو کەلوپەلی نێو ماڵی ڕێکخستبوو، لەگەڵ بارودۆخی ئەو وڵاتە و شۆفێری کردن لەو وڵاتەدا ڕاهاتبوو، هەروەها فێربوو بوو کە چۆن پارەی سەرپێچی کردن بدات. ئێستا بە ڕۆشتن لەوێ هەموو ماندوو بوونەکانی بەفیڕۆ دەچوو.

کاتێك گەیشتمە شوێنی خوێندنەکەی کیك، ئەو هێشتا هەر دەگریا. نیگەران بووم و وتم: "بۆ دەگری؟"

وتی: "لەبەر ئەوەی کە دەبێ لێرە بڕۆین."

وتم: "مەبەستت چییە؟ تۆ لێرە هیچ هاوڕێیەکت نییە، زمانەکەیان باش نازانی، کاریشت نییە. بۆ دەتەوێ لێرە بمێنیتەوە؟" وتی: "لەبەر ئەوەی کە بەرنامەی ئێمە ئەمە بوو، حەز دەکەم ئەم کارە تەواو بکەم، بەڵام ئەگەر تۆ دەتەوێ بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە، دەگەڕێینەوە."

ئەو شەوە، بایەکی توندی دەهات و کیك بەو وزە و تاقەتەوە کە کەلوپەلەکانی کردبووەوە، کۆی کردنەوە. لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا، من و کیك کارگە لێکمان کرد کە کەسانی دیکە لە دوو هەفتەدا دەیکەن. پەیوەندیم بە "کوین لوینگستۆن"ەوە کرد و تێکڕای شتەکانمان (خاولییەکان، زیوەکان، گڵۆپەکان، کەلوپەلی چێشتخانە، گەسکی

کارەبایی و...) رادەستی ئەو کرد. بە "کوین"م وت: "من ئەم خرتکە و پرتکانەم ناوێ، ئێمە چیتر هەرگیز ناگەڕێینەوە." ئەو هەوڵی نەدا قەناعەتم پێبکات، چونکە ئەو باش هەموو شتێکی دەزانی. زۆر بێدەنگ بوو، بە ڕوخسارییەوە دیاربوو کە بە بڕوای ئەو، من خەریکبوو هەڵەم دەکرد، بەڵام تەنانەت لەم پەیوەندییەشدا یەك وشەی نەووت. لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو نیگەرانی گەڕانەوەی من بوو، بۆیە دەیووت: "ئاگات لە خۆت بێ، زۆر قورس مەیگرە." ئەو بەدرێژایی ماوەی نەخۆشییەکەم، لەگەڵم بوو، تەنیا شتێك کە بەلایەوە گرنگ بوو، لەشساغی من بوو. کاتێك کە بەستە کەلوپەلەکانم پێدەدا، ئەوەندە نیگەران بوو کە پێموابوو دەیەوێ بگری. کەلوپەلەکانی چێشتخانەم دا بەو و وتم: "ئەمانە ببە."

وەك مۆتەکەیەك وابوو. کیك تەنیا بیرەوەری خۆشی منە لەو سەردەمە. لە نێو سەر لێشێواوی مندا، ئەو زۆر ئارام بوو. تەنانەت ئەگەر وازی لە من بهێنایە، لۆمەی ئەوم نەدەکرد. وازی لە کارەکەی هێنابوو، هاتبوو بۆ فەڕەنسا، هەموو شتێکی خۆی بەخت کردبوو. لە پڕ بڕیارم دابوو بگەڕێمەوە بۆ ئاستین و خانەنشین ببم، بەڵام ئەو هەر لە لام بوو، لێم تێدەگەیشت، پشتیوانی من بوو، لەهەمان کاتیشدا لەڕادەبەدەر دانبەخۆدا(ئارام)گر بوو.

لە گەڕانەوەدا هەمووان بەلایانەوە سەیر بوو. کاتژمێر هەشتی بەیانی، کە تەلەفۆنەکەی کارمایل زەنگی لێدا، هێشتا نەچووبووە دەرەوە. هەواڵنێرێکی فەڕەنسی لە پشت تەلەفۆنەکەوە بوو. پرسیاری کرد:

"ئارمێسترانگ لە کوێیە؟" کریس وتی: "ئەو لە پاریس نایسە". ئەو لە وەڵامدا وتی: "نا ئەو چیتر بەردەوام نابێت." کریس تەلەفۆنەکەی داخستەوە. خولەکێك دوای ئەوە، دیسان دەنگی تەلەفۆنەکە بەرز بوەوە، هەواڵنێریکی فەڕەنسی دیکە بوو.

کریس پەیوەندی بە "بیل ستاپێڵتۆن"ەوە کرد، ئەو وتبووی کە ئاگای لە من نییە، "ئوچ"یش هەر ئەمەی وتبوو. تەلەفۆنی بۆ موبایلەکەم و شوقەکەشم کردبوو، پەیامی بۆ دانابووم، بەڵام من وەڵامم نەدابۆوە و ئەمەش بەلایەوە سەیر بوو.

دواجار لە فڕۆکەخانەوە پەیوەندیم بە "کریس"ەوە کرد. وتم: "خەریکم دێمەوە بۆ ماڵەوە، چیتر پێویستم بەم کارە نییە، هەروەها پێویستم بەو هوتێلە و خواردنە پڕوپووچەکانی نییە. ئەم کارانە چ سوودێکیان بۆ من هەیە؟"

کریس وتی: "لانس، هەر کارێکت دەوێ بیکە، بەڵام ئەوەندە بەپەلە مەبە." و بە ئارامی درێژەی بە قسەکانی دا: "قسە لەگەڵ میدیاکاندا مەکە، هیچ رامەگەیەنە و مەڵێ کە دەتەوێ چیتر بەردەوام نەبیت."

پاش قسەکردن لەگەڵ کریس، پەیوەندیم بە "ستاپیلتۆن"ەوە کرد و وتم: "من پیشانی ئەوانم دا کە دەتوانم و چیتر بەردەوام نابم."

بیل قسەی لەگەڵ کریس کردبوو، هەموو شتێکی دەزانی، ئارامی خۆی پاراست و وتی: "باااش؟" ئەویش وەك کریس شۆك بوو بوو.

پێشنیاری ئەوەی کرد لە ڕاگەیاندنی خانەنشین بووندا پەلە نەکەم و وتی: "مۆڵەت بدە با هەفتەیەك بیر بکەینەوە، ئێستا ئەم کارە شێتانەیە." وتم: "نا، تۆ نازانی، من دەمەوێ هەر ئێستا ئەم کارە بکەم." بیل وتی: "لانس، دەزانم دەتەوێ خانەنشین ببی، ئەمە باشە، بەڵام پێویستە سەبارەت بە چەند بابەتێك پێکە قسە بکەین. تەنیا چەند ڕۆژێك دان بەخۆدا بگرە". پاشان تەلەفۆنم بۆ ئۆچ کرد، گفتوگۆیەکی ئاساییمان هەبوو، وتم: "وازم لە پاریس نایس هێنا، شتێکی هێندە گرنگ نەبوو، چیتر بەشداری لە پێشبڕکێدا ناکەم." وتی: "زوو بڕیار مەدە."

ئێمە گەڕاینەوە بۆ ئاستین. کاتێك دەچوومە نێو ماڵەوە، بەردەوام تەلەفۆنەکە لێیدەدا و بەلایانەوە سەیر بوو کە لەپڕ بۆ کوێ ون بووم. دواجار بارودۆخەکە ئارام بۆوە و پاش ڕۆژێك پشوو دان، لەگەڵ کیك سەردانی "بیل"مان کرد.

بەوم وت: "من نەهاتووم سەبارەت بە بەردەوام بوون یان بەردەوام نەبوون لە کارەکەم قسە بکەم، ئەم بابەتە هیچ مشتمڕ هەڵناگرێت، من بڕیارمداوە و بەلامەوە گرنگ نییە کە تۆ چۆن لەم کارەی من دەڕوانی."

بیل سەیرێکی کیکی کرد و ئەویش لە وەڵامدا، تەنیا سەیری کرد و شانی بۆ هەڵتەکاند. هەردووکیان دەیانزانی کە لە بارودۆخێکدام کە ناتوانن قسەم لەگەڵ بکەن. کیك شتێکی ئەوتۆی نەمابوو، بەڕاستی ماندوو بوو، بەڵام هەر لەو نیگا کورتەدا کە ئەوان سەیری یەکتریان کرد، قسەکانیان بە یەکتر وتبوو. کیك بە ڕوانینەکەی لە بیلی گەیاندبوو کە:

"دان بەخۆتدا بگرە، ئێستا زۆر پەرێشانە." پاش بیست چرکە بێدەنگی، بیل وتی: "باشە، ئێمە پێویستە شێوەیەکی فەرمی بەم بابەتە بدەین. ڕێبدە لە ڕێگایەکی ڕاست و دروستەوە ئەم کارە ئەنجام بدەین."

وتم: "تەنیا ڕاگەیەندراوێك بڵاو بکەینەوە، چۆنە؟"

بیل وتی: "بیرکردنەوەیەکی باش نییە."

وتم: "بۆچی؟"

ئەو وتی: "هاوڕێم، نازانم تۆ پێشبڕکێکانی ڕۆتادۆڵ و پاریس بە چی دەزانی، لە ئەمریکا تەنانەت هیچ کەس ناوی ئەوی نەبیستووە، لێرە هەر کەس نازانێ کە تۆ دووبارە گەڕاویتەوە سەر کارەکەت. کەواتە دەتوانی کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی ڕێك بخەیت و بە هەمووان بڵێی کە خانەنشین بوویت. دەزانم کە وا بیر دەکەیتەوە کە ئەم گەڕانەوە سەرسوڕهێنەرە ئەنجام بدەی و لەگەڵیشت هاوڕام. مەبەستم ئەوەیە کە ئەو کارەی کە تۆ کردوتە بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە. شکستدانی شێرپەنجە، خۆی گەڕانەوەیەکە، بەڵام جیا لە خۆت، هیچ کەسێکی دیکە ئەمە نازانێت."

وتم: "باشە، کەواتە ئێمە ناتوانین ئەك کارە بکەین."

ستاپیلتۆن ژیرانە (بۆ پەشیمان بوونەوەی من) هەزار و یەك کاری دۆزییەوە کە پێویستە من پێش خانەنشین بوونی ڕەسمی ئەنجامی بدەم. ئەو وتی: "دەزانم خەریکە خانەنشین دەبی، بەڵام چۆن دەتەوێ ئەم کارە بکەی؟" پرسیاری لێکردم ئایا دەمەوێ کۆنفڕاسێکی زیندووی هەواڵنێری

ڕێك بخەم. پاشان وتی: "پێتوانییە دەبێ بۆ خواحافیزییەکەت، پێشبڕکێیەك ساز بکەی؟" ڕاستی دەکرد، من نەمدەتوانی بە بێ دەرکەوتن لە پێش چاوی گشتیدا، گۆڕەپانی وەرزشی جێبهێڵم.

بیل وتی: "بۆچی وەك دوایین پێشبڕکێ، لە پێشبڕکێی پاڵەوانی نیشتمانیدا بەشداری ناکەی کە مانگی جون بەڕێوە دەچێت؟ دەتوانی لەو پێشبڕکێیەدا براوە بی، خۆشت دەزانی کە دەتوانی، ئەمەش خۆی گەڕانەوەیەکە و خەڵکیش پێی دەزانن."

وتم: "نازانم، پێموانییە حەز بکەم جارێکی دیکە پێ بخەمەوە سەر پاسکیل."

بیل بە ئارام گرتن و زیرەکی، منی لەوە پەشیمان کردەوە کە خانەنشین بوونەکەم ڕاگەیەنم و بۆ کاتێکی دیکەی هەڵگرت. یەکەم پێشبڕکێ کە بەڕێوە بوو، پێشبڕکێی ڕۆز (Ride eor the Roses) بوو کە ئەویش مانگی مەی بەڕێوە دەچوو.

دواجار بیل بەسەر مندا سەرکەوت. پێمووت بۆ ڕاگەیاندنی خانەنشین بوونەکەم چەند ڕۆژێکی دیکەش دەوەستم.

یانەی پۆستالیش چاوەڕێی منیان کرد. تۆرن و ڤیسل پێشنیاریان کردبوو کە چاوەڕێی من بکەن. بەرەبەرە چەند ڕۆژەکە بوو بە یەك هەفتە و یەك هەفتە بوو بە مانگێك و بەرەبەرە بابەتەکە کۆنتر دەبوو.

خەریکی پیاسە و کات بەسەربردن بووم. هەموو ڕۆژێك یاری گۆڵفم

دەکرد، دەچووم بۆ سکی (خزینی) سەر ئاو، ئارەقم دەخواردەوە، لەسەر قەنەفە پاڵدەکەوتم و سەیری کەناڵە جۆراوجۆرەکانی تەلەفزیۆنم دەکرد.

چووم بۆ ریستۆرانتی چایز (Chuy's Resturant) و لەم ماوەیەدا بەتەواوی رێجیمی خۆراکییەکەم لەبیر کرد. ئەوە بوو بووە خوو کە کاتی گەڕانەوە لە ئەورووپا بچم بۆ چایز و خواردنێکی باش داوا بکەم، تەنانەت ئەگەر لە تەیارەکەش دوا بکەوتمایە. نەمدەویست چیتر بە رێجیمی خۆراکی خۆم لە خواردنی خۆراکە باشەکان بێبەش بکەم. شانسی ژیانی دووبارەم بەدەستهێنابووەوە و دەمویست چێژی لێوەرگرم.

بەڵام ئەمەم زۆر بەدڵ نەبوو، چونکە رازی و خۆشحاڵ نەبووم، ناچار بووم. هەوڵم دەدا ئەو ورەیە بەدەست بهێنمەوە کە ئەو کاتەی لەگەڵ کیك گەشتمان کرد بۆ ئەورووپا هەمبوو، بەڵام ئەمجارە بارودۆخ جیاواز بوو، نەمدەزانی بۆچی بەمشێوەیەیە. راستییەکەی ئەوە بوو کە من شەرمەزار بوو بووم، دوودڵ بوو و لەو شتە نیگەران بووم کە لە پاریس نایس کردبووم.

کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دابوو، هۆکارەکەشی تێپەڕاندنی ئەو نەخۆشییە بوو، ئێستاش دیسان هەمان گرفت و کێشەکانی پێشوو: "ئێستا دەبێ چی بکەم؟" من کار و ژیانێکی باشم هەبوو، پاشان تووشی نەخۆشی بووم کە ژیانی هەڵگێڕامەوە و کاتێکیش کە هەوڵم دا دووبارە بگەڕێمەوە بۆ ژیان، تەواو گۆڕا بووم و ئەو کەسەی پێشوو نەبووم. هیچ شتێك وەك پێشو نەبوو، بۆیە کۆنترۆڵی بارودۆخەکەم لەدەستم دەرچوو

بوو.

له پاسکیل بێزار بووم، بەڵام بیرم دەکردەوە: "ئەگەر لەم کاره بەردەوام نەبم، ئەی دەمەوێ چ کارێك بکەم؟ ئایا دەمەوێ ببمە خزمەتگوزاری فەرمانگەیەك؟" چیتر هەستم بە پاڵەوانبوون نەدەکرد، نەمدەزانی دەبێ چ کارێك بکەم. بۆیە ئێستا دەمەویست لە راستی رابکەم و هەر ئەم کارەشم کرد. لە ژێر هەموو بەرپرسیارێتییەکان دەرچووم.

ئێستا دەمزانی کە رزگاربوون لە شێرپەنجە، لە قۆناغی پشوودانی سادەی دوای نەخۆشییەکە واوەترە. بەڵکو دەبێ هەم لەش و هەم رۆح قۆناغی پشوو تێپەڕێنن.

جیا لە کیك، کەس لەم بابەتە تێنەدەگەیشت. ئەو ئارامیی خۆی پاراستبوو، لە کاتێکدا کە مافی خۆی بوو لەبەر ئاوارە کردنی، زۆر لە من توورە بێت. کاتێك من هەموو رۆژێك بۆ یاری گۆڵف دەچوومە دەرەوە، ئەو سەرگەردان بوو. سەگەکەی لەدەست دابوو، هەروەها کارەکەشی. کتێبی دەخوێندەوە و بیری لەوە دەکردەوە کە دەمانەوێ چۆن درێژە بە ژیانی خۆمان بدەین. دایکم دڵنەوایی ئەوی دەکرد، بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ دەکرد و دەیووت: "چ کارێك دەکەن؟" بەڵام دوای چەند هەفتە کات بەسەربردن، کیك بڕیاریدا دۆخەکە رێك بخات. دواجار دەبوو کەسێك ئەم کاره بکات. بەیانییەك پێکەوە لە حەوشە قاوەمان دەخواردەوە، من کوپەکەم دانا و بە کیکم وت: "باشە، دوایی دەتبینمەوە، کاتی کەیف کردنە."

کیك وتی: "من ئەمڕۆ دەبێ چی بکەم؟"

وتم: "مەبەستت چییە؟"

وتی: "لە منت نەپرسی ئەمڕۆ دەمەوێ چی بکەم، یان ئەوەی کە ئایا منیش حەز دەکەم یاری گۆڵف بکەم، تەنیا وتت خۆت دەتەوێ چی بکەیت؟"

وتم: "ئای، ببوورە."

وتی: "تۆ پێم بڵێ، ئەمڕۆ دەبێ چی بکەم؟"

بێدەنگ بووم، چونکە نەمدەزانی دەبێ چی بڵێم.

کیك وتی: "تۆ دەبێ بڕیار بدەیت. ئایا بەڕاستی دەتەوێ خانەنشین ببی و ئارەق بخۆیتەوە و خواردنی مەکزیکی بخۆی؟ ئەگەر تۆ ئەمەت دەوێ، باشە هیچ کێشە نییە، من پێمخۆشە و هاوسەری تۆم، بەڵام تەنیا دەمەوێ بزانم بڕیارت چییە. چونکە ئەگەر بڕیار بێ تۆ خانەنشین بیت، دەبێ لە بیری دۆزینەوەی کاردابم تا تۆ بتوانی یاری گۆڵف بکەیت. تەنیا بڵێ بڕیاری تۆ چییە؟"

ئەو درێژەی بە قسەکانی دا: "بەڵام ئەگەر ناتەوێ خانەنشین ببی، دەبێ واز لە ئارەق خواردنەوە و ئەمجۆرە نانخواردنە بێنیت. تۆ دەبێ لەوە تێبگەی، تۆ بڕیارت داوە بڕیار نەدەی، ئەمەش لە "لانس"ێك کە من ناسیومە ناوەشێتەوە. ئێستا من دڵنیا نیم کە تۆ کێی، بەڵام پێویستە تۆ ئەمە بزانی کە لە هەموو حاڵەتێکدا خۆشم دەوێیت."

کاتێك ئەم قسانەی کرد، توورە نەبوو. کیك ڕاستی دەکرد، بەڕاستی نەمدەزانی چیم دەوێ. لەپڕ وێنەیەکی خۆمم وەك کەسێکی خانەنشین بە پێش چاومدا تێپەڕی و من ئەم وێنەیەم بەلاوە جوان و پەسەند نەبوو. ئەو نەیدەویست ژیانێکی بێ جوڵەی هەبێ و مالی خۆشی بوو.

بە هێمنی وتی: "پێم بڵێ ئایا بڕیارە لە ئاستێن بمێنینەوە؟ ئەگەر وایە، پێویستە کارێك پەیدا بکەم، چونکە نامەوێ کاتێك کە تۆ یاری گۆڵف دەکەی، لە ماڵەوە بم، زۆر ماندووم."

بەگشتی کەس نەیدەتوانی بەمشێوەیە قسە لەگەڵ مندا بکات، بەڵام کیك ئەم قسانەی بەبێ توورە بوون و زۆر بەجوانی دەربڕی. کیك دەیزانی ئەگەر کەسێك بیەوێ من کۆنترۆڵ بکات، دەتوانم چەند سەرسەری بم. ئەمە لە خووە کۆنەکانی من بوو. حەزم نەدەکرد کۆنترۆڵ بکرێم و ئەگەر هەستم بەم شتە بکردبایە، بۆ دەرباز بوون لەو دۆخە، چ لە ڕووی فیزیکی و چ بەشێوەی لۆژیکی یان هەستەکی دەجەنگام. بەڵام کاتێك کیك ئەم قسانەی دەکرد، هەستێکی لەو شێوەیەم نەبوو. ئەوەی دەمبیست، هەمووی ڕاست و وتنی ئارام و توانج ئامێز و قوڵ بوو. لەسەر مێزەکە هەستام.

وتم: "زۆر باشە، مۆڵەتم بدەرێ بیری لێبکەمەوە."

بەهەر حاڵ چووم بۆ یاری گۆڵف، چونکە دەمزانی ئەم کارە کیك نیگەران ناکات. یاری گۆڵف لە ڕوانگەی ئەودا بابەت نەبوو، بابەتی سەرەکی ئەوە بوو کە من دەبوو دووبارە خۆم بدۆزمەوە.

کیك، ستاپیلتۆن، کارمایکل و ئۆچ پێکەوە، بوونە هاوپەیمان تا من بگەڕێننەوە سەر پاسکیل. من هەر دەمووت دەمەوێ خانەنشین ببم، بەلام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، بۆچوونم دەگۆڕا. بیل منی بەقەناعەت گەیاند کە لە یەکەم پێشبڕکێدا کە ساز دەکرێ، وەك دوایین پێشبڕکێ بەشداری بکەم. ئەم پێشبڕکێیە، پێشبڕکێی بەر لە پاڵەوانێتی ئەمریکا بوو کە لە مانگی ئایار(مەی) لە فیلادلفیا بەڕێوەدەچوو.

کریس کارمایکل هات بۆ ئاستین، سەیرێکی گەراج و پاسکیلەکەی منی کرد کە هێشتا لەنێو جانتاکەیدا بوو، بە بینینی ئەم دیمەنە سەرێکی بۆ لەقاند. "کریس"یش وەك کیك، پێیوابوو دەبێ من بڕیاری جددی لە بارەی گەڕانەوە یان نەگەڕانەوە بدەم. ئەو هەروەها دەیووت: "تۆ سەر لەنوێ دەتوانی بژی و دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ ژیان." بەلام لە هەمان کاتدا دەیزانی من هێشتا ئەو ئامادەییەم تێدا نییە کە بەتەواوی بگەڕێمەوە، بۆیە بەرواڵەت بیانوی هێنایەوە بگەڕێتەوە بۆ ئاستین تا بەرنامەی ڕاهێنان بۆ پێشبڕکێی پاڵەوانێتی ئەمریکا، دابنێت. جیا لەوە، پێشبڕکێی "ڕۆز"یشمان لەپێش بوو کە لانی کەم دەبوو لەشم بۆ ئەو پێشبڕکێیە ئامادە بکەم. ئەو بە ئاماژە بە لەشم وتی: "ناتوانی بەم شێوەیە بچیتە دەر، خۆ تۆ ناتەوێ ڕابووردووت بخەیتە مەترسییەوە."

کریس لەو باوەڕەدا بوو کە هەر بڕیارێك سەبارەت بە خانەنشینی بیدەم، لە دەرەوەی ئاستین پێویستیم بە ڕاهێنانێکی هەشت بۆ دە ڕۆژە هەیە تا دووبارە لەشم بگەڕێتەوە بارودۆخی پێشوو. ئەو وتی: "باشترە

بچینه دەرەوەی شار، لێرە زۆر شت هەیە کە تەرکیزت دەشێوێنێ، بۆ نموونە گۆڵف."

دوای ئەوە بیرمان لە شوێنی راهێنان کردەوە. ئاریزۆنا زۆر گەرم بوو، کولۆرادۆش شوێنێکی زۆر بەرز بوو. وتم: "بۆنت بیر دێتەوە؟ ئەو شارە بچووکە گردۆلکەییەی کارۆلینای باشوور؟"

بۆن، لە زنجیرە کێوەکانی ئاپالاچین و لە رێڕەوی تۆردرپۆنتی کۆن هەڵکەوتبوو، من بیرەوەری زۆر خۆشم لەوێ هەبوو. دوو جار لە پێشبڕکێی تۆردۆپۆنت، براوە بووم و زۆر پاش نیوەڕۆش لە بەرزترین شوێنی ئەوێ واتە لە شاخی بیچ (کە گرنگترین قۆناخی هەورازی پێشبڕکێکە بوو) مابوومەوە. هەرچەند کارێکی قورس بوو، بەڵام بۆن شارێکی زۆر جوان بوو، پڕ بوو لە خوێندکار و مامۆستایانێك کە لە زانکۆی هەرێمی ئاپالاچینەوە هاتبوون. هەروەها، لە زانکۆی ئەم شارەدا، پێداویستی گەلێکی بۆ راهێنان لێبوو، ژمارەیەکی زۆر کابینەش لە دارستاندا بوون.

لەرێی ئەنتەرنێتەوە یەکێك لەو کابینانەم بەکرێ گرت، پاشان بڕیارمدا هاوڕێیەکی کۆنم بە ناوی باب رۆل (Bob Roll) دەعوەت بکەم تا لە راهێنانەکاندا لەگەڵم بێت. باب تەمەنی ۳۸ساڵ بوو، ورەیەکی زۆر باشی هەبوو. بوارەکەی گۆڕیبوو بۆ پاسکیلی شاخ، ئەو دەیتوانی لەم دە رۆژەدا بۆ من هاوڕێیەکی زۆر باش بێت.

ئێمە بە فڕۆکە چووین بۆ شاری شارلوت (Chariotte) لە کارۆلینای

باکوور و پاشان نزیکه‌ی سێ کاتژمێر به ئوتۆمبێل له شاخ و کێوه‌دا شۆفێریمان کرد. سه‌ره‌تا چووینه هه‌رێمی ئاپالاچین (Appalachian). کریس پێشتر له‌گه‌ڵ ناوه‌ندی ڕاهێنانه‌کانی پاڵه‌وانێتیدا هه‌ماهه‌نگی کردبوو که تێستێکم بکه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی ده‌رکه‌وێ که له ڕووی جه‌سته‌ییه‌وه، له چ ئاستێکدام. کریس سه‌یرێکی لانی زۆری VO۲ و ترشی لاکتیکی منی کرد و ئه‌وه‌ی که پێشتر ده‌یزانی، پشت ڕاست بۆوه: من قه‌ڵه‌و بوو بووم و له‌شم له‌بار نه‌بوو. پێشتر هه‌میشه له‌م ڕووه‌وه باشترین بووم، ڕاده‌ی VO۲ به‌گشتی هه‌شتا و پێنج بوو، به‌ڵام ئێستا شه‌ست و چوار بوو.

کریس به ڕاهێنه‌ره‌کانی هه‌رێمی ئاپالاچینی وت: "ئێستا ده‌بینن دوای ته‌نیا یه‌ك هه‌فته که گه‌ڕاینه‌وه، ڕاده‌ی VO۲ی ئه‌و بۆ حه‌فتا و چوار به‌رز ده‌بێته‌وه." کریس ده‌یزانی که دوای ماوه‌یه‌کی کورت، ئه‌م شته ڕوو ده‌دات و له‌و باوه‌ڕه‌شدا بوو که من له ماوه‌ی چه‌ند ڕۆژدا ده‌توانم ئاماده‌یی جارانم به‌ده‌ست بهێنمه‌وه. به‌ڵام بۆ ئه‌وه‌ی هانم بدات، گره‌وی کرد که ناتوانم له ماوه‌ی یه‌ك هه‌فته‌دا، توانای جارانم له پایده‌ر لێداندا به‌ده‌ست بهێنمه‌وه. ئه‌و وتی: "له‌سه‌ر ۱۰۰ دۆلار ده‌یکه‌مه گره‌و که تۆ ناتوانی له‌و ماوه‌یه‌دا ۵۰۰ پایده‌ر تێپه‌ڕێنیت" من گره‌وم له‌گه‌ڵ کرد.

له‌وه به‌دوا، کارمان ته‌نیا خواردن و خه‌وتن و پایده‌ر لێدان بوو. وه‌رزی به‌هار تازه کوێستانی به‌سه‌ر کردبۆوه، وادیار بوو ته‌م و نمه‌ی باران، ئه‌و کارستانه‌ی تووشی بێده‌نگی کردووه. هه‌موو ڕۆژێك له‌ژێر باراندا پایده‌رم

لێدەدا، هەوای سارد سییەکانمی دەکزاندەوە و لەگەڵ هەر هەناسەیەکدا، تەوژمێك هەوای ساردم دەکردە نێو سییەکانمەوە، بەڵام هیچ گرنگیم بەم بابەتە نەدەدا و ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە هەست بکەم هەوای پاك هەڵدەمژم.

ئێمە بەو جادانەدا پاسکیلمان لێدەخوڕی کە تەنیا هەندێکیان قیر کرابوون و لەسەر نەخشە بوون، جادە گەلێکی بە وردەبەرد و گەڵای تیژی کاژەکان داپۆشرابوون.

کریس بۆ نانی ئێوارە برێك پاستا و پەتاتەی دروست کردبوو، لە برسان نەماندەزانی دەبێ چۆن بیخۆین. لەکاتی خواردنی نانی ئێوارەدا، دەمودویەکەمان هەبوو کە لێرەدا بۆ باس کردن نابێت. گاڵتەمان دەکرد و نوکتەمان دەگێڕایەوە و من هەر هیچ دڵگران و خەمۆك نەبووم. بەسەرهات گەلێکی رابووردوومان —لە سەرەتای دۆستایەتیمان و ئەو کاتەی کە من هێشتا نەبوو بوومە پاسکیلسوارێکی پیشەیی— دەگێڕایەوە.

هەموو شەوێك پەیوەندیم بە ماڵەوە دەکرد و کریستین، بەرەبەرە دەیتوانی بڵێ، گەڕامەوە دۆخی جاران. باسی کەشی سارد و باراناوی و ئەو مەودا دوور و درێژەم بۆ دەکرد کە هەموو رۆژێك پاسکیلسواریمان دەکرد، هەروەها پێم دەووت کە: "بەڕاستی هەستێکی باشم هەیە."

چێژم لە هەموو ئەو کاتانە وەردەگرت کە بە راهێنان و پاسکیلسواری دەمبردەسەر و ئەو کاتانەشی کە عەسران لە نێو کابینەکەدا دەمامەوە، تەنانەت چێژم لەو کەشە سارد و باراناویەش وەردەگرت. وەك ئەوە وابوو

کە گەڕابێتمەوە بۆ پاریس نایس و هەمان ڕێگام دەست پێکردبێتەوە کە بە بڕوای هەمووان، شکستی بە من هێنا. ئەوەی لە پاریس منی شکست دا، کەشی سارد و شێدار بوو، بەڵام ئێستا وەك پێشوو، چێژم لە پاسکیلسواری لە وەها کەشێکدا وەردەگرت.

لە کۆتایی خولی ڕاهێنانەکەدا، بڕیارماندا لە کێوەکانی بیچ ( Beech Mountain) پاسکیلسواری بکەین. کریس کاتێك کە ئەم پێشنیارەی کرد، باش دەیزانی چی دەکات، لەبەر ئەوەی سەردەمانێك من سوڵتانی کێوەکان بووم. کێوی بیچ، ڕێگایەکی سەختی پێنج سەد فوتی و لوتکەیەکی بەفرین بوو کە لە پێشبڕکێکانی تۆردۆپۆنتدا لە قۆناغە گرنگەکانی سەرکەوتنی من بوو. باش لەبیرم بوو کە ئەو کات چۆن هەوڵم دەدا بە کێوەکەدا سەرکەوم و ئاپۆرای خەڵکیش لەم بەراوبەری ڕێگاکە وەستابوون، ناوی منیان لە جادەکە نوسیبوو: "خێزاتر ئارمێسترانگ"

ڕۆژێکی سارد و باراناوی دیکەمان دەست پێکردبوو، بەرنامەی ئێمە ئەوە بوو کە پێش ئەوەی سەرکەوین بۆ لوتکەی بیچ، سووڕێکی سەد میلی پاسکیلسواری بکەین. کریس بە ئوتۆمبێل دەهات بە شوێنمدا تا بتوانین دوای گەیشتنە لوتکە، پاسکیلەکە لەسەر گاشەبەردەکان هەڵگرین و بۆ نانی ئێوارە، بگەڕێینەوە بۆ کابینەکە.

نزیکەی چوار بۆ پێنج کاتژمێر لەژێر باراندا پاسکیلسواریمان کرد. کاتێك کە گەیشتینەوە داوێنی کێوەکە، نزیکە شەش کاتژمێر بوو لەسەر پاسکیل دانیشتبووم و تەواو خوسابووم. بەڵام دیسان لەسەر کورسییەکە

دانیشتمەوە، دەستم پێکرد و باب ڕۆڵم جێهێشت.

کاتێك دەستم بە هەڵگەڕان کرد، لەپڕ دیمەنێکی خەیاڵبزوێنم بینی: هێشتاش ناوی من بەسەر جادەکەوە مابوو.

تایەی پاسکیلەکە بەسەر پیتە زەرد و سپیەکانی ناوەکەمدا دەسووڕا، لەکاتی پایدەر لێداندا پیتەکانم دەبینی، ئەوان بە دەنگێکی کز دەیانووت: بڕۆ لانس. درێژەم بە ڕێگاکەم دا، تا دەهات هەورازەکە کورتر دەبوو. بە هەموو هێزمەوە پایدەرم لێدەدا، بەسەختی هەوڵم دەدا، ئارەقەم کردبۆوە و لە پێستی لەشمەوە هەستم بە گەرمایەکی زۆر دەکرد. لەشم بەشێوەی غەریزی لەهەمبەر سەرەو ژووریدا کاردانەوەی پیشان دەدا. لەسەر کورسییەکە بەرز بوومەوە و درێژەم بە ڕێگاکەم دا. لەپڕ کریس بە ئوتۆمبێلەکەی خۆی گەیاندە من، جامی ئوتۆمبیلەکەی هێنایە خوار و دەستی بە هاندانی من کرد، هاواری دەکرد: "بڕۆ. بڕۆ. بڕۆ.." ئاوڕم دایەوە و سەیرم کرد، دیسان هاواری کرد: "بڕۆ لانس، بڕۆ." بە هیلاکییەکی زۆرەوە زۆریم لە پایدەرەکان دەکرد، هەناسەکانم کورتتر بوو بوونەوە و خێراتر دەڕۆشتم.

ئەو هەڵگەڕانە شتێکی لە مندا جوڵاندبوو. هەروا کە سەردەکەوتم، بیرم لە ژیان دەکردەوە. بیرم لە یەك بە یەکی لایەنەکانی ژیان، منداڵی، پێشبڕکێ بەرزاییەکان، نەخۆشی و کاریگەری ئەو بەسەر ژیانمەوە دەکردەوە. پێموابێ هەر ئەم هەڵگەڕانەش بوو منی بۆ بیرکردنەوە و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بابەت گەلێك هان دەدا کە چەندین هەفتە بوو

لەدەستیان رام دەکرد. ئێستا کاتی ئەوە بوو کە لەشوێن خۆدا چەقین لەبیر بکەم. بە خۆم وت: برۆ. ئەگەر هێشتاش دەتوانی هەر برۆ، تۆ نەخۆش نیت.

هەروا کە لە سەرکەوتن بەردەوام بووم، هەموو ژیانم، باشییەکان و ئامانجی ئەو، بە بەرچاومدا تێپەڕ دەبوو. ئامانج لە ژیانی من، سەرکەوتنێکی قورس و درێژمەودا بوو.

لە لوتکە نزیک دەبوومەوە، کریس لە پشت سەرمەوە دەهات. ئەو لە چۆنێتی دانیشتنم لەسەر کورسییەکە، هەستی دەکرد گۆڕاوم و بارێك لەسەر شانم هەلگیراوە. تیژپەڕ گەیشتمە لوتکە و لەوێ وەستام. کریس ئوتۆمبێلەکەی وەستاند و دابەزی. هیچ قسەمان لە بارەی ئەو شتەوە نەکرد کە روویدابوو. تەنیا سەیرێکی منی کرد و وتی: "من پاسکیلەکەت دەخەمە سەر ئوتۆمبێلەکە."

وتم: "نا، بارانییەکەی خۆم بدەرێ، دەمەوێ چۆن هاتووم ئاواش بگەڕێمەوە." دووبارە بوومەوە پاسکیلسوارەکەی پێشوو. کریس پێکەنی و سوار ئوتۆمبێلەکەی بووەوە.

بۆ رێزگرتن لەو کێوە جوانانە باقی رێگاکە بە هێوری و زۆر بە وردەوە رێم کرد. بەسەختی و لە بێدەنگییەکی تەژی لە ئەوین بۆ پاسکیل پایدەرم لێدەدا، بەجۆرێك کەوا دەهاتە پێش چاوم کە خاکی بۆن پیرۆزە، سەرزەمینێك کە من وەك زیارەتکارێك، پێم تێنابوو. ئەگەر جارێکی دیکە کێشەیەکی جددیم بۆ هاتبایە پێش، دەمزانی بە هاتن بۆ ئەم سەرزەمینە،

وەڵامەکەم وەردەگرمەوە. لەو سەرکەوتنەدا دیسان گەڕامەوە بۆ ژیان.

یەك یان دوو ڕۆژ دوای ئەوە، چووین بۆ ناوەندی ڕاهێنانی زانکۆ. بەشێوەیەك پایدەرم لێدەدا کە نزیك بوو خێرایی پێوەکە لەکار بکەوێ و کریس نەیدەتوانی ژمارە دیجیتاڵییەکە بخوێنێتەوە. ئەو لە کاتێکدا کە پێدەکەنی وتی، گرەوەکەم دۆڕاند.

شەو، لەسەر نانی ئێوارە بە کریسم وت: "بیر لەوە دەکەمەوە ئایا دەتوانم فریای پێشبڕکێکانی ئاتلانتا بکەوم."

کریس وتی: "ئەم کارە دەکەین."

عەسری ئەو ڕۆژە، خۆمان بۆ گەڕانەوە ئامادە کرد. کریس بە چەند پەیوەندی تەلەفۆنی، پێویستییەکانی گەڕانەوەی منی دەستەبەر کرد. پاشان پەیوەندی بە "بیل ستاپێلتۆن"ەوە کرد و وتی: "ئامادەبە لانس خەریکە دەگەڕێتەوە، ئەو "لانس"ەی کە پێشتر دەتناسی."

من تەنیا بۆ ئەوە نەچووبوومە سەر پاسکیل کە براوە بم، بەڵکو هەوراز و نشێوی زۆرم بڕی، ئەنجامی باش و خراپ، بەڵام ئەمجارە نەمهێشت سەختی و دژوارییەکان شکستم بدەن.

پاش گەڕانەوە لە بۆن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چێژی زیاترم لە پاسکیلسواری وەردەگرت، هەموو ڕۆژێك، تەنانەت کاتێك کە لە ڕووی جەستەییەوە، تەواو ڕێك نەبووم، ئەم کارەم بەلاوە قورس دەبوو. چیتر هەرگیزاو هەرگیز بیرم لە وازهێنان لە پاسکیلسواری نەکردەوە.

تەنانەت پاسکیلەکەم لەگەڵ خۆم برد بۆ زەماوەند. مانگی ئەپریلی ساڵی نەوەد و هەشت گەشتەم کرد بۆ بۆن و مانگی مەی(ئایار)ی هەمان ساڵ، من و کیك لە سانتاباربارا زەماوەندمان کرد. نزیکەی سەد کەسێکمان بۆ زەماوەندەکە بانگهێشت کردبوو، لەبەر ئەوەی کە کیك کاتۆلیك بوو، ڕێوڕەسمی گرێبەستی مارەبڕینەکەمان لە کڵێسایەکی کاتۆلیکی بەڕێوە برد. دوای ئەوە میوانییەکمان ڕێکخست. ئەو شەوە بۆ هەمووان هێندە خۆش بوو، حەزمان نەدەکرد کۆتایی بێت.

دوای میوانییەکە، چەند ڕۆژێك لە هەرێمێکی کەنار دەریا ماینەوە، بەڵام مانگی هەنگوینێکی ئایدیال نەبوو، چونکە من دوای گەشتەکەی بۆن، سووربووم لەسەر ڕاهێنانەکان و هەموو ڕۆژێك پاسکیلسواریم دەکرد. دواجا بۆ بەشداری لە پێشبڕکێی ڕۆز گەڕامەوە بۆ ئاستین. ئەو پێشبڕکێیە بوو بە ڕووداوێکی گەورە. بەشێك لە شەقامەکانی بەشی خوارەوەی شاریان لەبەر پێشبڕکێکە داخستبوو، ئەم سەر بۆ ئەو سەری ڕێگاکەیان کردبوو بە چراخان. من لەو پێشبڕکێیەدا براوە بووم. کاتێك لەسەر سەکۆ وەستام، کیك هاواری دەکرد و لە خۆشیان، جێی بەخۆی نەدەگرت، ڕێك وەك ئەو کاتەی کە لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس سەرکەوتنم بەدەست هێنا. بۆ ساتێك وام هاتە پێش چاو کە کیك بەشێوەیەك خۆشاڵی خۆی دەردەبڕێ کە وەك بڵێی پێشتر لە هیچ پێشبڕکێیەکدا سەرنەکەوتووم. شانم بەرز کردەوە و وتم: "شتێکی گرنگ نەبوو" بەڵام لە دڵەوە خۆشحاڵ بووم.

دیسان چەشتنی تامی رکابەری بەلامەوە چێژبەخش بوو. مانگی جوون، پێشبرکێیەکی دیکە بەرێوەچوو. کاتێك کە بە فەرمی گەڕامەوە بۆ پێشبڕکێکان و لە چوارەم پێشبڕکێی خۆمدا بەشداریم کرد، جۆرج هینکاپی هاوڕێ و هاوتیمم لە پێشبڕکێ بەراییەکانی پاڵەوانێتی ئەمریکادا سەرکەوت.

بەیانییەك بە کیکم وت: "زۆر باشە، رەنگە کاتی ئەوە هاتبێ کە جارێکی دیکە ئەورووپا تاقی بکەینەوە." ئەو تەنیا بە خۆشحاڵییەوە سەرێکی بۆ لەقاند و دەستیکرد بە کەلوپەل کۆکردنەوە. ئێستا دەمتوانی بەو بلێم: "دەگەڕێینەوە بۆ ئەورووپا" و کاتێك گەیشتینە ئەوێ، بلێم: "دەگەڕێینەوە بۆ ئاستین" و کاتێك گەڕاینەوە بۆ ئاستین، دەمتوانی بەو بلێم: "دەزانی چییە؟ من هەڵەم کرد، ئێمە خەریکە دەگەڕێینەوە بۆ ئەورووپا." و ئەو بێ هیچ سکاڵایەك، بۆ هەموو ئەم گەشتانە دەهات. هیچ شتێك بۆ ئەو قەیران نەبوو.

کێك پێشوازی لە خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخ و زمانی نوێ دەکرد. کاتێك بەوم وت: "وەرە با جارێکی دیکە ئەورووپا تاقی بکەینەوە"، بۆ ئەو قورس نەبوو. رەنگە زۆربەی ژنان لەسەرەتادا، کارێکی لەو شێوەیە نەکەن، بەڵام هاوسەرەکەی من زۆر بەئیرادە و خۆڕاگر بوو.

ئێمە بەشێوەی کاتی شوقەیەکی بچووکمان لە نایس بەکرێ گرت و ئەو دیسان لە خولێکی زماندا خۆی ناونووس کرد، منیش سەرقاڵی راهێنان و پێشبڕکێکانم بووم. لە خولی لۆکزەمبۆرگ (Luxemborg)دا بەشداریم

کرد و براوە بووم. دوای کۆتایی هاتنی قۆناغی یەکەمی پێشبڕکێکە، پەیوەندیم بە "کیك"ەوە کرد. ئەو دەیەویست بزانی بۆچی وەك پێویست تووشی هەیەجان نەبووم. چونکە ئێستا کاتێك بوو کە من بەوریاییەوە لەئاست کێشە دەروونییەکانی دوای چاکبوونەوەی نەخۆشییەکە هەڵسوکەوتم دەکرد و هەوڵم دەدا ئیحساسات و چاوەڕوانییەکانم کۆنترۆڵ بکەم. خولی لۆکزامبۆرگ، تەنیا پێشبڕکێیەکی چوار ڕۆژە بوو، لەو پێشبڕکێیانە نەبوو کە پاسکیلسوارە پیشەییەکان، کە تیایدا سەرکەوتن بیکەن بە شایی. بەڵام ئەم پێشبڕکێیە لە ڕووی رۆحی و دەروونییەوە بۆ من بێ وێنە بوو، چونکە دەریخست کە دووبارە دەتوانم سەرکەوتوو بم، چاکەیەکی دیکەشی هەبوو کە ئەویش ئەوەبوو کە دوایین شوێنەوارەکانی دوودڵی لە مندا نەهێشت.

دوای ئەوە بەشداری خولی هۆڵەندام کرد و پلەی چوارەمم بەدەست هێنا. لەبەر ئەوەی کە هێشتا ئامادەیی پێویستم بۆ رکابەری لە پێشبڕکێیەکی قورسی سێ هەفتەییدا نەبوو، بەشداریم لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس نەکرد کە مانگی جولای بەڕێوەچوو. بەڵام لە راڤەی تەلەفزیۆنی ئەم پێشبڕکێیانەدا بەشداریم کرد و لە قەراغ جادەوە سەیری ئەم پێشبڕکێیەم کرد کە بوو بە جێی مشتومڕترین پێشبرکێ لە مێژووی پێشبڕکێکانی پاسکیلسواریدا. پۆلیسی فەڕەنسا هێرشیان کردە سەر ئوتۆمبێلی تیمەکان، بڕێکی زۆر EPO و سترۆئید گەلی تێکەڵاویان دۆزییەوە، ئەندامانی تیمەکان و راهێنەرەکانی ئەو تیمانەیان خستە بەندیخانەوە. لە هەمووان بەگومان بوون و پاسکیلسوارەکان زۆر لە

بڕیارەکانی بەرپرسان تووڕە بوون. لە نێو ئەو بیست و یەك تیمەی کە بەشداری پێشبڕکێکانیان کردبوو، تەنیا چواردە تیم هاتنە پێشبڕکێکەوە. یەکێك لە تیمەکان دەرکرا، شەش تیمی دیکە بۆ نارەزایەتی دەربڕین بەم کارە، لە پێشبڕکێکان کشانەوە. بەکارهێنانەی وزەبەخش (دوپینگ) لە راستییە تاڵەکانی پاسکیلسواری یان هەر وەرزشێکی دیکەیە. بێگومان هەندێك لە تیمەکان و پاسکیلسوارەکان پێیان وایە ئەم بابەتە هاوشێوەی چەکە ناوەکییەکانە، واتە بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە کە ئەگەر ئەم دەرمانانە بەکار بهێنن، دەتوانن رکابەری لەگەڵ تیمەکانی دیکەدا بکەن. بەڵام من هەرگیز هەستێکی لەو شێوەیەم نەبووە و نییە. بێگومان دوای وەرگرتنی چارەسەری کیمیایی، ئەگەر ئەم دەرمانانە بچوبایە نێو خوێنمەوە، دەیتوانی زۆر وروژێنەر بێت. بەگشتی ناتوانم بەتەواوی بڵێم چ هەستێکم لەهەمبەر ئەو پێشبڕکێیەدا هەبوو. لە لایەکەوە لەگەڵ پاسکیلسوارە بەشداربووەکانی ئەم پێشبڕکێیە کە هەندێکیانم بەباشی دەناسی، هەستم بە هاوسۆزی دەکرد و لە لایەکی دیکەوە، لەو باوەڕەدا بووم بەو بڕیارانەی دراون، لەمە بەدوا پێشبڕکێکان دادپەروەرانەتر بەڕێوە دەچن.

بەدرێژایی هاوین، هەروا لە پێشکەوتنەکانم بەردەوام بووم و مانگی ئۆگەست، من و کێك بەڕادەیەك لەوە دڵنیابووین کە من دەبمە پاسکیلسوارێکی پیشەیی کە خانوێکمان لە نایس کڕی. "کیك"یش بەو زمانە فەرەنسییە کلك و گوێکراوەی فێری بوو بوو، مەعامەلەی لەگەڵ دەڵاڵەکان دەکرد تا ئەوەی کە دواجار کەلوپەلی پێویستمان کڕی و

چووینە خانووە نوێکەمان و من لەگەڵ تیمەکەم چووم بۆ خولی فەڕەنسا کە یەکێك لە قورسترین پێشبڕکێکانی پاسکیلسواری بوو. لە پێشبڕکێکانی پاسکیلسواریدا، سێ خولی گەورە هەیە: خولی ئیتالیا، ئیسپانیا و فەڕەنسا.

یەکی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٨، واتە دوو ساڵ دوای چاکبوونەوەم، بەشداری پێشبڕکێکانی ڤوێلتام کرد و پلەی چوارەمم بەدەست هێنا. ئەمە دەستکەوتێکی گەورە بوو. لە ماوەی بیست و سێ ڕۆژدا، ٢,٣٤٨ میل پاسکیلم لێخوڕی، دواجار لەبەر شەش چرکە خەڵاتەکەم لەدەست دا. ئابراهام ئۆلانۆ، براوەی پێشبڕکێکە، دوو خولەك و هەژدە چرکە خێراتر لە من پاسکیلسواری کردبوو. هەروەها، دەتوانم بڵێم لە قۆناغی شاخاوی پێشبڕکێکە و لە کەش و هەوایەکی زۆر خراپدا، براوە بووم. پێشبڕکێکە بەڕادەیەك قورس بوو کە، زۆربەی بەشداربووان پێش کۆتاییهاتنی کشابوونەوە، بەڵام من ورەم بەرنەداو و بەردەوام بووم.

بەدەستهێنانی پلەی چوارەم لە پێشبڕکێی "ڤوێلتا"دا، لە گەڕانەوەیەکی سادە بۆ ژیان زیاتر و بەنرختر بوو. پێش ئەوەی نەخۆش بکەوم، لە پێبشرکێ یەك ڕۆژییەکاندا براوە دەبووم، بەڵام هەرگیز نەمتوانیبوو لە پێشبڕکێ سێ هەفتەییەکاندا سەرکەوتنێك بەدەست بهێنم. بەدەستهێنانی پلەی چوارەم لە پێشبڕکێی ڤوێلتا، پیشاندەری ئەوە بوو کە نەك هەر سەر لەنوێ ژیانم بۆ گەڕاوەتەوە، بەڵکو لەچاو پێشوو باشتریش بووم. ئێستا دەمتوانی لە هەر پێشبڕکێیەکدا، لە هەر شوێنێکی

دنیادا بیٚ، سەرکەوتن بەدەست بهێنم. یەك لە دوای یەك پلەی باشترم بەدەست دەهێنا و دواجار بووم بە یەکێك لەو کەسانەی کە یانەکان بۆ واژۆ کردنی گرێبەست لەگەڵیدا، رکابەرییان دەکرد.

ئەو کاتەی من سەرقاڵی پێشبڕکێی ڤۆڵتا بووم، "کیك"یش سەرقاڵی کێشەکانی گواستنەوەی کەلوپەلەکانی ماڵەوە بوو. شوقەکەمان لە نهۆمی سێیەم بوو، کیك بەتەنیا کەلوپەلەکانی دەخستە نێو ئەسانسۆر و دەیهێنانە خوارەوە و دەیخستنە نێو ئوتۆمبێلەوە. لەوێوە دەچووە بەردەم خانووە نوێیەکە و کەلوپەلەکانی دادەگرت، کارتۆن و بەستەکانی لە چەند پلیکانەی کورِ دەبردە سەر و دەیخستنە نێو خانووە نوێکەمانەوە. پاشان دووبارە دەگەڕایەوە شوقەکە و ئەم کارەی دووبارە دەکردەوە. کیك بۆ ماوەی دوو رۆژی تەواو سەرقاڵی گواستنەوەی کەلوپەلەکان بوو. ئیتر چاوەکانی لەبەر هیلاکی زۆر، لێڵ و تاریك بوو بوون.

کاتێك گەیشتمەوە ماڵەوە، جلوبەرگەکانم رێك وپێك و سەلاجەکەش پڕ لە خواردن بوو. کیك بەستە کلیلێکی نوێی دا بە من. بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە خۆشحاڵ بووم. ئەو خانووەم بە لوتکەی سەرکەوتنەکانی ئەو ساڵە دەزانی. دواجار ئێمە لە ئەورووپا سەقامگیر بوو بووین و من دووبارە پیشەکەم بەدەستهێنابۆوە. ئێستا کیك دەیتوانی تاڕادەیەك بە زمانی فەڕەنسی قسە بکات و ئیتر ماڵ و ژیانێکمان بۆ خۆمان هەبوو، ئەمەش بۆ ئێمە هەموو شتێك بوو. ئەو وتی: "ئەی خوایە، ئاخری توانیمان ئەم

کارە بگەیننە ئەنجام."

بۆ ئەوەی ئەم سەرکەوتنە بکەین بە جەژن، چەند ڕۆژێکمان لە لیک کۆمۆ بەسەر برد، کە ئێستاش یەکێك لەو شوێنانەیە کە حەزم پێیەتی. لە هوتێلێکی زۆر باش ماینەوە، یەکێك لە باشترین ژوورەکانمان هەڵبژارد کە بەلەکۆنەیەکی جوان و بەرجەوەنێکی بێوێنەی هەبوو. لەو چەند ڕۆژەدا تەنیا پشوومان دەدا و چێژمان لە خواردنە باشەکانی هوتێلەکە وەردەگرت. دواجار بۆ پشووەکانی پاییز و زستان گەڕاینەوە بۆ خانووەکەی خۆمان لە ئاستین. هێشتا زۆر بە سەر گەڕانەوەکەماندا تێنەپەڕیبوو کە نامەیەکی ئەلەکترۆنیم لە سەرۆکی یانەی پۆستاڵ ئەمریکا، واتە لە یۆهان بروینیل (John Bruyneel)ەوە پێگەیشت. ئەو پیرۆزبایی سەرکەوتنەکەی پێشبڕکێی فۆڵتای لێکردبووم و هەروەها نوسیبووی: "پێموایە بەدەستهێنانی پلەی چوارەم، لە سەروی چاوەڕوانی تۆوە بوو." پاشان ئاماژەیەکی سەرنجڕاکێشی کردبوو، لە درێژەی نامەکەدا نوسیبووی: "ساڵی داهاتوو، لەسەر سەکۆی یەکەمی تۆردۆفرانس، بێ وێنە دەردەکەوی."

پەیامەکەی ئەو، ئەم ڕستەی کۆتاییە بوو. نامەکەی ئەوم خستە سەر سی دی، پرێنتم کرد و دووبارە وشەکانی نێو نامەکەم خوێندەوە. تۆردۆفرانس؟ کەواتە یوهان پێیوابوو من دەتوانم لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانسدا پاسکیلسوارێکی پیشەیی بم و ئەمەش، بابەتێکی جێی تێڕامان بوو.

له ماوەی چەند رۆژی دواتردا، چەند جارێك ئەم نامەیەم خوێندەوە. پاش سالێك گومان و سەر لێشێواوی، ئێستا دەمزانی دەبێ چی بكەم. دەمەویست ببمە پالەوانی پێشبڕكێی تۆردۆفرانس.

ئەوەی مرۆڤ لە قۆناغی چاكبوونەوەدا فێری دەبێ، ئەمەیە كە دوای تێپەڕاندنی قەیران و بێ هیوایی، دوای قبولكردنی ئەو راستییەی كە نەخۆش بووە، شاییكردن و خۆشی دەربڕینی چاكبوونەوە و گەڕانەوە بۆ خووەكانی پێشووی وەك چاككردنی دەموچاو لەكاتی بەیانیاندا، بوونی كار و پیشەیەك، هاوسەرێك كە خۆشتدەوێ و منداڵێك كە پێویستە گەورەی بكەی. ئەمانە هەموو ئەو رایەلانەن كە رۆژەكان پێكەوە دەبەستنەوە و پرۆسەیەك پێكدەهێنن كە دەكرێ ناوی بنێین "ژیان".

یەكێك لەو شتانەی كە گەشتەكەی "بۆن" فێری منی كرد، روانینێك بوو كە بۆ ژیان بۆم دروست بوو. كاتێك كە خەریكبوو لە لۆفەیەكی چاوەڕواننەكراو تێپەڕ دەبووم، لەپڕ دیمەنێكم بینی. ریزی درەختەكان لێك بلاو بوون و توانیم سێ زنجیرە كێو لە ئاسۆدا ببینم. ئێستا روانینی من بۆ ژیانی خۆم، بەو شێوەیەی لێهاتبوو.

حەزم دەكرد ببمە خاوەنی منداڵ. ئەو كاتەی نەخۆش بووم، بوون بە باوك وەك شانسێكی لەدەستچوو وابوو، بەلام ئێستا ئاسۆی ژیانم، بەروونی و ئاشكرایی كێوەكانی بۆن بوو، چیتر نەمدەویست بوون بە باوك دوا بخەم. خۆشبەختانە "كیك"یش بەم بابەتە رازی بوو. ئێمە تەواو لە یەكتر تێدەگەیشتین و سەرەڕای گرفت و كێشەكانی سالی رابووردوو، زۆر

ڕێك و كۆك بووین، كەواتە دەمانتوانی مرۆڤێكی دیكە پەروەردە بكەین.

پرۆسەی پزیشكی ئەم بابەتەش بەڕادەی چارەسەری شێرپەنجە، ئاڵۆز و بەو رادەیەش، پێویستی بە لێكۆڵینەوە و بەرنامەڕێژی، بەكارهێنانی دەرمان و هەروەها پێویستی بە دوو نەشتەرگەری هەبوو. من نەزۆك بووم و كیك دەبوو بە شێوازی تاقیگەیی دووگیان ببێت.

ئەوەی دەیخوێننەوە، هەوڵی منە بۆ دەربڕینی راستییەكانی پەیوەندیدار بەم بابەتەوە. زۆرێك لە هاوسەرەكان نایانەوێ پێش ئەوەی ببنە خاوەنی منداڵ، باسی ئەمجۆرە چارەسەرییانە بكەن، هەڵبەت هەقیشیان. بەڵام ئێمە هەستێكی لەو شێوەیەمان نییە و دەزانین، رەنگە بۆ باسكردنی وردەكارییەكانی ئەم بابەتە، بكەوینە بەر رەخنە و تانەی كەسانی دیكە. لەگەڵ ئەوەشدا، بڕیارمان دواە ئەم شتانە باس بكەین، چونكە زۆرێك لە هاوسەرەكان، نەزۆكن و ئەم ترسەیان هەیە كە نەتوانن ببنە خاوەنی منداڵ. ئێمە دەمانەوێ وردەكارییەكانی شێوازی بوون بە خاوەنی منداڵ بەشێوەی تاقیگەیی روون بكەینەوە تا ئەوان بزانن كە دەبێ چ قۆناغ گەلێك ببڕن.

ئێمە دەمانەویست كیك دوای ساڵی نوێ دووگیان بێت. بۆیە دەستمان بە لێكۆڵینەوە و گەڕانی ئەنتەرنێتی و راوێژی پزیشكی سەبارەت بە شێوازی تاقیگەیی كرد، ڕێك وەك لێكۆڵینەوە لە بارەی شێرپەنجە. پاشان بۆ بینینی پسپۆڕی IVF لە زانكۆی كرنل (Cornell University)، گەشتێكمان ڕێكخست. بەڵام لەگەڵ نزیك بوونەوەی رۆژی گەشتەكەمان،

بیرمان بۆ ڕێگایەکی دیکە چوو. لەبەر ئەوەی لە گەشت کردن ماندوو بوو بووین و نەماندەویست بۆ ماوەی چەند هەفتە، لە هوتێلێکی نەناس لە نیۆیۆرك بمێنینەوە (ڕێك وەك سەردەمی چارەسەری کیمیایی)، بڕیارماندا پسپۆڕێکی IVF بەناوی تۆماس واین دەعوەت بکەین بۆ ماڵەوە لە ئاستین.

ڕۆژی بیست و هەشتی دیسەمبەر، یەکەم دانیشتنی ڕاوێژکاری لەگەڵ دکتۆر واین بوو. من و کیك، هەر دووکمان کاتێك لە نۆڕینگەکەی ئەو دانیشتبووین، تووڕە بووین. من بە پێچەوانەی هەمیشە، سەروشکڵێکم هەبوو کە کیك بە "سەروشکڵی پزیشکی" ناوی دەبرد.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا سەروشکڵم بەوجۆرە بوو: لێوی پێکەوە نووساو و نیگایەکی قوڵ. کیك پێدەکەنی تا من ئەو تەرح و شکڵەم نەمێنێ و هەر لەبەر ئەم هۆکارە، دکتۆر واین لەو باوەڕەدا بوو کە ئێمە شیاوی ئەوەین ببین بە دایك و باوك.

لەکاتی قسەکردن سەبارەت بە پرۆسەی IVF، هەستم کرد کیك جاروبار شەرم دەکات و سوور هەڵدەگەڕێت. بەڵام بەلای منەوە قسەکردن لەبارەی بابەتە سێکسییەکان هیچ کێشە نەبوو. بە بەرنامەڕێژییەکی تەواوەوە نۆڕینگەی پزیشکمان جێهێشت. هەر دووکمان بەلامانەوە سەیر بوو، چونکە ئەگەر هەموو شتێك بەپێی بەرنامە بچووبایە پێش، کیك دەیتوانی مانگی فێبریوەری دووگیان ببێت. کاتبەندی زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەگەر بڕیار بوو لە پێشبڕکێی تۆردۆفرانسدا براوە بم، دەبوو کاتی

لەدایکبوونی منداڵەکەمان لەگەڵ ڕاهێنانەکاندا ڕێك بخەین.

دوو ڕۆژ دواتر، کیك بەپێی یەکەم بڕیار چوو بۆ رادیۆلۆژی. پەرستارەکان ئەویان لەسەر قەرەوێڵەیەك پاڵ خست و بە ئامێرێکی ئازاردەر، دەستیان بە پشکنینی ئەو کرد. لەم پشکنینەدا دەردەکەوێ کە هیچ کام لە ڕێڕەوەکان نەگیراوە یان دانەخراوە. کیك هێندەی ئازار پێگەیشت دەستیکرد بە گریان. ئەو لەبەر ئەم بابەتە لەخۆی نیگەران بوو و دەیووت: "من کەسێکی زۆر ئیحساساتیم."

شەوی دواتر، شەوی جەژنی پاك بوو، دوایین شەو کە ئەو بۆی هەبوو شەراب بخواتەوە، لەبەر ئەوەی لە ساڵی نوێدا نەیدەتوانی کحول یان کافائین بخواتەوە. بۆیە ئەو شەوەمان کرد بە جەژن و لەوە بەدوا ئەو بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر، چونکە هەر دووکمان دەمانەویست منداڵەکەمان سروشتی و لەشساغ بێت.

هەفتەیەك دواتر، قەراری چاوپێکەوتنمان لەگەڵ پەرستارێکی IVFدا هەبوو، هەر دووکمان پێمانوابوو چاوپێکەوتنێکی سادەیە، بەلاّم هەڵە بووین. یەکێك لە پەرستارەکان پێی وتین، بۆ تەواو کردنی دۆسییەکە پێویستە وێنەمان بگرن. پاشان ئەو فیلمانەی کە لە قۆناغی دواناوەندیدا زۆر جار بینیبوومان و هیچ حەزمان بە بینینی نەدەکرد، دووبارە سەیرمان کردنەوە. پەرستارەکە، بەستەیەکی پڕ لە کۆمەڵێك وێنە و زانیاری دا بە ئێمە و وتی دەبێ لاپەڕە بە لاپەڕە بیانخوێنینەوە. من لەسەر کورسییەکەی خۆم دانیشتم و بە کێشانەوەی وێنە گەلێکی گاڵتەجاڕانە و

گێڕانەوەی نوکتە، کیکم سەرگەرم کرد.

هەنیشکێکم لە کیك کوتا و بە ئاماژە تێمگەیاند کە لەوێ بڕۆین، بەڵام کاتێکی گونجاو نەبوو بۆ ئەوەێ ئەو شوێنە جێبهێڵین. هەر دووکمان خەریکبوو.لەبەر پێکەنین دەپچڕاین و نەماندەتوانی رێگایەکی بەئەدەبانە بۆ رۆشتن لەوێ بدۆزینەوە. بەڵام ئاخرەکەی نەمانتوانی ئارام بگرین، کیك نامیلکەکانی کۆکردەوە، هەستاین و خێرا ژوورەکەمان جێهێشت. رێك وەك خوێنکاری قوتابخانە لەوێ چووینە دەرەوە و تا گەیشتنە لای ئوتۆمبێلەکە هەر پێدەکەنین و لەبەر خۆمانەوە بیرمان دەکردەوە کە هێشتا ئەوەندە گەورە و پێگەیشتوو نین کە ببین بە باوك و دایك!

دوای چەند رۆژی دیکە، دووبارە بۆ پشکنینی خوێن چووینەوە بۆ ئەوێ. کاتێك خەریکبوو خوێنیان لە کیك وەردەگرت، رەنگی تەواو زەرد بوو بوو. ئەو لە دەرزی دەترسا و هەقی خۆی بوو کە بەو شێوەیە رەنگی بە رووەوە نەمێنێت.

ئەو شەوە دەبوو کیك یەکەم دەرزی لاپرۆن (Lupron) لەخۆی بدات. لاپرۆن دەرمانێکە کە رێ لەوە دەگرێت ژنان هێلکۆکە دروست بەکەن. ئەو دەبوو تا ئەو کاتەی کە پزیشك بڕیاری راگرتنی دەدات، شەو و رۆژی دە یەکە لەم دەرمانە –کە بە رادەی یەك دەرزی بوو– بەکار بهێنێت. بۆ کەسێك کە زۆر رقی لە دەرزی بوو، بەڕاستی ئەو دەرزی لێدانانە ئازاردەر بوو، لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو کە، خۆی دەبوو ئەم کارە بکات.

هەموو شەوێك، كاتژمێر هەشتونیوی ڕێك، ئەو دەبوو بچێ بۆ حەمام و ئەم دەرزییە لە ڕانی خۆی بدات. یەكەم جار كە ئەم كارەی كرد، دەستی بەشێوەیەك دەلەرزی كە نەیدەتوانی هەوای نێو سرنجەكە بەتاڵ بكات. دواجار دەرزییەكەی بەتوندی لەخۆی دا، هاواری لێبەرز بۆوە و شوێنی دەرزییەكەی گرت. لە ناوەندی ئەو هەفتەیەدا، تیمی پوستاڵ هاتن بۆ ئاستین تا تاقیكردنەوە پێویستەكانی پێشبڕكێ ئەنجام بدەن. من و كیك، هەموویانمان بۆ نانی ئێوارە دەعوەت كرد، بەڵام هەر كە میوانەكان هاتن، كیك سەیری كاتژمێری كرد، ڕێك كاتژمێر هەشتونیو بوو. داوای لێبوردنی لە میوانەكان كرد، چوو بۆ حەمام و وەك ئالوودە بوویەكی پیشەیی ماددە هۆشبەرەكان، زۆر بەوردی دەرزییەكەی لە خۆی دا.

تیمی پۆستاڵ دوای تەواو بوونی كارەكانیان، چوون بۆ كالیفۆرنیا تا دەست بە ڕاهێنانەكانیان بكەن. منیش دەبوو لەگەڵیان بچم و ئەمەش بەو واتایە بوو كە كیك، ماوەی چەند ڕۆژێك لە پرۆسەی دووگیانبوونەكەیدا بە تەنیا دەمایەوە. كاتێك لە كالیفۆرنیا بووم، كیك چوو بوو بۆ سن ئانتۆنیۆ. بڕیاربوو تۆو(سپێرم)ی بەستووی من لەوێ هەڵگیرێت. بۆ ئەم كارە ساڵانە سەد دۆلاریان لە ئێمە وەردەگرت.

كیك بەیانی زوو چووبوو بۆ سەنتەری IVF، عەمبارێكی بەستووی هەڵگرتبوو. ئەو تا شاری سن ئانتۆنیو كاتژمێرێك شۆفێری كردبوو، پاشان بە زەحمەتێكی زۆر ئەوی تا نهۆمی سیزدەیەمی بیناكە كێش كردبوو. كاتێك یەكێك لە پەرستارەكان، عەمبارەكەی ئامادە دەكرد تا ببرێ بۆ

ئاستین، کیك گۆڤاری هاوس بیوتیفول ( House Beautiful Magazhn)ی خوێندبووەوە. پەرستارەکە لەسەر داوای من دەرگای مەخزەنەکەی کردبۆوە تا کیك، دوو پیتی یەکەمی ناوی من ببینێ کە لەسەر شوشەی نموونەکە هەڵکۆڵدرابوو.

ئەو پاشان پێی وتم: "نزام دەکرد ناوی سەر شوشەکە، ناوی لێری ئاندرسۆن نەبێت."

کیك لەڕێی گەڕانەوەدا، زۆر بە وریایەوە شۆفێری کردبوو. ئەو تا ئەو کاتەی کە عەمبارەکەی رادەستی فەرمانبەری IVF نەکردبوو، هەستی بە ئاسوودەیی نەکردبوو. ئەم کارە کورتە شانۆی رۆمانتێك و ئەویندارانە نەبوو کە ئێمە بیرمان لێدەکردەوە، بەڵکو جۆرێك خۆ ئامادە کردن بوو بۆ ئەوەی ببینە خاوەنی منداڵ.

کیك هەروا لە دەرزی لێدانەکەی خۆی بەردەوام بوو. شەوێك، کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی خۆی بۆ نانی ئێوارە دەعوەت دەکا. کە بوو بووە کاتژمێر هەشت‌ونیو و هاوڕێکانی بە بابەتەکەیان زانیبوو، هیچ کامیان باوەڕیان بەوە نەکردبوو کە کیك ئامادە بێ کارێکی لەو شێوەیە بکات، هەر بۆیە لەکاتی دەرزی لێدانەکەی چووبوون بۆ سەیر کردنی. ئەو بە ترس و بە دەستی لەرزۆکەوە، ویستبووی دەرزییەکە لەخۆی بدات، بەڵام دوایین شوشەی لاپرۆنەکەی لەدەست دەکەوێتەخوار و دەشکێت. چاوی تێبڕیبوو، زۆر ترسابوو، باوەڕی نەکردبوو کە شوشەکە شکابێ، ئەو دەیزانی ئەگەر یەکێك لە دەرزییەکان لەخۆی نەدات، هەموو ریسەکەی لێ

دەبێتە بەخوری و دەبێ مانگی داهاتوو، سەرلەنوێ دەست بە خولێکی نوێی دەرزی لەخۆدان بکاتەوە. کاتێك هاوڕێکانی خەریکی کۆکردنەوەی وردە شوشەکان بوون تا سەگ نەیانخوات، کیك بە تورەییەوە لە مەلزەمەکەی خۆیدا بۆ ژمارە تەلەفۆنی پەرستارەکە دەگەڕێ و ئاخرەکەی دۆزیبوویەوە. کاتژمێر هەشتو چلوپێنج خولەکی شەوی شەممە، کیك پەیوەندی بە پەرستارەکەوە دەکات و بە قوڕگێکی بوغز گرتووەوە، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕابوەوە. پەرستارەکە وتبووی: "ئۆی، ئازیزم!" پاشان هەر دووکیان بەشوێن دەرمانخانەیەکدا گەڕابوون کە رۆژی پشوو کراوە بێت. دواجار کیك، دەرمانخانەیەکی دۆزیبۆوە و لە شارێیەکەوە بەرەو ئەوی چووبوو. بەرپرسی دەرمانخانەکە، دەرمانخانەکەی بەکراوەیی هێشتبۆوە تا کیك بگات و کە گەیشتبووە ئەوێ دڵنەوایی کیك کردبوو، هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستبوو.

دوای چەند رۆژێك، کیك سەردانی نۆڕینگەی دکتۆر واین دەکات تا سۆنۆگرافی بۆ بکات و بزانێ هێکۆکە دروستبووەکان لە چ دۆخێکدان. بۆ کیك کارێکی قورس بوو بەتەنیا بچێت بۆ نۆڕینگەی پزیشك. هەموو ئەو ژنانەی دەهاتنە نۆڕینگەکە، هاوسەرەکانیان لەگەڵدا بوو. کیك، کاتی هەڵدانەوەی گۆڤاری پیپل (People Magazine)، هەست بە سەیرکردنی ئەوان دەکات و دەزانێ لە مێشکی خۆیاندا بیر لە چی دەکەنەوە: بۆ دەبێ ژنێکی لاوی وەك ئەو IVF بکات، بۆ هەمیشە بە تەنیا دێت؟

دکتۆر واین دەرمانی گۆنال-ئێف (Gonal-F)ی بۆ کیك نووسیبوو، دەرمانێك کە فولیکول دەورووژێنێ تا هێلکەی زیاتر دروست بکات. لە ئێستا بەدواوە دەبوو کیك ڕۆژی دوو دەرزی لەخۆی بدات: پێنج یەکە لاپرۆن و سێ شوشە گۆنال-ئێف. ئەو دەیووت: "لەم ماوەیەدا لەشم وەك سەرینۆکی دەرزی سنجاق، کون کون بووە."

تێکەڵ کردنی دەرمانی گۆنال-ئێف کارێکی قورس بوو. دەرمانەکە بەشێوەی تۆز لە نێو شوشەیەکی بچووکدا بوو، دەبوو کیك بە سرنجێکی درێژ، لە خۆی بدات کە تەنانەت سەیر کردنیشی تێکی دەدا. ئەو دەبوو بە سرنج، نیو یەکە لە ئاوە دڵۆپێنراوەکە راکێشێ، سەری ئەو شوشانەی بشکاندبایە کە تۆزەکەی تێدابوو، ئەوکات ئاوەکەی بکردبایە نێو شووشە تۆزەکەوە. پاشان سرنجەکەی پڕ بکات لە گیراوە بەدەستهاتووەکە و پیتکەیەك لە سرنجەکە بدا تا هەوای نێوی بەتاڵ ببێت. کەمێکی لێ دەکردە دەر تا دڵنیا بێ کە سرنجەکە هەوای تێدا نەماوە و لە کۆتاییدا، دەرزییەکەی لە رانی خۆی دەدا.

ڕۆژی بیست و دووی جەنیوەری، کاتژمێر حەوتی بەیانی، کیك بۆ پشکنینی خوێن چوو بۆ نۆرینگەی دکتۆر واین. بەڵێ، دەرزییەکی دیکە. ئەو هەوڵی دەدا سەیری سرنجەکە نەکات و سەیری ئەو کارتۆنەی دەکرد کە لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەبۆوە. ئەو بەو شێوە بیری دەکردەوە کە ئەگەر نەتوانێ خۆی بۆ ئەمە بگرێ، ئەی چۆن دەتوانێ منداڵی ببێت. کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، کیك بۆ ئەنجامدانی دووەم سۆنەر

چوو بۆ ئۆرینگەی دکتۆر واین. سۆنەرەکە هەبوونی دوانزە هێلکەی پیشان دەدا کە بەپێی کاتبەندی گەشەیان کردبوو.

سەیرەکە لەمەدایە کە ڕێك هەر ئەو ڕۆژەی کە ئەو بۆ سۆنەر گرتن چووبوو، منیش بۆ سەردانی دکتۆر نیکۆلز و ئەنجامدانی پشکنین شەشەم مانگی دوای شێرپەنجەکە، لە کالیفۆرنیاوە چوو بووم بۆ ئۆرەگۆن (Oregon). دکتۆر نیکۆلز لە ئیندیانا پۆلیسەوە گواسترابۆوە بۆ پۆترلەند، بەڵام من هێشتاش بۆ پشکنینی مانگانە دەچووم بۆ لای ئەو. ئەم بابەتەی کە لەو کاتەدا کە من لای پزیشکێك بووم، کیك بە ئامانجێکی جیاواز لای پزیشکێکی دیکە بوو، زۆر سەرنجڕاکێش بوو. ئێمە پێمانوابوو ئەم دوو ڕوداوە، لە شتێکدا هاوبەش بوون: هەر کام لەم پزیشکانە، بەجۆرێك لە جۆرەکان تاوتوێی ئەگەری ژیانیان دەکرد.

کێك تاڕادەیەك ئامادەی نەشتەرگەری ڕێتریڤاڵ (Retrieval) بوو، نەشتەرگەرییەك کە لەودا هێلکەکان دەردەهێنران. ڕۆژی پێش نەشتەرگەرییەکە، من گەیشتمەوە ماڵەوە و خەیاڵی هەر دووکمان ئاسوودە بوو. ئەو ڕۆژە ئەو جارێکی دیکە پشکنینی خوێنی کرد، سۆنەری گرت و دەبوو دەرزییەکی HCG لە خۆی بدات. لێدانی ئەم ماددەیە لە ماوەی چارەسەری کیمیاییدا، ژیانی منی دەخستە مەترسییەوە. بەڵام لەم حاڵەتەدا، کاریگەری باشی لەسەر کیك هەبوو، گەشەی بە هێلکەکانی نێو هێلکەدانی ئەو دەدا و بۆ نەشتەرگەری ڕێتریڤاڵ ئامادەی دەکرد.

ڕێك كاتژمێر حەوت‌و نیوی شەو، واتە سی‌و شەش كاتژمێر پێش نەشتەرگەرییەكە، لە كلینیكیكی ناوچەكەی خۆمان دەرزییەكەی لێدرا. بە سرنجێكی زۆر درێژ بەلام بەدەستی پەرستارێكی زۆر میهرەبان، دەرزییەكە لە كیك درا كە لەسەر قەرەوێلە پاڵ كەوتبوو و دەلەرزی.

كێك ئەو شەوە خەون و مۆتەكەی خراپی دەبینی.

ڕۆژی نەشتەرگەرییەكە، كاتژمێر شەشی بەیانی لەخەو هەستاین و چووین بۆ ئەو سەنتەرەی كە دەبوو نەشتەرگەرییەكەی لێ بكرێت. لەوێ جلوبەرگی تایبەتی نەخۆشخانەیان دا بە كیك. پسپۆڕی بەنج، پرۆسەی نەشتەرگەرییەكەی بۆ ئێمە ڕوون كردەوە و ژمارەیەك كاغەزی دا بە ئێمە كە واژۆیان بكەین. من و كیك، هەردووكمان لە حاڵەتێكی تووڕەی و بە خەتێكی ناخۆش، كاغەزەكانمان واژۆ كرد. یەكێك لەم كاغەزانە، مۆڵەتی ئەوەی بە پزیشك دەدا كە ئەگەر نەیانتوانی بە شێوازی كۆن هێلكەكان دەربێنن، ئەوا سكی هەڵدڕێ و هێلكەكان بێنێتە دەر. پاشان "كیك"یان بردە ژووری نەشتەرگەری.

ئەویان بە حاڵەتێكی هاوشێوەی خاچ لەسەر قەرەوێلەیەك خەواند، ئەو دوای لەهۆش خۆچوون، چیتر هیچی بیر نەدەهاتەوە و ئەمەش زۆر باش بوو. پزیشكەكە بە سرنجێكی زۆر درێژ و بە یارمەتی كاتتر، هێلكەكانی دەردەهێنا.

كاتێك كە كیك لە ژووری وەهۆش هاتنەوە، هۆشی هاتەوەبەر و منی لە تەنیشت خۆی بینی، داوای لێكردم: "دەكرێ لە تەنیشتم بخەوی؟" خۆم

لێ نزیك كردەوە و تا تەواو هۆش خۆی هاتەوە، لە تەنیشتی مامەوە. پاشان لەسەر عارەبانەیەکم دانا، بردمە نێو ئۆتۆمبێلەکە و بۆ دووەم جار لە ژیانمدا، بەخێراییەکی زیاتر لە ئاستی ڕێگە پێدراو، شۆفێریم کرد.

کیك، پشووی کۆتایی هەفتە ئیسراحەتی دەکرد و سەیری فیلمی دەکرد. منیش خواردنم دروست دەکرد و بەو ڕادەگەیشتم. "باربارا"ی هاوسەری بارت ناگس، چەپکە گوڵێك و کارتۆنێك هێلکەی هێناو و وتی: "لەبەر ئەوەی چیتر هێلکە ناخۆن هێناومە." کیك نەیدەتوانی زۆر پێبکەنێ، هەڵبەت پێکەنین بە ڕادەی لێدانی پرۆجسترۆن کە من لێمدەدا، بەئازار نەبوو. دواین ڕاسپاردەی پزیشك ئەوە بوو کە، هەموو شەوێك بڕ(دۆز)ێك پرۆجسترۆنی لێبدرێت. ئەمە گەورەترین سرنجێك بوو کە تا ئێستا لە کیك درابوو، منیش دەبوو لێیدەم.

ڕۆژی یەکی فێریوەری، دکتۆر واین پەیوەندی کرد و هەواڵی پیتاندنەکەی بە ئێمە دا. ئەوان تۆو(سپێرم)ە بەستووەکەیان لە حاڵەتی بەستوویی دەرهێنابوو، لە پرۆسەیەکدا بەناوی تێشاندنی سپێرمی ئینتراسیتۆپلاستیك (ICSI[١٢]) ئەو تۆوانەیان تێشاندبووە نێو هێلکەکان. ئەوان هەر هێلکەیەك و تۆو(سپێرم)ێکیان تێشاندبوو. ئەو وتی ئێمە نۆ هێلکەی شیاوی سوود لێوەرگرتنمان هەبووە. ئەوان بڕیاریان دابوو سێ هێلکەی تەواو لە نێو منداڵدانی کیکدا بچێنن و سێ دانەی دیکە ببەستێنن. بەستاندنی منداڵانی داهاتوومان کارێکی سەیر بوو!

---

[١٢] - ICSI: Intracytoplasmik Sperm Inection

دوای تەواو بوونی پەیوەندییەکە، بۆ ساتێك ترسم لێنیشت. وتم: "ئەگەر هەر سێ هێلکەکە ببن بە منداڵ، چی بکەین؟!" ئەوسا، هاوکات سێ منداڵمان دەبێت! سێ ڕۆژ دوای نەشتەرگەرییەکە، بۆ کاری "گواستنەوەی" هێلکەکان، چووین بۆ نەخۆشخانە. دوای هاوسەرگیرییەکەمان، ئەم کارە گرنگترین ڕووداوی ژیانمان بوو. ئێمەیان بەرەو ژووری نەشتەرگەری ڕێنمایی کرد و لەوێ بێس ویلیامسۆن ( Beth Williamson) بۆی ڕوون کردینەوە کە پشووەکانی کۆتایی هەفتە سەرقاڵی پیتاندنی هێلکەکان بووە. ئەو وتی کاتێك کە تۆو(سپێرم)ەکانی لە حاڵەتی بەستوویی دەرهێناوە، زانیم کە ئەوان زیندوون و دەجووڵێن و خەیاڵی لەم بابەتەوە ئاسوودە بوو بوو، چونکە هەمیشە ئەم حاڵەتە ڕوو نادات. ئەو دەیووت کە پیتاندن، زۆر بە خاوی ڕوو دەدات و تەنانەت وێنەی پرۆسەی پیتاندنەکەشی گرتبوو. ئەو وتی: "سەیرکەن، ئەم وێنەیە تێشاندنی بەکۆمەڵ پیشان دەدات." ئەمە دەستەواژەیەکی گاڵتەجارانە بوو کە ئەو بۆ ڕوونکردنەوەی وێنەیەکی تاریکی سێ ئاوڵەمە و تێشاندنی تۆو(سپێرم) بۆ هەر یەکێك لەوان، پیشانی ئێمەی دا. ئاولەمەکان هەر یەکەو هەشت خانەیان هەبوو کە بەپێی کاتبەندی خەریك بوو دابەش دەبوون.

کیك وتی: دەتوانی بڵێی ڕەگەزی ئەوان چییە؟"

دکتۆر ویلیام وتی نا، دیاریکردنی ڕەگەز لەم قۆناغەدا، تەنیا بە هەڵگرتنی یەکێك لە خانەکان و ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی DNA دەکرێ

و من لەم کارەدا، وەك پێویست شارەزا نیم. وتم: "نا، سپاس، پێمان باشترە دان بەخۆماندا بگرین."

دوای ڕۆشتنی بێس، یەکێك لە پەرستارەکان جلوبەرگی تایبەتی ژووری نەشتەرگەری بۆ من و کیك هێنا. کاتێك کە جلوبەرگەکانمان لەبەر کرد، کیك پێکەنیّ و گاڵتەی لەگەڵ من کرد. داوام لە دکتۆر واین کرد، دوایین وێنەی سەردەمی بیّ منداڵی ئێمە بگرێت. پاشان چووینە ژوورێکی نەشتەرگەری تاریك، ڕووناکی ژوورەکە کەم بوو بۆ ئەوەی ئاسوودەتر بین. ئێمە تووڕە و نیگەران بووین، تەنیا ئەوەندەی هەبوو کە زۆر بیّئۆقرە بووین و هەر دووکمان وەك گەمژەکان پێدەکەنین. دواجار، پزیشك ئاماژەی بە تیمی کۆرپەلە ناسی کرد کە کاتی هاتووە و ئەوان بە سیّ کۆرپەلەوە کە لە نێو سرنجێکدا بوو، هاتن. من لە تەنیشت کیك و لەسەر تەپڵەکێك: دانیشتبووم و لەژێر چەرچەفەوە، هەر دوو دەستی ئەوم لەنێو دەستی خۆم گرتبوو. چاومان لەسەر یەکتر هەڵنەدەگرت.

ئەوان "کیك"یان هەستاند و بردیانە ژوورێکی وەهۆش خۆهاتنەوەی بچووك کە دەبوو کاتژمێرێك بەبیّ جووڵە لەویّ بخەوێت. من لەسەر قەرەوێڵەیەکی نزیك ئەو پاڵکەوتبووم. لەویّ لە تەنیشت یەکتر خەوتبووین، سەیری بن میچی ژوورەکەم دەکرد و هەر کاممان، سەبارەت بە سیّ جمکەکان گاڵتەمان بەوی دیکەمان دەکرد.

دوای کۆتاییهاتنی یەك کاتژمێرەکە، پەرستارێك هاتە ژوور و وتی پێویستە کیك لە دوو ڕۆژی داهاتوودا، تەواو پشوو بدات. بە وریاییەوە

چووینەوە بۆماڵەوە، ئەوم لەنێو سیستەمەکەدا خەواند و لە تەنیشتی دانیشتم. خواردنی نیوەڕۆم بۆ هێنایە نزیک سیستەمەکە و لەکاتی نانی ئێوارەدا، مێزەکەم بە سفرەی سەفەری خاوێن و جوان ئامادەکرد.

وتم: "گرووپی پێنج کەسی ئارمێسترانگ، فەرموون بۆ نانی ئێوارە! "

وەك گەورەی خزمەتکاران، نانی ئێوارەم تێکرد. کیك ڕێی پێدرابوو کە بە دانیشتنەوە نان بخوات، لە نێوان خواردنی زەڵاتە و خواردنە سەرەکییەکەدا، یارمەتی ئەوم دا تا لەسەر قەنەفە پاڵکەوێت. ئەو نازناوی سەرۆکی بەندیخانەی بە من دا.

ڕۆژی دوایی کە کیك لەخەو هەستا، سکیم ماچ کرد. لەو ڕۆژە بەدواوە، کیك دەستی بە خواردنی دەرمان گەلێك کرد کە پێم دەووتن: "دەرمانی کاتی لەسەر هێلکە کرکەوتن". تیمی کۆرپەلەناسی، پێش گواستنەوەی هێلکەکان، کونێکی مایکرۆسکۆپیان لە هەر کام لە فولیکۆلەکان کردبوو تا ئەم دەرمانە یارمتی کۆرپەلەکان بدات کە لەنێو فولیکۆلەکە بێنەدەر و بچنە نێو منداڵدانەوە.

ئێمە تا پانزەی فێبریوەریش نەماندەزانی کە ئایا کیك دووگیانە یان نا. هەر دووکمان بێئۆقرانە چاوەڕوان بووین و سەرنجی هەر چەشنە گۆڕانکارییەکمان دەدا کە لە کیك دا دروست بووبایە، بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی ئەو دەرزی و حەبانەی کە کیك لەو دواییانە بەکاری دەهێنان، نەماندەتوانی حاڵەتەکانی ئەو لەگەڵ دووگیانی "ئاسایی"دا بەراورد بکەین. بەردەوام بە نیگەرانییەوە لێم دەپرسی: "ئایا هەست بە

گۆڕانکاری ناکەیت؟" بەردەوام بیرمان لەوە دەکردەوە کە "دەبێ چ گۆڕانکارییەك ڕوو بدات؟"

کیك دەیووت: "چ گۆڕانکارییەك؟"

دواجار، یانزە ڕۆژ دوای گواستنەوەکە، کیك بەیانی زوو بۆ پشکنینی HCG (پشکنینی دووگیانی) سەردانی نەخۆشخانەی کرد. ئەو بەڕادەیەك تووڕە بوو کە لە ڕێگای چوون و گەڕانەوە بۆ نەخۆشخانە، رادیۆکەی کوژاندەوە و نزای دەکرد. ئەنجامەکە کاتژمێر یەك و نیوی دوانیوەڕۆ دەردەکەوت، بۆیە هەوڵماندا کاتەکەمان بە خواردنی ژەمێکی تێروتەسەلی بەیانی، حەمام کردن و کۆکردنەوەی کەلوپەل بە نیازی ئەورووپا، بەسەر بەرین.

کاتێك کیك لەگەڵ سەگەکەی بۆ پیاسە چووبوونە دەرەوە، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا. تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و وتم: "فەرموو؟"، گوێم گرت. چاوەکانم پڕ بوو بوون لە فرمێسك. تەلەفۆنەکەم داخستەوە و ئەوم لە ئامێز گرت و وتم: "خۆشەویستم، تۆ دووگیانی." ئەو دەستی کردە ملم و وتی: "دڵنیای؟" پێکەنیم و پاشان هەر دووکمان پێکەوە گریاین.

ئێستا کە دەمزانی ئەو دووگیانە، پرسیارەکە ئەوە بوو کە ئەو چەند منداڵی لە سکیدا هەڵگرتووە؟ بەخۆشحاڵییەوە وتم هیوادارم سیانەی کوڕ بن، تا زیاتر بێ باشترە!

کیك وتی: "هاوسەرەکەی من توانای خەیاڵ و تەنزی باشی هەیە، تەنانەت ئەگەر بە خەیاڵ کردنەکانی من ئازاریش بدات."

وتم: "تۆ بە سێ منداڵەوە لە دوایین فڕینی نێودەوڵەتیدا وێنا دەکەم، لە حاڵێکدا کە خەریکە بەدەستیانەوە شێت دەبیت."

کیک دەیزانی کە دەبێ وریا بێت. ئەو خواردنە سەرەکییەکانی دەخوارد، ڕۆژانە چوار میل پیادەڕەوی دەکرد، ڤیتامینەکانی قۆناغی دووگیانی دەخوارد و پشووی دەدا. ئەو کۆمەڵێك کتێبی لەبارەی قۆناغی دووگیانییەوە کڕیبوو کە پێکەوە دەمانخوێندنەوە. دۆست و هاوڕێیان لێیان دەپرسی کە ئایا ئێستاش نەخۆشە، کە هەڵبەت وا نەبوو. لەڕاستیدا هەستێکی ئەوەندە خۆشی هەبوو کە هەندێکجار بیری دەکردەوە ڕەنگە ئەوان پشکنینی خوێنی ئەویان لەگەڵ کەسێکی دیکەدا لێ تێکچووبێ و ئەو هەر دووگیان نییە.

ئەو بۆ ڕەوینەوەی ترسەکانی، پشکنینی دووگیانیشی لە ماڵەوە کرد.

وتی: "تەنیا ویستم دڵنیا ببمەوە."

دواجار کاتی ئەوە هات کە من بگەڕێمەوە بۆ ئەورووپا و تیمی پۆستاڵ. دەبوو کیك بۆ چەند پشکنینی دیکە لەوێ بمێنێـەوە و پاشان لە یەکەم هەلدا بێ بۆ لای من. ڕۆژی پێنجی مارس ئەو سۆنەری هەبوو، لەم قۆناغەدا دەردەکەوت کە ئەو چەند کۆرپەلەی لە سکدایە. من تاڕادەیەك ئەوم بە قەناعەت گەیاندبوو کە ئەوان سیانەن و هەمووشیان کوڕن، بەڵام سۆنەر پیشانی دا کە ئێمە یەك منداڵی ساغمان هەیە، نە دووانەیە و نەسیانە. خەیاڵی ئاسوودە بوو، بەڵام لەناخی خۆیدا هەستی بە نیگەرانی دەکرد. نەك ئەمەی کە حەز بکات ببێتە دایکی چەند منداڵ، بەڵکو ئەو

بیرکردنەوەیە نیگەرانی دەکرد کە دەبێ ئەو دوو کۆرپەلەی دیکە چییان بەسەر هاتبێت. کیک لە دکتۆر واینی پرسیبوو، ئایا دەکرێ ئێمە کارێکمان کردبێ کە بووبێتە هۆی لەنێوچوونی ئەو دوو کۆرپەلەیە؟ ئەو لە وەڵامدا وتبووی هیچ بەو شێوەیە نییە، هەندێك شت بەشێوەی سروشتی ڕوو دەدەن و هیچ ڕوونکردنەوەیەکیش هەڵناگرن، تەنانەت لە چارەسەرییەکانی نەزۆکیشدا.

ئەو وتبووی: "ئێستا ئێمە دڵێکی بچووکمان هەی کە بەتوندی لێدەدا."

ئەو لە سۆنەرەکەدا ئاماژەی بە خاڵێکی شێوە فاسۆلیایی چاوترووکێنەر کردبوو. کیک پێدەکەنێ و دەڵێ: "بێگومان ئەم جیناتەکانی من نین کە دەبێتە هۆی لێدانی ئەم دڵە بچووکە، بەڵکو جیناتەکانی لانسە." دکتۆر واین، وێنەیەکی لێڵ و نارۆونی لە تەنە شێوە فاسۆلیاکە چاپ کردبوو تا کیک بۆ منی بهێنێت. چەند ڕۆژ دواتر کیک گەیشتە نایس و وێنەکەی پیشانی من دا. بەوردی سەیری وێنەکەم کرد، تۆقابووم و وەك بڵێی هیپنۆتیزم کرابووم. ئەو جەستە شێوە فاسۆلیاییە، بەجۆرێك هەستی ژیانکردنی لە مندا دروست کرد کە پێشتر هەرگیز هەستێکی لەو شێوەیەم بەخۆمەوە نەدیبوو. ڕێك وەك ئەو کاتەی لە بۆن گەڕابوومەوە، هەستم کرد ئیتر ڕزگارم بووە.

کیک وتی: "وەك با لێخوڕە، ئێستا باوکە ئارمێسترانگ، خێزانێکی هەیە کە دەبێ ئاگای لێیان بێ و بیانپارێزێت."

**هەمیشە ئەو هیوایە هەیە کە ژیان دووورودرێژ بێ، بەڵام وشەی "دووورودرێژ"، ڕێژەییە. بۆ نموونە کاتێك لە سەرەو ژوورییەکدا پایدەر لێدەدەی، خولەکێك بەلاتەوە، بەڕادەی مانگێك درێژ دەبێتەوە. ڕێك لەبەر ئەم هۆکارەیە کە کەمتر شتێك لە دنیادا، بە رادەی پێشبڕکێی تۆردۆفرانس، دووورودرێژ دێتە پێش چاو! بێگومان ئێستا دەپرسن، ئەم پێشبڕکێیە چەند دەخایەنێت؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، دەکرێ بڵێم: بەڕادەی تەلەکەکانی پارێزەری شارێیەك، کە تا چاو بڕ دەکات، درێژەی هەیە. رەنگە تا ئەو شوێنەی کە لە دوورەوە گلۆپەکان پرتەپرت دەکەن. بە ئەندازەی زەوییە گەرمەکانی هاوین، کە پڕن لە گیای وشك و هیچ دیوارێك لەواندا نابیندرێ، بەڕادەی ئاسۆی سێ نەتەوە، لەسەر لوتکەیەکی گڕنی گڕنی سەهۆڵی لە کێوەکانی پیرنەوە...**

تۆردۆفرانس، ڕووداوێکی مێژوویی کاتییە کە تیایدا، دوو سەد پاسکیلسوار، لە ماوەی سێ هەفتەدا چواردەوری فەرەنسا بە هەموو کێوەکان و ڕێگا دژوار و ئەستەمەکان و لە هەوای گەرمی هاویندا، پایدەر لێدەدەن. لەڕاستیدا، هەوڵدان لەم شاکارە گەمژانەیە، بۆ کەسانێکی وەك من نەبێ کە بۆ سەلماندنی خۆیان، پێویستیان بە تاقیکردنەوەی خۆراگری خۆیان هەیە، هیچ پاساوێکی نییە.

بەڵام من هۆکار گەلێکم بۆ خۆم هەبوو کە ئەم پێشبڕکێیە بە بوێرانەترین ڕووداوی وەرزشی جیهان دەزانم و بۆ من، حوکمی مەرگ و

ژیانی هەبوو.

مۆڵەتم بدەن برێك باسی مێژووی پاسکیلسواری بکەم: پاسکیل، مەکینەی هەڵم و تەلەگراف، داهێنان گەلێك بوون کە بەهۆی گەشەکردنی پیشەسازییەوە داهێنران. یەکەم پێشبڕکێی تۆردۆفرانس لە ساڵی ۱۹۰۳دا بەڕێوە چوو، ئەنجامەکەی لە میدیا وەرزشییەکانی فەڕەنسا و ڕۆژنامەی ئێلئاتۆ (L'Auto)دا بڵاو کرایەوە. لەنێو شەست بەشداربووی ئەم پێشبڕکێیەدا، تەنیا بیستویەك بەشداربوو، گەیشتنە کۆتایی و ئەم ڕووداوە بەخێرایی سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. نزیکەی سەد هەزار تەماشاچی لە قەراغ جادەکانی پاریس وەستابوون. بەشداربووان، هەر لە سەرەتای کارەکەوە ساختەچییەتییان دەکرد و پێشەنگانی گرووپەکە بە ڕشتنی بزماری سەرپان و وردە شوشە لە ڕێگاکەدا، هەوڵیان دەدا ئەوانی دیکە نەتوانن درێژە بە پێشبڕکێکە بدەن. لەو کاتەدا، دەبوو پاسکیلسوارەکان خواردن و پێویستییەکانی خۆیان هەڵگرن، پاسکیلەکانیان تەنیا دوو گێڕیان هەبوو، لەباتی ستۆپ، قاچەکانیان بەکار دەهێنا. (هاوکات لەگەڵ داهێنانی ستۆپ)دا یەکەم قۆناغی پاسکیلسواری شاخیش لە ساڵی ۱۹۱۰دا بە پێشبڕکێکان زیاد کرا، گرووپە پاسکیلسوارەکان سەرەڕای مەترسی پەلاماری ئاژەڵە دڕەندەکان لە کێوەکانی ئالپ، پایدەریان لێدەدا. ساڵی ۱۹۱٤، پێشبڕکێی پاسکیلسواری ڕێك لەو ڕۆژەدا دەستیپێکرد کە ئارچدوك فردیناند (Archduke Ferdinand) تیرۆر کرا و پێنج ڕۆژ دوای کۆتاییهاتنی پێشبڕکێکە، شەڕ لەو کێوانە دەستیپێکرد. لە ئێستادا، پێشبڕکێکان لەژێر

کاریگەری موعجیزەی تەکنەلۆژیدان. پاسکیلەکان ئەوەندە سووکن کە دەکرێ بە دەستێك بەرزی بکەیتەوە، پاسکیلسوارەکان کۆمپیوتەر، کونترۆڵی لێدانی دڵ و تەنانەت بێتەلیشیان پێیە. بەڵام بنەڕەتی پێشبڕکێکان گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. ئەوەی کە کێ لەهەمبەر دژوارییەکانی ڕێگادا، زۆرتر خۆ ڕادەگرێ و لە پایدەرلێدان بەردەوام دەبێت؟ من وەك خۆم دوای هەوڵێکی زۆر و قورس لە پێشبڕکێی تۆردۆفرانسدا، هەستم دەکرد شایستەی ئەوەم کە لە پێشبڕکێیەکی لەم شێوەیەدا بەشداری بکەم.

پێش دەستپێکردنی وەرزی وەرزشی ساڵی ١٩٩٩، بۆ پشکنین چووم بۆ ئیندیانا پۆلیس. لەوێ ڕێیان نەدام سەردانی دۆستانی سەردەمی نەخۆشییەکەم بکەم. ئێسکات شاپیرۆ وتی: "کەواتە تۆ گەڕایتەوە بۆ گۆڕەپانی پێشبڕکێکانی پاسکیلسواری؟"

وتم بەڵێ و پرسیارم کرد: "پێتوایە بتوانم لە پێشبڕکێی تۆردوفرانسدا براوە بم؟"

وتی: "نەك هەر پێموایە دەتوانی، بەڵکو چاوەڕوانی ئەوەم لە تۆ هەیە کە ئەم کارە بکەیت."

لە سەرەتادا، وەرزی پاسکیلسواری ٩٩ بۆ من شکستێکی تەواو بوو. لە دووەم پێشبڕکێی ساڵدا، کە تورۆ ڤالێنسیا (Tour of Valencia) بوو، پاسکیلەکەم شکا و شانیشم خراپ ئازاری پێگەیشت. دوو هەفتە پشووم دا، بەڵام هێشتا نەگەڕابوومەوە، دیسان تووشی ڕووداوی پێکدادان

بووم: کاتێك له باشووری فەڕەنسا خەریکی ڕاهێنان بووم، لەپڕ ژنێکی پیر ئوتۆمبێلەکەی سووڕاند و لێیدام. لەو هەوا پیسەدا، کەوتمە سەر زەوی، ئازارم دەچەشت و هەوڵم دەدا خۆم کۆبکەمەوە. ئەم ڕووداوانەم گێڕایەوە بۆ بەدشانسی سەرەتای وەرز و چووم بۆ پێشبڕکێی دواتر. بەڵام دیسان تووشی ڕووداو بووم. له دوایین بەشی پێشبڕکێکەدا، لەژێر باراندا لەسەر زەوییە تەڕەکە خزام، تایەکانم گێڕ بوون و لەسەر پاسکیلەکە کەوتمە خوار.

چوومەوە بۆ ماڵەوە، هۆکاری هەموو ئەم ڕووداوانە ئەمە بوو کە داهێزراو و ماندوو بوو بووم، بۆیە دوو هەفتەی تەواو کارم لەسەر تەکنیکەکەم کرد تا ئەو کاتەی کە لەسەر کورسییەکەم هەستم بە ئەمان کرد. زۆر زیتەڵ و بەدەماخ گەڕامەوە بۆ پێشبڕکێکان و دواجار له پێشبڕکێیەکدا براوە بووم، کە ئەویش قۆناغێکی پێشبڕکێی سێرکت دێ لا سارتە (Circuit de la Sarthe) بوو. دوای ئەو ئەنجامانە کارەکەم ڕووی له پێشکەوتن بوو.

ئەوەی کە له پێشبڕکێ یەك ڕۆژییەکاندا چیتر وەك پێشوو باش دەرنەدەکەوتم، پێکەنیناوی بوو. من چیتر ئەو پاسکیلسوارە لاوە، تووڕە و ئاڵۆزە نەبووم. هێشتا بە گوڕوتینەوە پێشبڕکێم دەدا، بەڵام شێواز و تەکنیکەکەم جوانی و وردەکاری زۆرتری پێوە دیاربوو، هەروەها وەك پێشوو، هورژمبەر نەبووم. لەم قۆناغەدا، له ڕووی دەروونی، فیزیکی و ڕۆحییەوە، شتێکی دیکە پێخۆری بە من دەدا کە ئەویش تۆردۆفڕانس

بوو.

ئامادە بووم لەپێناو ئامادە بوون بۆ پێشبڕکێی تۆردۆفڕانس، گشت وەرزە وەرزشییەکە فیدا بکەم، ئەم پێشبڕکێیە هەموو شتێکی من بوو. لە هیچکام لە پێشبڕکێ کلاسیکییە بەهارییەکاندا، پێشبڕکێ گەلێکی بەناوبانگ کە پێشبڕکێ نێودەوڵەتییەکانی لەخۆ دەگرت، بەشداریم نەکرد بەڵام لە بەرامبەردا، لە پێشبڕکێ گەلێکدا بەشداریم دەکرد کە یارمەتیم بدەن تا لە پێشبڕکێ سەرەکییەکەدا براوە بم کە لە مانگی جولای بەڕێوە دەچوو. کەس نەیدەزانی من خەریکی چیم، لەبەر ئەوەی کە داهاتی من پێشتر لە ڕێی پێشبڕکێ کلاسیکییەکانەوە بوو. بۆچی لەو پێشبڕکێیانەدا بەشداریم نەدەکرد کە پێشتر براوە دەبووم؟ دواجار یەکێك لە هەواڵنێرەکان هاتە لام و پرسیاری لێکردم، ئایا لە هیچ کام لە پێشبڕکێ کلاسیکییەکاندا بەشداریم کردووە؟

وتم: "نا."

پرسیاری کرد: "بۆچی؟"

وتم: "لە ئێستا کار بۆ بەشداری کردن لە تۆردۆفڕانسدا دەکەم."

وەك بڵێی گاڵتەم لەگەڵ کردبێ، بزەیەکی بۆ کرد و وتی: "ئاها، کەواتە ئێستا تۆ پاسکیلسوارێکی تووردۆفڕانسی."

تەنیا سەیرێکم کرد و لە دڵی خۆمدا وتم، دوایی یەکتر دەبینینەوە بەڕێز..

ماوەیەکی کەم دوای ئەم رووداوە، لە ئەسانسۆری هوتێلێکدا، چاوم بە میگویل ئیندۆراین کەوت. ئەویش لێی پرسیم خەریکی چیم.

وتم: "کاتی زۆرم بە راهێنان لە زنجیرە کێوەکانی پیرنە بەسەر بردووە."

پرسیاری کرد: "بۆچی؟"

وتم: "بۆ بەشداری کردن لە تۆردۆفرانس."

بە سەر سوڕمانەوە برۆیەکی هەڵتەکاند و هیچ نەووت.

هەموو ئەندامانی تیمی پۆستاڵ، وەك من لەهەمبەر پاڵەوانێتییەکەدا، خاوەن بەڵێن بوون. ئەندامانی تیمەکە بریتیبوون لە: فرانکی ئاندرۆ، پاڵەوانی زۆر بەئەزموون و شارەزای پاسکیلسواری خێرا و کاپتنی ئێمە بوو، رووەك خۆرێکی تەواو کە لە سەردەمی لاوییەوە منی دەناسی. کوین لوینگستۆن و تایلەر همیلتۆن، دوو لاوی بەتوانا و پسپۆڕ لە سەرکەوتن ئەندامی تیمەکەی ئێمە بوون. جۆرج هینکاپیێ، پاڵەوانی پێشبڕکێ بەرایییەکانی پاڵەوانێتی ئەمریکا کە وەك فرانکی، پاڵەوانی پاسکیلسواری خێرا بوو. کریستین ڤیندۆلد کە یەکێك لە بەهرەدارترین تازە کارەکانی تیمەکەمان بوو. پاسکال دیریم، جاناتان واترز و پیتەر ماینرتز – نێڵسنیش لە ئەندامانی بەئەمەك و هاونیشتمانی یەکتر بوون کە چەندین کاتژمێر لەسەر یەك و زۆر بەخێرایی و بێ هیچ سکاڵایەك پاسکیلسواریان دەکرد.

ئەو کەسەی کە ئێمەی لە چوارچێوەی تیمێکدا کۆکردبۆوە، سەرپەرشتی تیم، واتە "یوهان برۆینل"ی بەلجیکی بە ڕواڵەتێکی مات و بێحاڵ کە لە پاسکیلسوارە دیرین و کۆنەکارەکانی پاڵەوانێتییەکان بوو. ناوبراو ساڵی ١٩٩٣، لە خێراترین قۆناغی پێشبڕکێکانی پاڵەوانێتی ئەو کاتدا براوە بوو، ساڵی ١٩٩٥یش لە پێشبڕکێی "لیج"دا بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئینۆروایینی شکست دا. ئەو و ئینۆروایین لەپێش هەمووانەوە بوون و هاوشانی یەکتر پایدەریان لێدابوو، بەڵام لە دوایین ساتەکان و نزیک هێڵی کۆتایی پێش ئەو دەکەوێتەوە و پاڵەوانێتییەکە دەباتەوە. ئەو پاسکیلسوارێکی ژیر و داهێنەر بوو کە دەیزانی چۆن دەکرێ ڕکابەرە غەدارەکان بشکێنێ و هەر ئەو بوو کە ستراتیژییەکانی فێری تیمەکەی ئێمە دەکرد.

یوهان باوەڕی بە سازدانی کەمپی ڕاهێنان هەبوو، ئێمەش بێ هیچ سکاڵایەك بەپێی بەرنامەی ئەو دەجووڵاینەوە و بۆ ماوەی هەفتەیەك بۆ ڕاهێنان چووین بۆ زنجیرە کێوەکانی ئالپ و پیرنە. ئێمە ڕێگای شاخاوی پێشبڕکێکەمان بڕی، ڕاهێنانی پێویستمان بۆ سەرکەوتن بە بەرزاییەکاندا ئەنجام دا و هەموومان لە پشت سەری یەکترەوە، وەك زنجیرێك، لە هەر بارودۆخێکی کەش و هەوادا و ماوەی حەوت کاتژمێر ڕاهێنانمان دەکرد. لە ڕاهێنانەکانی شاخ و کوێستانەکاندا هەوڵم دەدا لە نزیك کوین و تایلەرەوە بڕۆم، چونکە ئەوان لەم بوارەدا شارەزا بوون و لە زۆربەی سەرەو لێژییەکاندا ڕێنماییان دەکردم و دەیانبردمە سەر. لە بارودۆخێکدا کە زۆربەی پاسکیلسوارەکان خەریکی پشوودان یان سەرقاڵی پێشبڕکێ

کلاسیکییەکان بوون، ئێمە لە کەش و هەوای خراپدا، راهێنانی سەرکەوتن بە شاخەکانمان دەکرد.

من و یوهان لەکاتی راهێنانەکاندا، دیمەنی پێکەنیناویمان دروست دەکرد. مانگی جەنیوەری بوو، هەموو رۆژێك باران دەباری. لە حاڵێکدا کە من لە هەڵگەڕانە یەك لەدوای یەکەکان ماندوو و داهێزراو بووم، یوهان لە ئوتۆمبێلە گەرمەکەی خۆیدا دانیشتبوو، بەشوێن ئێمەدا دەهات و لەڕێی بێ تەلەوە قسەی لەگەڵ مندا دەکرد.

رۆژێك هەستام و وتم: "یوهان"

وتی: "چییە لانس؟ چیت دەوێ؟"

وتم: "ساڵێکی دیکە لە پێشبڕکێی کلاسیکدا بەشداری دەکەم."

لەوە بەدوا، هەموو رۆژێك هەر ئەمەم دەووت و یوهان زوو تێدەگەیشت کە دوای ئەوە چیم دەوێ.

دەمووت: "یوهان"

دەیووت: "بێڵە با بزانم دەتەوێ چی بڵێی. تۆ ساڵێکی دیکە دەچێتە پێشبڕکێی کلاسیکەوە."

منیش دەمووت: "راستە."

کاتێك لەگەڵ تیمدا نەدەچووین بۆ راهێنان، خۆم راهێنانم دەکرد. هەموو ئەو کارانەی دەمکردن، بەتەواوی ئامانجیان لەپشتەوە بوو. من و

کیك لەم قۆناغەی ژیاندا تەنیا بیرمان لە دوو شت دەکردەوە: تۆردۆفرانس و بوونی منداڵێکی لەشساغ. شتەکانی دیکە لە پلەی دووەمدا بوون، ئەمەش بوو بووە هۆی ئاسوودەیی ئێمە.

شێوەی مامەڵەی من لەگەڵ پێشبڕکێی تۆردا، ڕێك وەك ئەوە وابوو کە وانەی بیرکاری، فیزیا، کیمیا و وانەی خۆراك پێکەوە تێکەڵ بووبن. لێکدانەوەیەکی زۆر وردم کردبوو کە چۆن کێشی لەشم، کەرەستەکان و ئەگەر پێویست بوو تاودانی پاسکیلەکەم لە قوناغە جیاوازەکانی پێشبڕکێکەدا بەجێگیری بهێڵمەوە و بەشوێن هاوکێشەیەکەوە بووم کە من خێراتر لە وانی دیکە بگەیەنێتە هێڵی کۆتایە. زۆر بەوردی، چەند خشتەیەکم بۆ ڕاهێنانەکانی خۆم کێشابوونەوە و زۆر ورد ڕێکم خستبوون.

تەنانەت بەرنامە خۆراکییەکەشم بووبووە لێکدانەوەی بیرکاری. ڕادەوی ئەو خۆراکەم ڕادەگرت کە دەمخوارد. لە چێشتخانە کێشانەیەکی بچووکم هەبوو، بە سوود وەرگرتن لەو بڕی نان و پاستاکەم دەکێشا. پاشان ڕادەی هێز(وات)ی خۆم لەگەڵ ئەو بڕە کالۆرییەدا بەراورد دەکرد کە خواردبووم، بەم پێیە بەتەواوی دەمزانی کە دەبێ ڕۆژانە چەند خواردن بخۆم و چەند کالۆری بسووتێنم تا ئەو بڕە خۆراکەی کە دەچێتە لەشمەوە کەمتر لەو ڕاددەیە بێ کە سەرف دەکرێت. لە ئەنجامدا بەم بەرنامەیە کێشم دابەزی.

شێرپەنجە چاکەیەکی پێشبینی نەکراویشی بۆم لەگەڵدا بوو، ئەویش ئەمەی کە بەتەواوی فۆڕم و شێوەی لەشی منی تێکدابوو. لە وێنەکانی

پێش تووشبون بە نەخۆشییەکە، ملێکی ئەستوور و لە ناوقەد بۆ سەرەوەیەکی گەورە و ماسولکەییم هەبوو، ئەمەش یارمەتی ئەوەی دەدام تا لەسەر پاسکیلەکەم سەرسەخت بم. بەڵام هەر ئەم توانا جەستەنییە، لە شاخدا، رێی لە پێشکەوتنی من دەگرت، لەبەر ئەوەی هەڵگرتنی ئەم کێشە قورسە کارێکی گران بوو. لەچاو ئەو کاتەدا، لەڕ و لاواز بوو بووم و ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە بەسەر پاسکیلەکەوە هەستم بە سووکییەك دەکرد کە پێشتر هەرگیز بەخۆمەوە نەدیبوو. ئێستا لەشم لەڕتر و رۆحیشم هاوسەنگتر بووە.

گومان و دوودڵی ئەوانی دیکە سەبارەت بەوەی کە من بتوانم بەشداری لە تۆردۆفرانسدا بکەم یان نا، بوو بووە پاڵنەری من. هەمیشە دەمتوانی لە پێشبڕکێکاندا بەخێرایی سەرکەوتن بەدەست بهێنم، بەڵام پاسکیلسواری لە شاخدا خاڵی لاوازی من بوو. ئەیدی مێرکس دەمێك ساڵ بوو پێی دەووتم کێشت دابەزێنە، ئێستا تێدەگەیشتم بۆچی ئەو قسەیەی دەکرد. بۆ پاسکیلسواری لە شاخدا، کەمکردنی تەنانەت پێنج پۆندیش دەوری زۆری هەبوو، ئێستا کێشی لەشم پانزە پۆند کەمی کردبوو. ئەمە ئەو شتە بوو کە پێویستم پێی بوو، بەمجۆرە دەمتوانی لە شاخدا زۆر باش بجووڵێمەوە.

هەموو رۆژێك لەخەو هەڵدەستام و وەك رۆژانی دی نانی بەیانیم دەخوارد، کەمێك پاستا لەگەڵ نان و میوە. مەگەر ئەوەی کە راهێنانێکی زۆرم هەبایە، لەو حاڵەتەدا قاپێك سپێینەی هێلکەم لەگەڵ تەماتەدا سوور

دەکردەوە و دەمخوارد. لەکاتی خواردنی نانی بەیانیدا، کیك بتڵە ئاوەکەی بۆ پڕ دەکردم و من ڕێك کاتژمێر هەشتی بەیانی لەگەڵ کوین و تایلەر لە ماڵ دەچوومەدەر. زۆر جار لەسەر یەك و بێ هەدادان تا کاتی نانی نیوەڕۆ و نزیکەی کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆ، ڕاهێنانمان دەکرد. پاش نانی نیوەڕۆ و کەمێك پشوودان، بڕێك پاستام دەکێشا و لەگەڵ کیك نانی ئێوارەم دەخوارد.

جیا لەوەی وتم، نە کارێکی دیکەم دەکرد و نە بۆ شوێنێکی دیکەش دەچووم. تەنیا نانی ئێوارەم دەخوارد و ڕاستەو ڕاست دەچووم دەخەوتم، بۆ ئەوەی بتوانم بەیانی زوو لەخەو هەستم و بچم بۆ ڕاهێنان. تا چەند مانگ ژیانی ئێمە بەم شێوەیە بوو. هەندێك جار هاوڕێکانی کیك دەیانووت: "ئای، ئێوە لە باشووری فەڕەنسا دەژین، چەند خۆشە!" ئەوان هیچ تەسەوورێکیان لە ژیانی ئێمە نەبوو.

کاتێك کە من ڕاهێنانم دەکرد، کیك یان بەپێی ڕێنماییەکانی پزیشك ڕەفتاری دەکرد یان لە بەلکۆن پشووی دەدا. بە بۆچوونی ئەو، نایس بۆ بەسەربردنی قۆناغی دووگیانی باشترین شوێن بوو، لەبەر ئەوەی دەیتوانی بۆ کڕینی میوە و سەوزەی تازە بچێ بۆ بازار. عەسران سەبارەت بە قۆناغی دووگیانی پێکەوە کتێبمان دەخوێندەوە و قۆناغەکانی گەشەی منداڵەکەمان تاوتوێ دەکرد. ئەو لە هەوەڵەوە بەئەندازەی دەرزییەك بوو، کەمێك دواتر، بەئەندازەی لیمۆیەکی لێهات. ڕۆژی مێژوویی و لەبیرنەکراو، ئەو کاتە بوو کە منداڵەکە هێندە گەورە بوو بوو کە کیك بۆ یەکەمجار

نەیتوانی قۆپچەی پانتۆڵەکەی داخات.

بابەتی منداڵەکە و تەندروستی ئەو بۆ ئێمە زۆر جددی و گرنگ بوو. پاسکیلسواریش کارێکی بەڕاستی دژوار بوو، کیك زۆری ڕێز بۆ دادەنا. هەموو بەیانییەك کە بۆ ڕاهێنان لە ماڵ دەچوومە دەر، دەیووت: "هیوادارم ئەمڕۆ لە کارەکەتدا سەرکەوتوو بی." ئەگەر ئێمە هەردووکمان لەگەڵ ئەم شێوە ژیانەدا کۆك نەباینایە، بێگومان هەوڵەکانمان ئەنجامی نەدەبوو. ئەگە ئەو بێزار و ماندوو بوایە، نەمدەتوانی ئەم چەند مانگە بەئاسوودەیی تێپەڕێنم. ئەو بەئەندازەی هاوتیمییەك، لەگەڵ ڕاهێنانەکانی مندا هەماهەنگ بوو.

کوین لە نزیکەوە ئەم شتەی دەبینی، لەبەر ئەوەی کە ئەو باشترین دۆست و هاوڕێی ئێمە بوو، شوقەیەکی لە نایس هەبوو. ئەو بە پێچەوانەی من، هیچ کەسی لە ئەورووپا نەبوو تا لە ماوەی چاوەڕێی بکات. دوای ڕاهێنانەکان، دەچوەوە شوقە بەتاڵەکەی خۆی کە هەندێك جار تەنانەت پەرداخێك شیری باشیشی لێنەبوو! بەلاَم من جلوبەرگی خاوێن، ماڵی ڕێکوپێك، پشیلە، سەگ و ئەوەی بۆ خواردن پێویست بوو، لەبەردەستم بوو. بەلاَم بۆ کیك زۆر قورس بوو کە هەموو ئەم کارانە ئەنجام بدات. هەمیشە لە ئەورووپا تەنیا و نیگەران بووم تا ئەوەوی کە بوومە پیاوێکی خێزانداری خۆشبەخت و ئێستا فێر بوو بووم کە ئاشقی ئەم ژیانە بم.

هەندێك ڕۆژ لەنێو ڕێدا تایەی پاسکیلەکەم پەنچەر دەبوو، تەلەفۆنم بۆ کیکە دەکرد و ئەو بەشوێنمدا دەهات. هەندێك جاریش دوانیوەڕۆیان بە

ئوتۆمبێل دەهات بۆ شاخ تا خواردنم بۆ بێنێت. ئەو هەموو شتێك لە بارەی پاسکیلسوارییەوە فێر بوو تا بتوانێ یارمەتی من بدات. ئەو دەیزانی من کەی و چ شتێکم پێویستە، کام ڕۆژە ڕاهێنانەکان باش نەچۆتە پێش، چ کاتێك گونجاوە بۆ قسەکردن و چ کاتێك دەبێ جیم بهێڵێ تا بەتەنیا بم.

لە ڕۆژە دژوارەکانی ڕاهێناندا، ئەو هەر بەڕاستی ئازاری دەچەشت، لەبەر ئەوەی دەیزانی کە من چۆن ڕاهێنانەکانم هەڵدەسەنگێنم و گەیشتن بە ئامانج چەندە بۆ من گرنگە، بۆیە ئەگەر کارەکان بەپێی بەرنامە نەچووبایە پێش، ئەو بەباشی لە هۆکاری بێ هیوایی و گرژی من تێدەگەیشت.

کۆتاییەکانی مانگی ئەپریل، لە پێشبڕکێیەکی یەك ڕۆژەی کلاسیکی بەناوی ئامستل گۆڵدرێیس (Amstel Gold Reace)دا بەشداریم کرد تا خۆم هەڵسەنگێنم. لە سەرەتای پێشبڕکێکەوە هەستم دەکرد زۆر جیاواز و بەهێزم. زۆرترین کاتی ئەو ڕۆژەم لە تەنیشت میشل بوگێرد (Michael Boogerd)ی هۆڵەندییەوە دەڕۆشتم کە بە یەکێك لە باشترین پاسکیلسوارەکانی جیهان دادەنرا.

مەودای پێشبڕکێکە، دە میل بوو، من لە پێش هەمووانەوە دەڕۆشتم. ئێستا دەمزانی یان لانیکەم وام بیر دەکردەوە، دەزانم کە لە سووڕی کۆتاییدا ئەو دەبەزێنم و ئەوەندە لەم بابەتە دڵنیا بووم کە گرەوم لەسەر لەشساغییەکەم کرد.

دوایین سوڕ دەستی پێکرد و تیروپشکەکە بەناوی ئەوەوە دەرچوو. تا سوڕی کۆتایی پێکەوە بووین، بەڵام لە چەند سەد یاردی کۆتاییدا، لێك دوور کەوتینەوە و من بە دوورییەکی زۆر کەم، کەمتر لە تایەیەك دۆڕاندم.

زۆر تێکچووم، من دڵنیا بووم کە براوە دەبم، بەڵام ئەوەی کە وایکرد بدۆڕێم، ئەمە بوو کە بوگێرد بە یەکێك لەوانە دادەندرا کە شانسی بردنەوەی تۆردۆفرانسی هەبوو. کاتێك لەسەر سەکۆ و لە تەنیشت یەکتر وەستاین، تەنیا بیرم لە بەرنامەکانم بۆ تۆردۆفرانس دەکردەوە. لەپڕ چەمامەوە و بە میشێلم وت: "لە مانگی جولای، پاکانە حسێب دەکەین."

ئەو بەسەرسوڕمانێکەوە سەیری من کرد و وتی: "باسی چی دەکەی، ئێستا مانگی ئەپریلە!"

گەڕامەوە بۆ ڕاهێنانەکانم. پایدەرم لێدا، پایدەرم لێدا و پایدەرم لێدا، بەجۆرێك کە پێشتر هەرگیز بەو شێوەیە ڕاهێنانم نەکردبوو، دەمویست خۆم تەمێ بکەم. لە چواردەوری نایس، نزیکەی پەنجا هەورازی قورس و تاڕادەیەك لەباری بۆ ڕاهێنان لێبوو کە مەوداکەی دە میل یان زیاتر دەبوو. ئەو فێڵەی کە دەمکرد ئەمە بوو کە لە هەر کامیان یەك جار هەڵنەدەگەڕام، بەڵکو بە یەکێکیاندا چەندین جار هەڵدەگەڕام. هەموو ڕۆژێك لە ڕاهێنانێکی شەش بۆ حەوت کاتژمێریدا، سێ هەورازی جیاوازم تاقی دەکردەوە. هەورازێکی دوانزە میلی، نزیکەی یەك کاتژمێری دەبرد. ئەمە کورتەیەك بوو لە ڕۆژانی ڕاهێنانی من.

کاتێك کە هیچکام لە هاوتیمییەکانم، ڕاهێنانیان نەدەکرد، من خەریکی

راهێنان بووم. ڕۆژی سێی مانگی مەی، ڕۆژێکی بەهاریی تایبەت بوو کە زۆر سارد بوو. ئەو ڕۆژە لە یوهان، چووین بۆ زنجیرە کێوەکانی ئالپ. لەوێ بەفرو و کڕێوەیەکی سەیر بوو، پلەی گەرمی هەوا سی و دوو پلە ژێر سفر بوو، بەڵام من بەلامەوە گرنگ نەبوو. لە قەراغ جادە وەستام، کەش و هەواکەم هەڵسەنگاند و سەیرێکی دیمەنی پێشەوەم کرد، یوهان وتی واز لەم کارە بێنم. وتم: "نا، ڕێم بدە با ئەم کارە بکەم." حەوت کاتژمێری بەردەوام پایدەرم لێدا. بۆ ئەوەی لە تۆردۆفڕانس براوە بم، دەبوو لە بارودۆخێکدا راهێنان بکەم کە هیچ کەس ئامادە نەبوو راهێنانی تێدا بکات.

ترسناکترین ڕێگا بۆ پاسکیلسواری لە نایس (کە تەمێیەکی لەبار بوو) کول دێلا مادون (Col de Madone) یان مەدۆنا بوو کە هەورازێکی بەناوبانگ و زۆر قورسی هەشت میلی بوو. ئەم ڕێگایە بەسەر تەپۆڵکەکان کە وادەهاتنە پێش چاو سەریان لە ئاسمان دەسوو، لە شوقەکەی ئێمەوە دەبیندرا و بۆ راهێنانی هەموو ڕۆژێك زۆر قورس بوو، بەڵام بۆ تاقیکردنەوەی توانای جەستەیی زۆر باش بوو. زۆربەی پاسکیلسوارە پیشەییەکان لە ماوەی وەرزێکدا، یەك یان دوو جار زیاتر ئەم راهێنانە ناکەن، بەڵام من مانگی جارێك ئەم کارەم دەکرد.

تۆنی ڕۆمینگەر (Tony Rominger) کە یەکێك لە باشترین پاسکیلسوارەکانی دنیایە، ئەو کاتەی لە مۆناکۆ دەژیا، لە ڕێڕەوی مەدۆنا راهێنانی دەکرد و ریکۆردی سەرکەوتن بۆ ئەوێی، بۆ سی و یەك خولەك و

سی چرکە کەم کردەوە. کوین لوینگستۆن کە لە باشترین پاسکیلسوارەکانی شاخ و لە تیمی پۆستال بوو، جارێك توانی ئەم هەورازە بە سی و دوو خولەك ببڕێت. لە سەرەتای گەڕانەوەم، لە وەرزی وەرزشی سالّی ١٩٩٨دا، هەورازی مەدۆنام بە سی و شەش خولەك بڕی، بەلاّم دەمزانی کە بۆ ئەوەی لە تۆردۆفرانس دا براوە بم، دەبێ ئەم کاتە کەمتریش بکەمەوە.

رۆژێك کە بۆ راهێنان چووبووم، بە کوینم وت: "ئەمڕۆ دەمەوێ ئەم هەوارزە رێیە لە سێ و یەك خولەکدا ببڕم."

ئەم ئیدیعایە بۆ کەسێك کە تا ئەو کاتە نەیتوانیبوو کاتی سەرکەوتنەکە تەنانەت بگەیەنێتە سی و پێنج خولەك، قسەیەکی قەبە بوو.

کوین وتی: "تۆ شێتی"

بەلاّم بە راهێنان توانیم ماوەی سەرکەوتنەکە بۆ سیو چوار خولەك و پاشان بۆ سیو سێ خولەك کەم بکەمەوە. رۆژێك دوانیوەڕۆکەی کە کاتی سەرکەوتنەکەم هەلّدەسەنگاند، گەیشتبووە سێو دوو خولەك و سی چرکە. پێش پێشبڕکێی توردۆفرانس، من و کوین جارێکی دیکەش لە رێڕەوی مەدۆنا راهێنانمان کرد.

ئەو رۆژە، رۆژێکی شێدار و سارد بوو، کەمیکیش بای دەهات. ئێمە تا لوتکە –کە لەنێو تەمەندا ون بوو بوو، سێ هەزار پێش لە ئاستی دەریاوە بەرز بوو– پێشبڕکێمان کرد. کیلۆمەترێکی مابوو بۆ لوتکە کە پاسکیلەکەی کوین پەنچەر بوو. کاتێك ئەو وەستا تا تایەکەی بگۆڕێ، من

لە ڕۆشتن بەردەوام بووم. کاتێك کە گەیشتمە لوتکە، سەیرێکی کاتژمێری سەر پاسکیلەکەم کرد.

چاوەڕێی کوینم کرد، ئەو لە حاڵێکدا کە هەناسە هەناسەیەکی بوو و لە پەنچەربوونی تایەکە تووڕە بوو، خۆی گەیاندە من. کاتەکەم پیشانی ئەو دا، ئەو وتی: "کوڕە نایابە، ئەمە زۆر باشە."

کیك دەیزانی ئەو ڕۆژانەی بۆ ڕاهێنان ڕوو لە مەدۆنا دەکەین، زۆر سەختی دەکێشین. کاتی خواردنی نانی بەیانی، ڕوخسارێکی جددیم هەبوو، پێش ڕاهێنان، هەوڵم دەدا تەرکیزی خۆم بپارێزم. کاتێك لە ڕاهێنان دەگەڕامەوە، کیك لەبەر دەرگا چاوەڕێم بوو، نیگەران بوو لەوەی کە ببینێ بە ڕوویەکی خۆشەوە دەگەڕێمەوە یان بە ڕوویەکی گرژ و نێوچاوانێکی تاڵەوە. ئوچ هاتبوو بۆ سەردانی کردنمان و ئەویش چاوەڕوان بوو.

بە ڕوویەکی تاڵەوە خۆم بە ژووردا کرد.

کیك پرسیاری کرد: "چۆن بوو؟"

وتم: "کەشەکە هیچ لەبار نەبوو."

ئەو وتی: "ئاخ."

وتم: "تەنیا کارێك کە کردم ئەوە بوو کە توانیم لە ماوەی سی خولەك و چل‌وحەوت چرکەدا سەرکەوم."

ئەو لە ئامێزی گرتم و ئوچ وەك ئافەریم پێوتنێك، دەستێکی بە پشتمدا

کێشا.

وتم: "جیمی، من ئامادەم."

چەند ڕۆژ دواتر، ئوچ گەڕایەوە بۆ ئەمریکا و بە هەمووانی وتبوو کە من پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس، دەبەمەوە.

بە واسواسی و بە حاڵەتێکی توڕەوە، دەستم بە کۆکردنەوەی کەلوپەلەکان کرد تا بۆ پێشبڕکێکە ئامادە بم. من و کیك، بە وردی کەلوپەلەکانمان ڕێکخست و بەشێوەیەکی تایبەت لە جانتکەدا جێمان کردنەوە. پاسکیل، پێڵاوەکان و دەستکێشەکان، هەر کامیان دەبوو لە شوێنی تایبەتدا دابندرانایە، دەبوو هەموو شتێك بەشێوەیەکی وا ڕێك دابندرێ کە بە یەك سەیرکردن تێبگەم بۆ هەموو کەش و هەوایەك، جلوبەرگی گونجاوم پێیە.

بۆ ئامادەکاری پێشبڕکێکە کە بریتی بوو لە پشکنینە پزیشکیەکان و گوێگرتنی زۆرەملێی بۆ قسەی بەرپرسان، چووم بۆ پاریس. هەر بەشداربوویەك، کتێبێکی بچووکی ڕێنمایی پێشبڕکێ ( Tour Bible)یان پێدەدا کە ڕوون کردنەوەی قۆناغەکانی پێشبڕکێکە، ڕێڕەوەکانی و شوێنەکانی نان خواردنی تێدا بوو. پاسکیلەکانمان سەریەك نا، دەسکەکانمان گۆڕی و کونترۆڵیکمان کرد تا بزانین بزماری پێڵاوەکان، ڕێك لەگەڵ پایدەرەکان جۆرن. هەندێك لە پاسکیلسوارەکان سەبارەت بە ڕێکخستنی پاسکیلەکانیان زۆر واسواس نەبوون، بەڵام من بەو شێوەیە نەبووم و کوڕەکان منیان بە "بەڕێز وردەکار" (بەڕێز میلیمەتری) بانگ

دەکرد.

لە پێشبڕکێ بەراییدا، تیمەکەی ئێمە بە تیمێکی خاریجی دادەنرا و هیچ کەس باسی ئەوەی نەدەکرد کە شانسی سەرکەوتنمان دەبێت. ئەوان باسی ئەوەیان دەکرد کە ئابراهام ئۆلانۆ (Abraham Olano)ی پاڵەوانی جیهان، شانسی سەرکەوتنی هەیە، هەروەها باسی میشل بۆگێرد -کە منی لە پێشبڕکێی ئامستیل- بەزاندبوو، هەروەها باسی ئەلکساندر زولە و فێرناندۆ سکارتین کە فەرەنسی بوون دەکرا. هەروەها باسی ئەو کەسانەیان دەکرد کە لەم پێشبڕکێیەدا بەشدار بوون.

من لە پەراوێزدا بووم، ئەمریکییەکی رزگابوو لە شێرپەنجە و هیوادار. تەنیا یەك کەس بوو کە پێیوابوو من دەتوانم براوەی پێسبڕکێکە بم. ماوەیەك پێش دەستپێکردنی پێشبڕکێکە، لە "میگویل ئیدۆراین"یان پرسیبوو، پێتوایە کێ دەبێتە پاڵەوانی تۆردۆفرانس. دەشێ قسەکانی ئەو ڕۆژەی منی لە ئەسانسۆرەکە بیرهاتبێتەوە و دەیزانی من ئامادەم.. وەڵامی دابۆوە: "ئارمێسترانگ"

قۆناغی یەکەم، پێشبڕکێیەکی بەرایی ماوە هەشت کیلۆمەتری بوو لە لی پوی دو فو (Le Puy du Fou)، شارێك بە کۆشکێکی داپۆشراو بە نوسخەی دەستنووس لەسەر پێستی مامز و پارکێکی سەدەکانی ناوین بوو. لەم رکابەرییەدا، شێوەی وەستانی تیمەکان لە پێشبڕکێ سەرەکییەکەدا دیاری دەکرا، ئەوانەی خێراتر بوون لەوانە جیا دەکرانەوە کە خاوتر لێیان دەخوڕی. هەرچەند ڕێڕەوی پێشبڕکێکە تەنیا هەشت

کیلۆمەتر بوو، بەڵام زۆر جددی و چارەنووسساز بوو، نەدەبوو هیچ هەڵەیەکی تێدا بکرێت. دەبوو بەوپەڕی خێرایی پایدەر لێبدەی، چونکە تا دەهاتی وەخۆ بکەوی، لە هەمووان دوا دەکەوتی. ئەوانەی دەیانەویست لە رکابەرە سەرەکەییەکانی پێشبڕکێکە بن، دەبوو لە ریزی سێ یان چوار کەسی یەکەمدا بن.

سەرەتای رێگاکە، مەودایەکی پێنج کیلۆمەتری بوو، پاشان دەگەیشتییە تەپۆڵکەیەکی گەورە، هەورازێکی حەوتسەد مەتری کە تەنیا بە بەکارهێنانی هەموو هێزی خۆت نەبایە، نەتدەتوانی بیبڕی. دوای ئەم هەورازە، بەشێکی خێرای دیکە لەسەر زەوییەکی تەخت هەبوو. تێپەڕاندنی رێڕەوێکی لەو چەشنە، پێویستی بە پاسکیلسوارێکی سەرسەختی وەك من هەبوو. ئیندوراینی گەورە، ئەم رێگایەی لە ماوەی هەشت خولەك و دوانزە چرکەدا بڕیبوو، کاری ئەو هەر بەڕاستی بێ کەموکوڕی بوو.

لە هەموو حاڵەتێکدا، دەبوو ئەم رێڕەوە لە کەمتر لە هەشت خولەکدا کۆتایی بێ و گرنگترین بەشیشی، سەرکەوتن بە تەپۆڵکەکەدا بوو. نەدەبوو هەموو هێزم لە پێنج کیلۆمەتری یەکەمدا بەکار بهێنم، تا دوای بۆ سەرکەوتن بە هەورازەکەدا، کەم نەهێنین. جیا لەوە دەبوو بڕیارێکی ستراتیژیمان بدابایە: ئایا دەبوو لە هەڵگەڕان بە تەپۆڵکەکدا، بەشێوەی خێرا سەرکەوتبایین یان نا؟ دوو رۆژ لەبارەی ئەم بابەتەوە مشتومڕمان بوو.

یوهان زۆر بە هێمنی، ستراتیژی تیمەکەی روون دەکردەوە، ئەو پێشبڕکێکەی بە دوو بەشی خێرایی و توانایی دابەش کرد و هەندێك ڕێکاری وردی بە من دا. ئەو تەنانەت دەیزانی کە لێدانەکانی دڵی من لە قۆناغی یەکەمدا، سەد و نەوەد دەبێت.

بەشداربووان پێشبڕکێکەیان دەست پێکرد و هەر کام بە نێوانی سێ خولەك لە یەکتر بەڕێکەوتن. ڕووداوەکانی ڕێگای پێشبڕکێکەیان بە ئێمە رادەگەیان. هاوتیمی من، فرانکی ئاندرۆ لەکاتی سەرکەوتنندا تووشی چەند هەڵەیەکی تەکنیکی بوو. کاتێك گەیشتە سەر تەپۆڵکەکە، چیتر هێزی تێدا نەمابوو، بۆیە درێژەی بە پێشبڕکێکە نەدا. ئولانۆ ڕێڕەوەکەی بە هەشت خولەك و یازدە چرکە بڕی و ریکۆردی پێشووی شکاند و زۆلە بە هەشت خولەك و حەوت چرکە، ریکۆردەکەی ئەوی شکاند.

ئێستا نۆبەی من بوو. کاتێك کە باش پایدەرم لێدەدا، وەك ئەوە وابوو کە بەبێ جووڵە لەسەر پاسکیلەکە دانیشتبێتم، هەڵبەت جیا لە قاچەکانم کە وەك دوو پیستوونی ئوتۆماتیکی کاریان دەکرد. یوهان لە نێو ئوتۆمبێلەکەوە دەیبینی کە شانەکانم بچووکترین جووڵە ناکەن. ئەمە نیشانەی ئەوە بوو کە من وزەم بەفیڕۆ نادەم و هەموو وزەی خۆم بۆ پاسکیلەکە و لەوێوە بۆ جادەکە دەگوازمەوە.

لەکاتی پایدەر لێداندا، یوهان کات و ڕێکارە پێویستەکانی بە من دەوت.

یوهان وتی: "لەسەر کورسییەکە هەستاوی، دانیشە."

من هێندە سەرنجم لەسەر خێرا پایدەر لێدان بوو، هەستم بەم شتە نەکردبوو. لەسەر کورسییەکە دانیشتم و هەموو هۆش و زینم لەسەر تەکنیکەکەم چڕ کردەوە، نەمدەزانی تێکڕای کاتەکەم چەند دەبێت. تەنیا پایدەرم لێدەدا.

لە مێڵی کۆتایی پەڕیمەوە و سەیری کاتژمێرەکەم کرد.

"هەشت خولەك و دوو چرکە"ی پیشان دەدا.

لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە، نابێ ئەمە راست بێت.

دیسان سەیرم کردەوە، رێك هەشت خولەك و دوو چرکە بوو.

من بوو بوومە پێشەنگی تۆردۆفرانس و بۆ یەکەم جار لە ژیانی پیشەییمدا، بلوزی زەردی کاپتنم لەبەر دەکرد تا لە بەشداربووانی دیکە جیا بکرێمەوە.

لە کەمپدا، هەموو هاوتیمەکانم لە ئامێزیان گرتم و پیرۆزباییان لێکردم. یوهان لە هەمووان زیاتر ستایشی منی کرد. هەواڵنێری کەناڵی ئەی.ئێس.پی.ئێن (ESPN) هات بۆ وتووێژ، بەڵام من نەمدەتوانی قسە بکەم. دەمم وشك بوو بوو، هەناسەم وەستابوو، هەر هیچ نەمدەتوانی قسە بکەم. بە دەنگێکی نووساوەوە وتم: "من شۆك بووم."

لەنێو خەڵکەکەدا، "ئیندۆراین"م بینی، رێی خۆی کردەوە و بەرەو لای من هات، بە میهرەبانییەوە تەوقەی لەگەڵ کردم و لە ئامێزی گرتم.

هیچ مەجالی ئەوە نەبوو سەرکەوتن لەم قۆناغەدا بکەمە جەژن و

خۆشی. سەرەتا پشکنینی ماددەی وزەبەخش (دوپینگ) کرا و پاشان ڕێوڕەسمەکە کۆتاییهات. منیان برد بۆ کەمپ تا ئاوێك بەخۆمدا بکەم و بۆ وەرگرتنی بلوزی زەرد، لەسەر سەکۆی پلەی یەکەمدا بوەستم. هەر چەند خۆم بۆ سات بە ساتی پێشبڕکێکە ئامادە کردبوو، بەڵام هیچ بیرم لەم ساتە نەکردبۆوە، واتە ساتی لەبەرکردنی بلوزی زەردی کاپتنی.

لە نایس، کیك لە پێش تەلەفزیۆن دانیشتبوو، سەیری منی دەکرد کە بە بلوزی زەردەوە لەسەر سکۆکە وەستاوم. ئەو لە خۆشیان هاواری کردبوو، هەڵبەز و دابەزی کردبوو، ئەمەش بوو بووە هۆی ئەوەی کە منداڵەکە بجوڵێ و سەگەکەش بوەڕێێت. دواجا لەسەر سەکۆکە هاتمەخوار و چووم بۆ کەمپ، پەیوەندیم بە "کیك"ەوە کرد، وتم: "خۆشەویستم!"

تەنیا شتێك کە لە پشت تەلەفۆنەکەوە دەمبیست، ئەمە بوو: "خوایە گیان، خوایە گیان، خوایە گیان..." پاشان دایە قوڵپی گریان و وتی: "خۆشەویستم، دواجار توانیت و سەرکەویت."

دووەم ساتی شیرین و خۆشی من، ئەو کاتە بوو کە خەریکبوو لە هێڵی کۆتایی نزیك دەبوومەوە و بە تەنیشت تیمی "کوفیدیس"دا تێپەڕ دەبووم. ئەندامانی یانەکە لەوێ وەستابوون، ئەوانەی لە نەخۆشخانە، پشتیان تێکردم و ڕۆشتن.

وتم: "ئەمەش بۆ ئێوە" و لێیان تێپەڕیم.

ڕێڕەوی پێشبڕکێکە لە دەشتەکانی باکووری فەڕەنساوە دەستی پێدەکرد.

من یەکەم ئەمریکی بووم کە بۆ تیمیکی ئەمریکی و بە سەر پاسکیلێکی ئەمریکییەوە، دەبووە پێشەنگی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس. بەیانی ئەو ڕۆژە سەیری ڕۆژمێرم کرد، چواری جولای بوو.

لەپڕ تووڕە بووم، لەبەرکردنی بلوزی زەرد، بەرپرسیارێتی دەخستە ئەستۆم. ئێستا لەباتی هێرشبەر، بوو بوومە بەرگریکار، پێشتر هەرگیز لە پێگەی بەرگریکردن لەم بلوزە نەبووم. یەکەم قۆناغی پاڵەوانێتییەکە، پێشبڕکێی خێرایی بوو لە زەوییە تەختەکاندا. قۆناغی یەکەم لە دەشتە ڕێك و تەختەکاندا دەستی پێکرد. هەمووان تووڕە بوون و ڕووداو گەلی وەك بەریەککەوتنی دەسکی پاسکیلەکان، پێکدادانی تایەکان و بەریەککەوتنە ئاساییەکانی دیکە لەم قۆناغەدا ڕوویدا.

ژمارەی ڕکابەرەکان لە پێشەوەی گرووپەکان زۆر نەبوون، ئێمە و تیمەکانی دیکە ماندوو بوو بووین و جادەکەش زۆر پان بوو. لەبەر ئەوەی کە دوو سەد پاسکیلسوار پایدەریان لێدەدا کە هەر کام هەوڵی ئەوەی دەدا شوێنی کەسی پێش خۆی بگرێتەوە، ڕووداو گەلی لەم چەشنە هەر ڕووی دەدا. چەند ڕۆژی هەوەڵ ستراتیژی ئێمە ئەوە بوو کە خۆمان زۆر تووشی ژانە سەر نەکەین، هەڵبەت وتنی ئەم قسەیە ئاسانترە تا جێبەجێ کردنی، لەبەر ئەوەی بمانەوێ و نەمانەوێ، ئەم شتانە ڕوو دەدەن. ساڵی پێشوو، کوین لەم قۆناغەدا دوو جار تووشی پێکدادان بوو بوو، بۆیە پێش گەیشتن بە قۆناغی شاخاوی، پانزە خولەك دوا کەوتبوو.

تیمەکەی ئێمە، لە لایەن دوو ئوتۆمبێل و سەیارەکەی بارهەڵگرەوە

هاوڕێیەتی دەکرا. یوهان و باقی ئەندامانی دەستەی راهێنەران لە یەکێك لە ئوتۆمبێلەکاندا بوون و چەمچەکەشی، پاسکیلە یەدەگەکانی لەسەر بوو. لە ئوتۆمبێلەکەی دیکەشدا، بەڕێوبەرانی تیمەکە و ئەو سپۆنسەرانەی تێدا بوو کە حەزیان دەکرد هاوڕێیەتی تێمەکە بکەن. سەیارە بارهەڵگەرەکەش پاسکیل و کۆڵەپشتییەکانمان و کەلوپەلەکانی دیکەمانی پێبوو. ئەگەر تایەی یەکێك لە ئەندامانی تیمەکە پەنچەر بووبایە، فیتەری تیمەکە کە لەگەڵمان بوو، چاکی دەکردەوە و ئەگەر پێویست بە ئاو و خۆراك بووایە، بە ئەندمانی تیمەکە رادەگەیشتن.

یوهان لە نێو ئوتۆمبێلەکەوە، پێشبڕکێکەی لە رووی تاکتیکییەوە رێنمای دەکرد. ئەو بەردەوام چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد، کات و بارودۆخی پێشبڕکێکەی رادەگەیاند و لەڕێی بێتەلەوە لەگەڵ ئێمە لە پەیوەندیدا بوو. هەر کام لە ئەندامانی تیمەکە هێدفۆنێك و گەیەنەرێکی رادیۆیی پێبوو کە بەدەروی بەخەیانەوەبوو، ئەو گەیەنەرەش بە وایەرێك پەیوەست بوو بە کونترۆڵکەری لێدانەکانی دڵەوە کە یوهان لەڕێی ئەوەوە دۆخی جەستەیی ئێمەی لەکاتی سترێسدا کونترۆڵ دەکرد.

هاوتیمییەکانی من هەمیشە لە پێش منەوە دەڕۆشتن و منیان لە بەرامبەر با، پێکدادانە گریمانکراوەکان یان مەترسییەکانی دیکەدا دەپاراست. سەرەڕای ئەمە، بەردەوام خەریکی خۆدزینەوە لە دەستی تەماشاکەرە تاسەمەند و وێنەگر و هەواڵنێرەکان بووین.

قۆناغی دووەمی پێشبڕکێکە، رێڕەوێکی چوار کیلۆمەتری بوو بەناوی

پسیج دو گویس (Passage du Gois) که دیمەنی ئەو ڕێگایە جۆرە سەمەرەیەکی سورئالیستی هەبوو. جادەیەکی دوورودرێژ و باریك که بەنێو زۆنگاوێکدا تێدەپەڕی و بەشەکانی سەرەوەی ڕەشی دەکردەوە. ئاوی سوێری لافاو لەکاتی هەڵکشاندا، وای لە جادەکە کردبوو بەکەڵکی ڕۆشتن نەدەهات و تەنانەت لەو شوێنانەدا که شیاوی پێدا ڕۆشتن بوو، رووی جادەکە ساف و لووس بوو، لێوارەکەشی بە گوێچکە ماسی و قەوزەی دەریایی داپۆشرابوو.

پاسکیلسوارەکان هێشتا هەر بەشێوەی کۆمەڵ دەڕۆشتن و بەریەککەوتنەکان درێژەی هەبوو. یەکەم تیمەکان کە لە ڕێڕەوەکەوە دەڕۆشتن، ئەمن و ئاسایشی زۆرتریان هەبوو، بۆیە زۆربەی ئەندامانی تیمی پۆستاڵ، لە دەوری من کۆبوونەوە و ئێمە تاڕادەیەك لە پێشەوە دەڕۆشتین. لە ڕێگادا، چەند هاوتیمی لێمان جیا بوونەوە و کەوتنە گرووپی دووەمەوە. فرانکی و جۆرج، بێ هیچ ڕووداوێك منیان لە ڕێڕەوەکە دەرباز کرد، بەڵام زۆر ترسناك بوو، جادەکە بەڕادەیەك خلیسك بوو کە ئێمە وریای ئەوە بووین تایەکان نەخزێن و هەروەها بەرەنگاری بای پێچەوانەش دەبووینەوە. زۆر قورس بوو نەهێڵێن پاسکیلەکان لەڕێ لادەن و ڕێك و ڕاست بڕۆن. بەڵام ئەو پاسکیلسوارانەی لە پشت ئێمەوە دەهاتن، شانسی وەك ئێمەیان نەبوو، ژمارەیەکی زۆر لەوان نەیاندەتوانی بەردەوام بن.

یەکێکیان ستۆپی گرتبوو، بۆیە بوو بووە هۆی تێکدانی هاوسەنگی

ئەوانی دیکە. تایەی ئەو پاسکیلانەی کەتبوون، شێتانە دەخولانەوە و پاسکیلسوارەکانیش، بە پشتدا کەوتبوونە سەر زەوی. لەم قۆناغەدا، جاناتان واترێومان لەدەست دا، لەبەر ئەوەی کە سەر و چەناگە زۆر خراپ زیانی بەرکەوتبوو. ئەو ڕۆژی پێشوش بەسەرەوە لە پاسکلیلەکەی کەوتەخوار، بەڵام لەبەر ئەوەی کە توانیبووی خۆی کونترۆڵ بکات و لەسەر قاچەکانی بوەستێتەوە، تووشی مەترسی نەبوو بوو. ئەوانی دیکە لەبەر ئەم کارە، نازناوی "ئەلگاتۆ" (El Gato) واتە پشیلەیان بەو دا، بەڵام لە قۆناغی دووەمدا ئەو بەتەواوی لە ڕیز چووە دەر. تایلەر همیلتۆنیش لە پێکدادانێکدا ئەژنۆی زیانی پێگەیشتبوو.

ئەم قۆناغە، لە ساتە قەیراناوییەکانی پێشبڕکێکە بوو. ڕۆشتن لەپێش گرووپەوە هەلێکی باش بوو، چونکە تەنانەت ژمارەیەك لەوانەی کە شانسی بردنەوەیان لە پێشبڕکیدا هەبوو، بەهۆی ئەوەی لە دواوە دەڕۆشتن نەیانتوانی ئەم قۆناغە ببڕن. میشێل بۆگێرد و ئەلێکس زولە، زیاتر لە شەش خولەك کەوتنە دوای منەوە و لە ڕۆژانی دواتریشدا ئەم کاتە، تا دەهات زیاتر دەبوو.

لە دە ڕۆژی هەوەڵدا، ئێمە تەنیا یەك ئامانجمان هەبوو، ئەویش لەپێشەوە ڕۆشتن و بەدوور بوون لەو زیانانەی کە ئەگەری هەبوو تووشی پاسکیلسوارەکان ببێت. من دەمەویست جۆرە هاوسەنگییەك پێکبهێنم، واتە هەم ڕکابەری بکەم و هەم تواناکانی خۆم بۆ قۆناغی هەستیاری پێشبڕکێکە لە مێتس (کە لەو کاتەدا بایەخی هەبوو) بپارێزم. بۆیە

بەشێوەی کاتی بیرم لە بلوزی زەرد نەکردەوە.

ئەم ڕۆژانە لە درێژترین ڕۆژەکانی پێشبڕکێکە بوون. جادەکان و دیمەنەکان وەك یەك بوون. لە "نانتس"ەوە بۆ لاوال و لەوێوە بۆ ئامینس چووین. بەڵام وەك ئەوە وابوو کە ڕێگایەکی بێ کۆتاییمان لەپێشە. ماریۆ سیپۆلینی ئیتالی، چوار قۆناغی یەك لە دوای یەك براوە بوو، ئەمەش خۆی ریکۆردێك بوو. بەڵام ئێمە بەبێ هیچ ململانێیەك، هەر چوار قۆناغەکەمان دا بەوان. سیپۆلینی، پاسکیلسوارێکی گەورە بوو، بەڵام لە سەرکەوتن بە شاخدا شارەزاییەکی ئەوتۆی نەبوو، بۆیە هەموومان دەمانزانی کە ئەو ناتوانێ لە سەرکەوتنی کۆتاییدا لە رکابەرە جدییەکان بێت.

هەموو شەوێکمان بە یەکجۆر بەڕێ دەکرد، پەیاممان بۆ ئەندامە پێکراوەکان دەنارد، نانی ئێوارەمان دەخوارد و بەرنامەکانی شەش قەناتی تەلەفزیۆنی فەڕەنسامان سەیر دەکرد کە لە هوتێلەکەدا دەمانتوانی وەریبگرین.

یوهان ڕێی نەدا من کۆمپیوتەرەکەم لەگەڵ خۆم ببەم، چونکە لەو حاڵەتەدا، تا درەنگ وەخت بەخەبەر دەبووم.

ڕۆژی دواتر، بەخێرایی بەرەو مێتس ڕۆشتین.

من لە دواوە دەڕۆشتم و پارێزگاریم لە وزەی خۆم دەکرد.

تۆردۆفرانس، پێشبڕکێیەکی راستەقینەیە. لەڕاستیدا، هەر قۆناغێکی ئەو پێشبڕکێیە، فیلتەرێکە کە بەهێزەکان لەوانی دیکە جیا دەبنەوە.

دواجار گەیشتینە مێتس. لەم قۆناغەدا بەشدار بووان ئەو هەڵەیان هەبوو کە کاتێکی زۆر بەدەست بهێنن یان لەدەستی بدەن. درێژی ڕێگاکە پەنجا و شەش کیلۆمەتر بوو، ئەمە بە واتای یەك کاتژمێری بێ پسانەوە پایەدەر لێدان بوو کە دەبوو لە کەمترین ماوەی لواودا ئەنجام بدرێ، چونکە ئەمە قۆناغی پاڵاوتن بوو.

ئێستا "کیك"یش لە نایسەوە هاتبوو. دوو هەفتەی یەکەمی پێشبڕکێکەی لە تەلەفزیۆنەوە سەیر کردبوو، بەڵام دوای ئەوە لەگەڵ دایك و باوکی بۆ گەشت چووبوو بۆ ئەورووپا تا ماندوێتی و فشار لەسەر لەشی کەم بکاتەوە. لەو ماوەیەدا لەگەڵ من لە پەیوەندیدا بوو، ئەنجامەکانی کونترۆڵ دەکرد. کیك نەیدەتوانی سەردانم بکات، لەبەر ئەوەی کە بواری ئەوەم نەبوو تا بیبینم، هەرچەند لەو بارودۆخەدا بینینی ئەو باشتر لە هەر شتێکی دیکە بوو، حەزیشم دەکرد ئاگاداری بارودۆخی ئەو بم. سەرەڕای ئەوە، بوونی ئەو لە مێتس، ئەو ڕاهێنانانە بیر دەهێنامەوە کە بۆ بەشداری کردنی ئەم پێشبڕکییەدا دەمکردن.

بەیانی ڕۆژی پێشبڕکێکە، چوومە دەر و سەیرێکی ڕێگاکەم کرد. لەبەر ئەوەی پێشتر و لەکاتی ڕاهێناندا پێیدا ڕۆشتبووم، شارەزای بووم. ڕێگای پێشبڕکێکە، دوو هەورازی زۆر گەورەی هەبوو، بەرزی یەکێکیان یەك کیلۆمەتر و نیو و ئەوی دیکەشیان چوار کیلۆمەتر بوو. لە بەشی یەکەمیاندا بای دەهات، دوای ئەوە تەپۆڵکەکان بوون و لە بەشی کۆتاییدا دیسان بای دەهات.

لەو کاتەدا کە خۆم گەرم دەکرد، ئەنجامەکان دەرکەوتن و بەشداربووان یەك لە دوای یەك و بە نێوانی دوو خولەك پێشبڕکێکەیان دەست پێکرد. ئالێکس زولە، پاسکیلسواری سویسرایی کە لە پسیج دو گویس زیانی پێگەیشتبوو، بە کاتی کەمتر لە یەك کاتژمێر و نۆ خولەك پێشەنگ بوو. ئەم شتە بەلای منەوە سەیر نەبوو، لەبەر ئەوەی کە ئەو بەهێز و خاوەن خۆراگرییەکی باش بوو.

یەکێکی دیکە لە کەسە دیارەکانی پێشبڕکێکە، واتە ئابراهام ئولانۆ رێك لە پێش منەوە بوو. بەڵام کاتێك لە خاڵی دەستپێکی پێشبڕکێکە چاوەڕوان بووم کە رێکەوم، هەواڵیان هێنا کە ئەو لە لۆفەیەکی بچووکدا سووڕاوە و سێ چرکەی لەدەست داوە. ئەو دیسان درێژەی بە کارەکەی خۆی دا، بەلام چیتر هاوسەنگی پێویستی نەبوو.

سەرەی من بوو، بەتواناوە وەڕێ کەوتم. یوهان ئاماژە پێویستەکانی بە گوێمدا دایەوە. ئەو لە دوو خاڵی رێگاکەدا ئاگاداری کردمەوە کە تا ئێستا خێراترین بووم.

لە خاڵی سێیەم لە رێگاکەدا ئاگاداری کردمەوە کە ئێستا یەك خولەك و چل چرکە لە زولە لەپێشترم.

لە پێش خۆمەوە ئولانۆم دەبینی.

ئولانۆ تا ئێستا لە پێشبرشکێیەکی کاتراگر(تایم تریل)ی وەك ئەم پێشبڕکێیە، گیری نەخواردبوو. ئەو لەسەر شانەکانییەوە منی دەبینی کە بە هەموو هێزەوە پایدەر لێدەدەم.

لێی نزیك بوومەوە، کاتێك کە سەیرم کرد، ڕواڵەتێکی سەیری هەبوو، بۆیە ترسام. خۆم پێگەیاند و تێمپەڕاند. ئەو لە پشت سەرمەوە دیار نەمابوو.

یوهان قسەی لەگەڵ کردم و ئاگاداری کردمەوە کە خێراییەکەم لەڕادەبەدەرە. بۆیە کەمێك خێرایی پایدەر لێدانەکەم کەم کردەوە.

گەیشتمە لێژایی ڕێگاکە. لە قەراغ جادەکە، گوێنی گیای وشکیان دانابوو. ئێستا پاسکیاسوارێکی دیکەم لە پێش خۆمەوە دەبینی. ئەو لە قەراغ جادەکەوە درێژ بوو بوو. زیانی پێگەیشتبوو، چاوەڕوانی گەیشتنی یارمەتییە پزیشکییەکان بوو. ڕەنگی بلوزی تیمی کافیدیسم ناسییەوە، ئەو بابی جولیچی ئەندامی تیمی کافیدیس بوو. کونتڕۆڵی خۆی لەدەستدابوو، خزابوو. دوایی زانیم کە سنگ و پەراسووەکانی خراپ ئازاریان پێگەیشتبوو، بۆیە هەر لەوێ لە پێشبڕکێکە کشابوەوە.

گەیشتمە پێچێك.

لەناکاو لەنێو خەڵکەکەوە، منداڵێك دەرپەڕی.

پاسکیلەکەم سووڕاند تا لەو نەدەم. دڵم زۆر بە توندی لێیدەدا.

خێرا ئارامی خۆمم بەدەستهێنایەوە و درێژەم بەکارەکەم دا. دووبارە لە پێش خۆمەوە پاسکیلسوارێکی دیکەم بینی، لە دوورەوە نەمدەزانی کێیە، تەنیا گلۆپە سەوزە ئیشارەت دەرەکەم دەبینی. بلوزەکەی تام ستێلزی بەلجیکیم ناسییەوە، ئەو یەکێك لە پاڵەوانە باشەکانی خێرایی

بوو. لە دوو قۆناغی خێرایی پێشوو براوە بوو، یەکێك لە پاڵێوراوانی بەدەستهێنانی پلە بوو لە پێشبڕکێکەدا.

بەڵام ستێلز، شەش خولەك زووتر لە من پێشبڕکێکەی دەست پێکردبوو، بیرم کردەوە: واتە ئەوەندە خێرا پایدەرم لێداوە؟

یوهان کە بەردەوام هێمن و لەسەرخۆ بوو، کونترۆڵی کاتی کرد و لە بێتەلەکەدا دەستیکرد بە هاوار کردن: "لانس، تۆ نایابی، تۆ بێ وێنەی."

"ستێلز"یشم تێپەڕاند.

دەردانی ترشی لاکتیکم لە قاچەکانمدا هەست پێکرد و ئەو ئازارەی بەهۆی ئەوەوە دروست بوو بە ڕوخسارمەوە دیاربوو. هۆکارەکەی ئەوە بوو کە زۆر بەتوندی پایدەرم لێدابوو. گەیشتمە بەشی کۆتایی پێشبڕکێکە، هەستم دەکرد نارۆم. لەگەڵ هەر سووڕێکی تایەکان، لە زوو لە نزیکتر و نزیکتر دەبوومەوە. هەروا کە هەوڵم دەدا بگەمە هێڵی کۆتایی، چرکەکان بەخێرایی تێدەپەڕین.

دواجار لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە.

سەیری کاتژمێرم کرد، کاتژمێرێك و هەشت خولەك و سی و شەش چرکەی پیشان دەدا. من بردبوومەوە و زولەم بە جیاوازی پەنجاو هەشت چرکە شکست دابوو.

لەبەر زۆری ماندوێتی، دەتوانم بڵێم لە پاسکیلەکە کەوتمە خوار و چاوم هیچ شوێنێکی نەدەبینی. بەڵام واش هەر لە پێشەنگ بوون بەردەوام بووم

و هەروا کە بلوزی زەردەی کاپتنیەکەم لەسەر سەری خۆم رادەوەشاند، هەستم کرد ئەو بلوزە شیاوی منە.

لەسەر سەکۆکە هاتمە خوار و گوڵەکانم دا بە کیك، ئەوم لەئامێز گرت و ماچم کرد.

عەسری ئەو ڕۆژە بەوم وت: "پێموایە لەم پێشبڕکێیەدا براوە دەبم."

کاتێك گەڕامەوە بۆ هوتێل، لەگەڵ هاوتیمییەکانمدا شامپاینمان خواردەوە و کردمانە جەژن و خۆشییەکی تەواو. دوای ئەوە یوهان هەستا و وتی: "باشە، ئیتر بەسە، ئەمە دوایین جار بوو کە شامپاینمان خواردەوە، چونکە لە قۆناغەکانی دواتردا ئەوەندە براوە دەبین کە تا گەیشتنە پاریس، بواری خواردنەوەی شامپاینمان دەبێت."

کوڕەکان (ئەندامانی تیم) خۆشحاڵ بوون.

لە ئێستا بەدواوە، هەموو شتێك تەنانەت هێڵی کۆتاییش لە هەورازدا بوو. یەکەم قۆناغی ئالپ، ڕێگایەکی ١٣٧,٧ کیلۆمەتری بوو لە شارێکی کوێستانی بەناوی سێستریر (Sestriere) لە سنووری نێوان فەڕەنسا و ئیتالیا، دەمزانی هەموو پێیانوایە ناتوانم ئەم ڕێگایە ببڕم. ئەوان چاوەڕوانی ئەمە نەبوون کە بلوزە زەردەکە، بەردەوام لەبەر مندا بێت.

من دوو خولەك و بیست چرکە لە پێش هەمووانەوە بووم، بەڵام لە قۆناغی شاخدا، ئەگەری ئەوە هەیە کە بەدرێژایی ڕۆژ بەتەواوی دوا بکەویت. من هەرگیز هەورازبڕێکی ناودار نەبووم و ئێمە لەبەردەم یەکێك

لە قورسترین قۆناغەکانی پێشبڕکێکەدا بووین، قۆناغێك کە زۆرێك لە پاسکیلسوارەکانی بەچۆکدا دەهێنا. دڵنیابووم کە دەکەومە ژێر فشاری نەیارەکانم، بەڵام شتێك کە ئەوان لێی بێئاگا بوون، ئەمە بوو کە من بەقورسی و بەشێوەیەکی تایبەت خۆم بۆ ئەم بەشەی پێشبڕکێکە ئامادە کردبوو، ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو خۆم پیشان بدەم.

ئەم بەشەی پێشبڕکێکە، ئەوەندەی پێویستی بە توانای جەستەیی هەبوو، ئەوەندەش پێویستی بە تاکتیك هەبوو. من دەبوو لە رووی تاکتیکەوە، پشتم بە کوین لوینگستۆن و تایلەر همیلتۆن، ببەستایە. لە شاخ گرنگە کە وریای رێنمایکەرەکەت بیت. کوین و تایلەر لە هەورازەکاندا لە پێش منەوە دەڕۆشتن تا من بتوانم وزەی خۆم بۆ سەرکەوتنی کۆتایی لە سێستریر، راگرم.

چۆنێتی هێرش(خۆتاودان) لە پاسکیلسواریدا بەمجۆرەیە کە هەندێك لە پاسکیلسوارەکان، لەوانی دیکە مەترسیدارترن. "ئالێکس زولە"ی سویسری و "فێرناندو سکارتین"ی ئیسپانی، نزیکترین رکابەرکان بە منن، ئەگەر یەکێك لەوان بۆ نموونە زولە هەوڵ بدات لە ئێمە جیا ببێتەوە، یەکێك لە هاوتیمییەکانی من، بەخێرایی شوێنی دەکەوێ، چونکە کەسێکی وەك زولە دەیتوانی پێش ئەوەی کە ئێمە بزانین، رابکات و دوو خولەك لە ئێمە زووتر بگاتە سەرەوەی جادەکە و بە ئاسانی لە دواوە بوونەکەی لە من قەرەبوو بکاتەوە.

ئەرکی کوین، رۆشتن بوو بەدوای زولەدا تا سەرکەوتنەکەی لێ قورس

بکات. ئەم کارە "شوێنکەوتنی هەنگاو بە هەنگاو"ی پێدەوترێت. کاتێك کە کوین هەنگاو بە هەنگاو، شوێن زولە بکەوتبایە و خێراییەکەی کەم بکردبایەوە، هاوتیمییەکانی دیکە، منیان بەرەو سەرەوە ڕێنمایی دەکرد. ئەگەر بمانتوانیبایە بەبێ خۆ بەدەستەوەدان لە هەمبەر پەلاماری ئەوانی دیکەدا، درێژە بەکاری خۆمان بدەین، دەمانتوانی پێشبڕکێکە تەواو بکەین، ئەم کارە "بەڕێوەبردن یان کونتڕۆڵی بەکۆمەڵ"ی پێدەڵێن.

بەو جۆرەش نەبوو کە هەر کەس لە گرووپەکەی جیا بووبایەوە، شوێنی کەوین، چونکە هەموویان بە ڕکابەری جددی هەژمار نەدەکران. کەواتە وزەی خۆمان بۆ شوێنکەوتنی هەمووان بەکار نەدەهێنا. لەو حاڵەتانەدا کە پێویست بەوە نەبوو شوێن کەسێك بکەوین، ئەندامانی تیمەکە لە تەنیشت منەوە دەڕۆشتن تا لەوە دڵنیا بن کە من لە زیان و مەترسییەکان پارێزراو دەبم. ئەگەر پێویستم بە بتڵی ئاوی نوێ بووایە، یەکێك لەوان دەگەڕایەوە لای ئۆتومبێلی گرووپەکە و بتڵێك ئاوی بۆ دەهێنام.

تا گەیشتن بە سێستریر دەبوو سێ لوتکە ببڕین. یەکەم لوتکە ناوی کول دی تەلەگراف (Col du Telgeraphe) بوو، ئەوی دیکە ناوی کول دی گالیبیر (Col du Galibier) و بەرزترین لوتکە لە ڕێڕەوی پێشبڕکێکەدا ناوی کول دی مۆنتگنێفەر (Col de Montgenevre) بوو کە دوایین قۆناغ پێش گەیشتن بە سێستریر بوو.

لە سەد و پەنجا میل بەشە سادەکەی ڕێگاکە، تیمی پۆستاڵ وەك

ئامێرێك كاری دەكرد و هەر چەشنە كار و گواستنەوەیەكی خستبووە ژێر كونترۆڵی خۆیەوە.

ئیسپانییەكان هەر لە سەرەتاوە هێرشیان برد. سكارتین لە تەلگراف، وەك یاری زانەكانی تۆپی پێ، پێشكەوت، بەڵام ئێمە هێوری خۆمان پاراست و بڕیارماندا وزەی خۆمان بەفیڕۆ نەدەین. لە قۆناغی گالیبیر، كوین لوینگستۆن كارێكی جوانی ئەنجام دا و منی لە كەشێكی بەفر و بۆراندا گەیاندە لوتكە. هەروا كە لە پشت سەری كوینەوە دەڕۆشتم، ورەم بەرخۆم دەنا و دەمووت: "ئافەرین پیاو، كارەكەت زۆر باشە. ئەوان خەریكن توانای خۆیان لەدەست دەدەن."

بە ئاڕاستەی درەختە كاژەكاندا لە لوتكەی گالیبیر هاتینە خوار. بیهێننە پێش چاوی خۆتان، بەسەر دەسكی پاسكیلەكەی خۆتدا چەماویتەوە و لە حاڵێكدا كە لەسەرمان هەڵدەلەرزی، لەسەر دوو تایەی بچووك كە پانییەكەیان نیو ئینجە، بەخێرایی حەفتا میل لە كاتژمێردا دەڕۆی. ئێستا پێچ و لۆفەكان و تەمومژی ڕێگاكەش بەم وێنەیە زیاد بكە. لە لای شاخەكەوە ئاو بە ژێر تایەكانماندا دەڕۆشت. لە شوێنێك لە پشت سەری منەوە كوین كەوتبوو. ئەو ویستبووی بارانییەكەی لەبەر بكات كە قۆلەكەی لە تایەكە ئاڵابوو، بۆیە كەوتبوو. جارێكە باش بوو، بەڵام ڕەنگبوو زیانی پێگەیشتبێ و لە چەند ڕۆژی داهاتووا تای لێبێت.

گەیشتینە مۆنتژنۆ، واتە سێیەم هەوراز لە ماوەی شەش كاتژمێردا. كەشەكە ساردتر و تەمەكەش چڕتر بوو بوو. لەم لای كێوەكە باران وەك

گۆزەی سەرەولێژ کراو دەباری، بەلام لە لاکەی دیکەوە هیچ باران نەدەباری. لەسەر لوتکە هەواکەی هێندە سارد بو کە دڵۆپەکانی باران لەسەر بلوزەکەم بەستبووی. کاتێك لە شاخەکە دەهاتینە خوار، کردی بە تۆف و زریان. ئێستا من لە ئەندامانی دیکەی تیمەکەمان جیا بوو بوومەوە و خۆتاودان و هورووژمی رکابەرەکانیش بەڕێوەبوو. بەشداربووە کەم تواناترەکان نەیانتوانی درێژە بە رێگاکە بدەن. خۆم لە پێش هەموو پاسکیلسوارەکانی دنیاوە دەبینی و هەستم دەکرد تەنیام. دەمویست کارێك بکەم کە هەناسەیان بۆ نەدرێت.

تەنیا شتێك کە هاوڕێیەتی دەکردم، دەنگی یوهان بوو. ئەو لەنێو یەکێك لە ئوتۆمبێلەکاندا بوو، بەردەوام قسەی لەگەڵ دەکردم. لە هاتنە خوارەوە لە مۆنتژنۆ، ئیڤان گاتیَ و فێرناندۆ سکارتین لە پێچێکی کوڕدا، بیست و پێنج چرکە پێش من کەوتن. من لە گرووپێکی پێنج کەسیدا بەشوێن ئەوانەوە بووم.

گەیشتبووینە دوایین هەوراز، واتە هەورازی سی کیلۆمەتری سێستریر. ئێستا پێنج کاتژمێر بوو بەسەر پاسکیلەوە بووین. هەموومان بەسەختی هەوڵمان دەدا. لێرە بەدواوە، تاکە پرسیار ئەوە بوو کە کێ دەتوانێ بەردەوام بێت. هەشت کیلۆمەتری مابوو. من سی‌ودوو چرکە لەوانی پێشەوە لەدواوە بووم و لەو گرووپە پێنج کەسییەدا، گیرم خواردبوو. بە شاخەکەدا سەردەکەوتین. هەموو پاسکیلسوارە ناودارەکانی وڵاتە جۆراوجۆرەکان لەوێ بوون. باشترینیان زولەی سویسری بوو کە

پاسکیلسوارێکی بەتوانا و ماندوویینەناس بوو.

هێشتا کات مابوو.

لە.پێچێکی بچووکدا، لەسەر کورسییەکە هەستام و خێرایم زیاتر کرد. لەپڕ پاسکیلەکەم پڕتاوی گرت و گەیشتمە پشت سەری ماتۆر سوارە پاسەوانەکان. یوهان لەنێو ئۆتۆمبێلەکەوە بە سەرسوڕمانەوە وتی: "لانس، تۆ دە فوت لەوان دوور کەوتیتەوە."

ئەو لێدانەکانی دڵی منی کۆنترۆڵ کرد و تێگەیشت کە چەندە لەژێر فشاردام، چونکە لێدانەکانی دڵم گەیشتبووە سەد و هەشتا لێدان لە خولەکێکدا. بەجۆرێك دەئاژوام وەك بڵێی لەسەر زەوییەکی تەخت و رێکم.

یوهان وتی: "خەریکە نێوانی تۆ و ئەوان زیاتر دەبێت."

بەخێرایی پایدەرم لێدەدا، لە مەودای یەك کیلۆمەتردا، بیستویەك چرکەم قەرەبوو کردەوە، تەنیا یازدە چرکەی مابوو. سەیر بوو، بەڵام من هەستم بە هیچ شتێك نەدەکرد.

گاتێ و سکارتین، سەیری دوای خۆیان دەکرد. من بەخێرایی لەوان نزیك دەبوومەوە.

گەیشتمە پشت تایەکانی سکارتین. بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم. کاتێ هەوڵیدا لە من دوا نەکەوێ، بەڵام من خێراتر بووم و تەنانەت گەیشتمە سکارتین.

دەمەویست کەمێك لەوان دوور بکەمەوە و کاردانەوەی ئەوان ببینم.

بەڵام هیچ کاردانەوەیەکم لەوان نەبینی.

پێم لێ توند کرد.

یوهان زۆر ئاسان دەیووت: "بۆچی کەمێك زیاتر هەوڵ نادەیت؟"

دیسان خێراییەکەم زیاتر کرد...

ئەو وتی: "تەنیا چل فوتی ماوە."

کاتێك لە رکابەرکان دوور دەکەویتەوە بەڵام ئەوان هیچ کاردانەوەیەك پیشان نادەن، واتای ئەوەیە کە ئەوان ماندوو بوون و تۆ توانیوتە بەسەر ئەواندا سەرکەویت.

تا هێڵی کۆتایی چوار میلی مابوو، من هەروا پایدەرم لێدەدا.

یوهان سەرسوڕماوتر لە پێشوو وتی: "تۆ سی چرکە پێشکەوتی."

ئەو سات لە دوای سات منی لە پێشکەوتنەکەم ئاگادار دەکردەوە. ئەو ئاگاداری کردمەوە کە زوو هەوڵم دەدا شوێنم بکەوێ.

هەروا کە پێم لە پایدەرەکان توند دەکرد، پاسکیلەکە لەژێر پێکانمدا گوڕی دەخوارد و شانەکانم بەهۆی ماندوێتی زۆرەوە بەرز بوو بوونەوە. هەستم دەکرد خەریکە لەهۆش خۆم دەچم، بەڵام دیسان هەر هەوڵم دەدا. هێشتا رێگایەکی زۆری مابوو، من لەوە نیگەران بووم کە زوو لە پێم بگاتەوە، بەڵام هەر بەو خێراییە درێژەم بە کارەکەم دەدا.

سەیرێکی دوای خۆم کرد. تاڕادەیەك چاوەڕوانی ئەوە بووم کە ئەو لە نزیك تایەی دواوەی خۆمەوە ببینم.

بەڵام کەسی لێنەبوو.

ئایا لەو چەند یاردەی کە بۆ هێڵی کۆتایی مابوو، بیرم لە شێرپەنجە دەکردەوە؟ نا. درۆ دەکەم، ئەگەر بڵێم بەڵێ. بەڵام وابیر دەکەمەوە کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، ئەوەی لەم دوو ساڵەدا ڕووی دابوو، لەو ساتانەدا لەگەڵم بوو. دیسان هەموو ئەو ڕووداوانە هاتنەوە پێش چاوم. ململانێ لەگەڵ شێرپەنجە و باوەڕنەکردنی خەڵك لەهەمبەر گەڕانەوەم. نازانم ئەمانە دەبوونە هۆی ئەوەی کە من خێراتر پایدەر لێبدەم یان ئەوانی دیکە ماندوو بوو بوون و هێواشتر پایدەریان لێدەدا.

هەروا بەرەو سەرەوە پایدەرم لێدەدا، هەم هەستم بەئازار دەکرد و هەم هەستم بە خۆشی دەکرد. پێشبڕکێ کردن و ئازار چەشتن قورسە، بەڵام نەك بە قورسی پاڵکەوتن لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە، لە حاڵێکدا کە کاتترێك بە سنگتەوە شۆڕ بووبێتەوە، پاشان پلاتین لەنێو بۆرییەکانی خوێنتدا بسووتێ و مرۆڤ ناچار بێ پێنج ڕۆژ لە هەفتەدا، بیست و چوار کاتژمێرەکەی بەخەبەر بێت.

خەریکی سەرکەوتن لەو سەد مەترە بووم و هەوڵم دەدا هەناسە هەڵمژم. کاتێك لە هێڵی کۆتایی نزیك بوومەوە، لەگەڵ هاوڕێیانم یوهان و تۆرن وایزل قسەم کرد کە لەنێو ئوتۆمبێلەکەدا بوون.

هاوارم کرد: "من توانیم." و لە کاتێکدا کە دەستەکانم هەڵبڕیبوو

سەیری ئاسمان دەکرد، لەهێڵی کۆتایی پەڕیمەوە.

لەم ساتەدا، هاوسەرەکەم لەپێش تەلەفزیۆن دانیشتبوو، هێندە بەکوڵ گریانی هاتبوو وە هەنیسکە هەنیسك کەوتبوو. لە "ئیندیا پۆلیس"یش، لاتریس هانی و کارمەندانی سەنتەری پزیشکی و هەموو نەخۆشەکان دەستیان لە کارەکەیان هەڵدەگرن سەیری شریتی تۆمارکراوی پێشبڕکێکە دەکەن. کاتێك بە هەورازەکاندا هەڵدەگەڕام و پێش ئەوانی دی دەکەوتم، ئەوان چاویان بڕیبووە تەلەفزیۆن. لاتریس وتبووی: "ئەو توانی، ئەو سەرکەوت، ئەو سەرکەوت."

ئێستا کە براوەی ئەم سەرکەوتنە بووم، من شەش خولەك و سێ چرکە لەپێش ئەوانی دیکەوە بووم.

لەڕاستیدا لە شاخدا پاسکیلسواری دەکەی، شاخەکە نابینی، چونکە کاتی ئەو کارەت نییە، بواری ئەوەت نییە تا هەوراز و نشێوە جوانەکانی دەوروبەر، لوتکە و دۆڵەکان سەیر بکەیت. تەنیا سەرنجی ئەو جادەیە دەدەی کە لەپێشتە، ئەو پاسکیلسوارانە کە لە دواوە دێن، چونکە هیچ پێشەنگێك لە شاخدا هەست بە ئەمان ناکات و هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەوانی دیکە پێشی بدەونەوە.

ڕۆژی دوای پێشبڕکێکەی سێستێریر، بەیانی زوو لەخەو هەستام و لەگەڵ تیمەکەماندا نانی بەیانیم خوارد. هەموو هەفتەیەك، بیست و پێنج بەستە دانەوێڵە و ژمارەیەکی زۆر هێلکەمان دەخوارد. من سەرەتا کەمێك تێکەڵە (تێکەڵەیەك لە شیر، مۆز، گوێز و هەندێك دەنکی تر)م دەخوارد و

پاشان سێ یان چوار هێلکە و دوای ئەویش پاستام دەخوارد. ئەو ڕۆژەش، ڕۆژێکی قورس بوو، من پێویستم بە هەر یەکەیەکی ئەو وزەیە بوو کە هەمبوو. ئەم قۆناغە، ناوی ئالْپ دی هیوز (Alp d Huez) بوو. سەرکەوتن بە بەرزاییەکی هەزار مەتری بە لێژی نۆ پلە بەدرێژایی چواردە کیلۆمەتر کە لە تۆردۆفرانسدا ناوبانگێکی تایبەتی هەبوو. ئەم ڕێگایە بیست و پێنج لۆفەی زۆ کوڕ و زۆر قورس تێدابوو، کۆمەڵێك لۆفەی کوڕ کە تا لوتکە بەردەوام بوون و وا دەهاتە پێش چاو کە تەواوبوونی بۆ نییە. لە سەرکەوتندا هەوا گەرم و لە داگەڕاندا هەوا سارد بوو، پانی هەندێك شوێنی ڕێگاکە تەنیا بەئەندازەی سوکانی پاسکیلەکە دەبوو. ئەو کاتەی لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستدا، سەرکەوتن لە شاخ بۆ یەکەم جار بە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس زیادکرا، یەکێك لە بەشداربووان، بە پاسکیلە کۆنەکەی خۆی ڕێگا دیاریکراوەکەی بڕیبوو، پاشان ئاوڕی لە بەرپرسانی پێشبڕکێکە دابوەوە کە لە قەراغ ڕێگاکە وەستابوون و هاواری کردبوو: "ئێوە هەمووتان تاوانبارن."

من دەمەویست ڕێگای ئالْپ دی هیوز بەبێ ڕووداو تێپەڕێنم. پێویست نەبوو بەڕادەی قۆناغی سێستریر خۆم ماندوو بکەم. تەنیا ئەوەندەی هەبوو کە پێویست بوو ئاگام لە بارودۆخی ڕکابەرە سەرەکییەکانم بێت. ئابراهام ئولانۆ، شەش خولەك و سێ چرکە لە من لەدواوە بوو. ئالێکس زولە، حەوت خولەك و چل و حەوت چرکە (لە پلەی چوارەمدا بوو) و فێرناندۆ سکارتین، نۆ خولەك (بەم پێیە ئەو لە پلەی هەشتەمدا بوو). ئامانجی ئەو ڕۆژەم تەنیا پاراستنی ئەم جیاوازیانە بوو.

گەیشتمە هەوەڵی ڕێگاکە. دەمەویست کە ئەندامانی تیمەکە تێبگەن کە من لە بارودۆخێکی باشدام، چونکو وەرەبەرزی بۆ سەرکەوتن بە ڕێگا شاخاوییەکاندا زۆر گرنگە.

هەموومان هێدفۆن و بەرێکەریان (ئەو ئامێرەی قسە دەگەیەنێتە بەرامبەر) پێبوو، دەمزانی کە دەنگی من دەبیستن.

بۆیە وتم: "هۆی، یوهان."

بەشێوەی هەمیشەیی خۆی وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، لانس."

وتم: "من دەتوانم ئەم کارە بە سێ تایەیەك ئەنجام بدەم، هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە."

دەمتوانی دەنگی ئەوانی دیکەش لە کارانەوەی ئەم قسەیەدا ببیستم.

ئێمە بۆ سنووردار کردنی خۆتاودانی ئەوانی دیکە و تێپەڕاندنی ئەو ڕکابەرانەی کە دەیانتوانی ڕکابەریمان لەگەڵ بکەن، بەخێرایی پایدەرمان لێدەدا. لە هەوەڵەوە، تایلەر همیلتۆن منی لە شاخەکە بردەسەر، من لەپشت ئەوەوە دەڕۆشتم و بەدرێژایی ڕێگا قسەم لەگەڵ ئەودا دەکرد. ئولانۆم تێپەڕاند، یوهان هاتە سەر هێڵ و پێی ڕاگەیاندم کە: "ئولانۆت جێهێشت، نایابە." ئەمجا گەیشتینە مانویل بێلترن، یەکێك لە هاوتیمییەکانی زولە. بەسەر تایلەردا هاوارم کرد: "تۆ دەتەوێ ڕێبدەی بێلترن، پێشمان بداتەوە؟"

هەورازەکە دە کیلۆمەترێکی مابوو، واتە نزیکەی سی خولەك. لەپڕ

سکارتین و هاوتیمەکەی، واتە کارلۆس کانتراس خۆیان بەرەو لوتکە تاودا. دوای ئەو پاول تانکف، هاوتیمی تام ستیل، هورووژمی برد. تایلەر چیتر نەیدەتوانی بەردەوام بێ، بۆیە خۆم شوێن تانکف کەوتم. پاشان سەرە گەیشتە زولە کە بێلترن ئەوی لە سەرکەوتنەکەیدا ڕێنمایی دەکرد و هاوکات لەگەڵ ئەوان، پاسکیلسواری فەڕەنسی، واتە ریچارد ڤیرنك خۆی گەیاندە دوای من. ئەوان هەموویان هەوڵیان دەدا ئاستەنگم بۆ دروست بکەن و کارەکەم قورس بکەن.

بەڵام من ماندوونەناس بووم، هیچکام لە کارەکانی ئەو کێشەی بۆ من دروست نەدەکرد، چونکە تا ئەو کاتەی کە من لەگەڵ ئەوان بووم، نەیاندەتوانی لە ڕووی کاتەوە، نێوانی خۆیان لەگەڵ مندا کەم بکەنەوە. من لە پێگەی چوارەمدا درێژەم بە کاری خۆم دەدا و ئاگام لە هەموو شتێك بوو. چوار کیلۆمەتری مابوو بۆ لوتکە، واتە شەش خولەك و نیوی تاقەت پڕوکێن. پاشان پاسکیلسوارێکی ئیتالی، واتە جیسیپی گوئرینی، کە سێ جار پلەی سێیەمی لە پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس بەدەست هێنابوو، هورووژمی برد. بەڵام گرنگ نەبوو، لەبەر ئەوەی کە ئەو پانزە خولەك لە من لەدواوەتر بوو، هیچ پێویست بەوە نەبوو نیگەرانی ئەو بم، بۆیە ڕێمدا بڕوا. هەر لەم کاتەدا، دواجار زولە دواکەوت و نەیتوانی بەدوامدا بێت.

گوئرینی، ماوەی بیست چرکە پێش منی دابووەوە کە لە حاڵەتێکی چاوەڕواننەکراودا، خۆی کێشا بە یەکێك لە تەماشاچییەکاندا و بە قورسی

ئازاری پێگەیشت. ئێستا یەکێکی دیکە لە تەماشاچییە شێتەکان بە کامێرایەکەوە خۆی فڕێدایە ناوەندی ڕێگاکە و دەستی کرد بە وێنە گرتن. گوئرینی هاوسەنگی خۆی لەدەستدابوو، هەوڵی دا بەر ئەو تەماشاچییە نەکەوێ، بەڵام نەیتوانی. ئەم ساتە لەو ساتانە بوو کە پیشانی دەدا، هیچ پێشەنگێك لە ئەماندا نییە. گوئرینی بێئەوەی زیانی بەرکەوێ هەستایەوە و بەردەوام بوو، بەڵام تانکف بەدوای ئەوەوە بوو. بەخۆشییە، گوئرینی لە هێڵی کۆتایی پەڕیەوە و براوەی ئەم قۆناغە بوو.

من بووم بە پێنجەم و ئێستا بەگشتی، حەوت خولەك و چل و دوو چرکە لە ئولانۆ لە پێشتر بووم.

ئەو ڕۆژە یەکێك لە ڕۆژە ئاساییەکانی تۆردۆفرانس بوو.

کاتی پێشبڕکێ لە زنجیرە کێوەکانی ئالپ، دوژمنێکم بۆ خۆم دروست کرد. بوێری و ئازایەتی من لە سەرکەوتن بە هەورازەکاندا، بوو بووە هۆی ئەوەی کە میدیاکانی فەرەنسا گومانیان بۆ دروست ببێت. ئێستا ئیتر مەقۆ مەقۆی میدیاکان دەستیپێکردبوو. ئەو چیرۆکانەی کە لە ڕۆژنامەکانی لی ئیك و لی مۆندا چاپ کرابوون، بەشێوەی ناڕاستەخۆ نەك بە ئاشکرا، ئاماژەیان بەوە کردبوو کە گەڕانەوەی ئارمێسترانگ، لەڕادەبەدەر پەرجوو ئاسایە و ڕەنگە ئەو شتێکی بەکار هێنابێت.

دەمزانی ئەمانە، دەرئەنجامی ئەوەیە کە لە سێستێریر، براوە بووم. ئەمە تاڕادەیەك وەك نەریتێکی لێهاتووە کە کەسێك بلوزی زەردی پۆشی، بەردەوام گومانی بەکارهێنانی ماددەی وزەبەخشی لێدەکرێت. من خۆم

لەم شتانە بەدوور گرت. ژمارەیەك لە هەواڵنێرە فەرەنسییەکان دەیانووت ڕەنگە چارەسەری کیمیایی کاریگەری لەسەر توانای من هەبووبێت. ئەوان پێیان وابوو من لە ماوەی چارەسەرکردنی خۆما، دەرمانگەلێکی نهێنیم بەکارهێناوە کە توانای منی باشتر کردووە. هەر ئانکۆلۆژیستێك لە دنیادا، بەبێ گوێدانە ئەوەی سەر بە چ نەتەوەیەکە، گاڵتەی بەم قسە گەوجانەیە دێت.

من تێنەدەگەیشتم کە چۆن دەکرێ کەسێك پێیوابێ دەرمانەکانی شێرپەنجە توانیویانە یارمەتیم بدەن و ببنە هۆی ئەوەی کە من پێشبکەوم؟!! ڕەنگە جیا لە تووشبوویەکی شێرپەنجە، هیچ کەس نەتوانێ لە قورسی و ناخۆشبوونی ئەم چارەسەرییانە تێبگات. لە ماوەی سێ مانگی تەواودا تەنیا دەرمانێك دەدرا بە من کە ژەهراویتر و کوشندەتر لەو دەرمانە بوونی نییە. هەموو ڕۆژێك ئەم دەرمانە دەکرایە لەشی منەوە و منی وێران دەکرد. من دوای سێ ساڵ، هێشتاش هەست دەکەم ئەو ژەهرە لە لەشم نەچۆتەدەر.

من هیچ شتێکم نەبوو تا بیشارمەوە و تێستی ماددەی وزەبەخش (دوپینگ) ئەم ڕاستییەی سەلماند. هەر جارێك کە بەرپرسانی پێشبڕکێکە، یەکێك لە ئەندامانی تیمەکەی ئێمەیان بۆ تێستی دوپینگ دیاری دەکرد، ئەو کەسە من بووم و ئەمەش بەڕێکەوت نەبوو. تێستی دوپینگ، یەکێك لە ئازار بەخشترین بەشەکانی پێشبڕکێکە بوو. ڕێك دوای کۆتاییهاتنی هەر قۆناغێك، منیان دەبردە چادرێکی کراوە. لەوێ لەسەر

کورسییەك دادەنیشتم و پزیشك، لاستیکێکی توندی لە باسکم توند دەکرد و خوێنی لێدەگرتم. کاتێك لەوێ پاڵ دەکەوتم، کۆمەڵێك وێنەگر هورووژمیان دەهێنا و وێنەیان دەگرت. ئێمە پزیشکەکەمان ناو نابوو "خوێنمژ" و هەر کات دەهات، دەمانووت: "خوێنمژ هات." بەڵام تێستی دوپینگ، بوو بووە باشترین هاوڕێی من، چونکو دەری دەخست کە من پاکم. من بەردەوام خەریکی تێست کران بووم.

بە میدیاکانم ووت: "من لە ژیان و نەخۆشی و پیشەکەمدا، هیچ شتێکم نییە بیشارمەوە." لە روانگەی منەوە بابەتەکە کۆتایی هاتبوو. لە بارەی سێستێریریشەوە، تەنیا هۆکاری سەرکەوتنی من، هەوڵدان و راهێنان بوو، هیچ راز و نهێنییەك لە ئارادا نەبوو. من لەڕ و لاواز بووم، بەڵام لە بەرامبەردا پاڵنەرێکی بەهێز و ئامادەیی ئەو کارەم تێدابوو. سێستێریر بۆ من سەرکەوتنێکی زۆر باش بوو، لێژایی شاخەکە و هەروەها بارودۆخی کەش و هەوا گونجاو بوو. ئەوەی ئەو رۆژە لە مندا بە نائاسایی دەهاتە پێش چاو، توانایەك بوو کە بەبێ ئیختیاری خۆم بەرەپێشی دەبردم و من ئەوم بە شۆر و شەوقی سەرچاوە گرتوو لە ژیانی دووبارە و توانای سەرکەوتن لێکدەدایەوە. بەڵام میدیاکان لەمە تێنەدەگەیشتن، لەبەر ئەم هۆکارە، بڕیارمدا چەند رۆژێك وتوێژیان لەگەڵ نەکەم.

تیمی پوتساڵ بوو بوو بە شەمەنەفەرێکی ئێکسپرێس، ئێمە گەیشتینە قۆناغی پێشبڕکێ لە مەودای نێوان ئالپ و پیرنەدا و لە ناوچەیەك بەناوی مەسیف سەنتراڵ پایدەرمان لێدەدا، ناوچەیەکی سەیر بوو، نە تەواو

شاخاوی بوو نە تەواو تەخت و ڕێك بوو، بەڵکو حاڵەتێکی شەپۆلی هەبوو کە دەبووە هۆی ئەوەی کە قاچەکان هیچ پشوو نەدەن. کاتێك بەرەو باشوور، واتە بەرەو پیرنە دەڕۆشتین، ریزی شەپۆناسای گوڵەبەڕۆژە قەراغ جادەکەی داپۆشیبوو...

قۆناغێکی قورس بوو. بەردەوام لە هەڵگەڕان و داگەڕان بە تەپۆڵکەکاندا بووین و بەرەو ڕووی هورووژمی تیمەکانی دیکە دەبووینەوە. لە هیچ شوێنێکی ڕێگاکەدا، شوێنێکی بۆ پشوودان و حەسانەوە لێنەبوو، پاسکیلسوارەکان لە هەموو لایەکەوە بەرەو لای ئێمە دەهاتن. ئێمە تارادەیەك هەموویانمان خستبووە ژێر چاودێری و کونترۆڵمان دەکردن، بەڵام هەوا زۆر گەرم و ڕۆژەکانیش پڕ کێشە بوون. کەشەکەی ئەوەندە گەرم بوو کە هەندێکجار هەستمان دەکرد خەریکە جادەکە لەژێر تایەی پاسکیلەکانماندا دەتوێتەوە.

فرانکی، جۆرج، کریستین، کوین و پیتەر لە هەمووان زیاتر هەوڵیان دەدا. فرانکی هەر لە سەرەتاوە، زۆر بەهێزانە دەستیپێکرد و ئەوانی دیکەی تێپەڕاند. کاتێك ئەو ماندوو بوو، جۆرج درێژەی دا و چەند کەسێکی تێپەڕاند، بەجۆرێك کە چیتر نەیاندەتوانی درێژە بە پێشبڕکێکە بدەن. پاشان نۆبەی تایلەر بوو، ئەویش ژمارەیەکی زۆر لە رکابەرەکانی لەپشت سەری خۆیەوە جێهێشت. لە کۆتاییدا من و کوین مابووینەوە. ئەو منی بەرەو پێش دەبرد و بەمجۆرە، بەسەر ئەوانی دیکەدا سەردەکەوتین.

هورووژمی رکابەرەکان هەموو ڕۆژێك درێژەی هەبوو. ئەوان هێشتاش

پێیان وابوو کە ئێمە دەکرێ زەفەرمان پێببرێ و سوور بوون لەسەر ئەوەی کە ئێمە لە گۆڕەپانەکە بکەنە دەر. گەیشتینە ناوچەیەك بەناوی هوم مۆرت، هەوراز و نشێو گەلێك کە تا چەندین میل دەڕۆشت و دەبووە هۆی ئەوەی کە ئەندامانی تیمەکە لە یەکتر دوور بکەونەوە. ئەژنۆی پیتەر زیانی بەرکەوت، کوین بەهۆی گۆڕانی کەش و هەوا لە کێوەکانی ئالپ، نەخۆش کەوتبوو، فرانکی و جۆرج لە هەڵگرتن و گواستنەوەی بارەکان ماندوو بوو بوون. بەهۆی زۆری گەرمای هەوا و گەرمی نێو پێڵاوەکان، هەمووان قاچیان زیانی پێگەیشتبوو.

لەپڕ، سی پاسکیلسوار بەرەو سەرەوەی ڕێگاکە خۆیان تاودا. ئێمە دەبوو شوێنیان بکەوین. چاوەڕوانی تایلەر و فرانکی یان ئەوانی دیکە نەبووم و بەتەنیا شوێن ئەوان کەوتم تا پێیان گەیشتمەوە و پێشیانك ەوتم. لە ئامێرەکەوە، گوێم لە دەنگی کوین بوو کە هاواری دەکرد: "چی دەکەی بە نەفرەت بی؟" من گەڕامەوە سەر خووە خراپەکەی پێشوو، واتە بەفیڕۆدانی وزەی خۆم. کوین وتی: "زوو بگەڕێرەوە، پێویست بەم کارە ناکات."

وتم: "باشە" و خێراییەکەم کەم کردەوە تا باقی ئەندامانی تیمەکە بگەن.

لەو شەش یان حەوت کاتژمێرەی بەسەر پاسکلیەوە بووم، بیرم لە چی دەکردەوە؟ هەمیشە ئەم پرسیارە لەم دەکرا، بەڵام وەڵامەکەی هێندە سەرنجڕاکێش و ورووژێنەر نەبوو، لەبەر ئەوەی کە من تەنیا بیرم لە

پایدەر لێدان دەکردەوە. هەموو بیرم هۆشم لای ئەم بابەتە بوو. هەروەها بیرم لەو تەکنیکانە دەکردەوە کە لە قۆناغە جیاوازەکاندا بەکارم دەهێنان. زۆر جار بە خۆمم وتبوو کە ئەم پێشبڕکێیە لەو جۆرە پێشبڕکێیانەیە کە ئەگەر بمەوێ تیایدا سەرکەوتوو بم، پێویستە بەردەوام بیر لەو تەکنیکانە بکەمەوە کە بۆ قۆناغی دواتر پێویستە بەکاریان بهێنم. هەمیشە نیگەرانی بارودۆخی خۆم لەچاو رکابەرەکانمدا بووم، وشیارانە وریای ئەو شتە بووم کە لە دەور و بەرم دەگوزەرا. سەرەڕای ئەوە هەوڵم دەدا خۆم لە پێکداداان و زیان بینین بپارێزم.

بۆ ماوەی پێنج شەو و رۆژ بە یەك شێوە، بەرەو ناوەندی فەرەنسا و کێوەکانی پیرنە پایدەرمان لێدا. لە "سنت ئێتین"ەوە تا سنت گالمیر، لەوێوە بۆ سنت فلۆر و پاشان بۆ ئالبی، کاسترس و سنت گادێن. قۆناغی سێزدەهەمی پێشبڕکێکە، دووروودرێژترین و گەرمترین قۆناغی پێشبڕکێکە بوو کە بریتی بوو لە حەوت هەوراز بێ ئەوەی هیچ جادەیەکی تەخت و رێکی تێدا بێت. فرانکی دەیووت، شێوەی رێگاکە لەسەر نەخشە لە دەمە مشار دەچێت. رۆشتن بەو رێگایەشدا هەر ئەم هەستە بە مرۆڤ دەبەخشی. دواجار لەم قۆناغەدا پیتەر ناچار بوو بەهۆی زیانبەرکەوتنی ئەژنۆیەوە، لە پێشبڕکێکە بکشێتەوە.

کاتێك کە پایدەرمان لێدەدا، بەردەوام برسی و تینوو بووین و بە شتانێکی وەك شیرینی، کێکی بایەمی و هەر شتێکی دیکە کە بیتوانیبایە کاربۆهیدرات بە لەشمان بگەیەنێ، بەرکوڵمان دکرد. هەوڵمان دەدا

خواردنەوە شیرینەکان بخۆینەوە. بەدرێژایی ڕۆژ، سیتۆمێکسمان دەخوارد و شەوانەش میتابول.

ئەو کاتەی کە من لە پێشبڕکێدا بووم، کیك خەریکی مۆم داگیرساندن بوو. گرنگ نەبوو لە دێهات بێ یان لە شارێکی گەورە. تەنیا کلێسایەکی دەدۆزییەوە و مۆمێکی دادەگیرساند، ئەو تەنانەت لە ڤاتیکانی ڕۆماش مۆمی بۆ من داگیرساندبوو.

دواجار گەیشتینە کێوەکانی پیرنە، بەرەو سنت گادێن پایدەرمان لێدەدا. کێوەکانی پیرنە دوا شانسی رکابەرەکان بوو کە بە سەر مندا سەرکەون. تەنیا تێپەر کردنی ڕۆژێکی خراپ لەو ناوچەدا دەیتوانی تووشی شکستم بکات. لەبەرە ئەمە تا ئەوکاتەی لە کێوەکانی پیرنە نەهاتمایە خوارەوە، نەمدەتوانی دڵنیا بم کە براوەی "تۆردۆفرانس"م.

تا دەهات پەستانی هەوا زیاتر دەبوو. دەمزانی کە پایدەر لێدان لەگەڵ گرووپ و کۆتاییهێنان بە پێشبڕکێکە، چەندە خۆشە، بەڵام بلوزی زەرد ئەزموونێکی نوێ بوو، هەروەها فشار هێنان بۆ سەر منی زیاتر دەکرد. بەشداربووان هەموو ڕۆژێك لە ڕێڕەوی پێشبڕکێکەدا منیان هەڵدەسەنگاند. کاتێکیش بەسەر پاسیکیلەوە نەبووم، بەدەست میدیاکانەوە زۆرم بۆ دەهات.

بڕیارمدا لە کۆنفڕانسێکی ڕۆژنامەوانی لە سنت گادێن، وەڵامی پرسیارەکانی ئەوان بدەمەوە. بەوانم وت: "من لە قۆناغی چارەسەری نەخۆشییەکەمدا، مەرگم لە ئامێزی خۆمدا هەست پێدەکرد و گەمژە

نەبووم کە بمەوێ دەرمانی دیکەش بەکار بهێنم." هەموو کەس دەیزانی کە بەکارهێنانی EPO و سترۆئید، تەنانەت دەتوانی کێشەی خوێن و سەکتە بۆ کەسانی ساغیش دروست بکات. هەروەها بەوانم وت، سەرکەوتنی من لە سێستیریر، هێندە مایەی سەرسوڕمان نەبوو، چونکە پێش ئەمەش بوو بوومە پاڵەوانی جیهان.

لەدرێژەی قسەکاندا وتم: "بەدڵنیاییەوە پێتان دەڵێم کە دەرمانم بەکار نەهێناوە، پێموانییە کە سەرکەوتن و لەشساغی من جێی سەرسوڕمان بێت. من ئاماتۆر نیم، دەزانم ئێوە بەشوێن نهێنییەکدا دەگەڕێن، بەڵام هیچ شتێکی وا بوونی نییە. زۆر کەس هەوڵیاندا شتێك بدۆزنەوە، بەڵام تێگەیشتن کە لەگەڵ کەسێکی پاکدا (لە رووی دوپینگ و بەکارهێنانی دەرمانەوە) بەرەو روون."

تەنیا کارێك کە من دەمتوانی بیکەم ئەمە بوو کە درێژە بە پێشبڕکێکەم بدەم، پشکنینی دوپینگ بکەم و وەڵامی پرسیارەکانی ئەوانی دیکە بدەمەوە. قۆناغی یەکەمی پێشبڕکێ لە کێوەکانی پیرنەمان دەست پێکرد: رێگای نێوان سنت گادێن بۆ پیائێنگالی کە لە نێوان حەوت کێودا هەڵکەتبوو. ئەمە هەر ئەو رێگایە بوو کە من پێشتر لە سەرما و سۆڵەی تونددا پێیدا رۆشتبووم، بەڵام ئێستا کە بە رێگای نێوان شاخەکاندا دەڕۆشتین، هەوا گەرم و تەماوی بوو، سەرەو خوارییەکانی زۆر لێژ و مەترسیدار بوون و قەراغ جادەکەش دۆڵ بوو.

ئەم قۆناغی پێشبڕکێیە، رێك لەسەر سنووری ئیسپانیا کۆتایی هات.

ئەمە بەو واتایە بوو کە هەموو پاسکیلسوارە ئیسپانییەکان، سوور بوون لەسەر ئەوەی کە لەم قۆناغەدا براوە بن و لەم نێوەدا هیچ کەس بەڕادەی "سکارتین"ی لەڕ و باریکەلە -کە روخساری دەتووت هەڵۆیە و لە هەموو شوێنێك بەشوێن منەوە بوو- بە تاسەی سەرکەوتنەوە نەبوو. لەنێو ئەم هەوڵە دەمارگیرانانەدا گروپەکەی ئێمە لە یەکتر جیا بوونەوە، لەبەر ئەوە من بە تەنیا بە شاخەکەدا سەردەکەوتم و بەدوای سکارتینەوە بووم. ئەو ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا.

کاتێك کە دیمەنی کێوەکان، لە یەکەم هەڵگەڕان تا دوایین هەڵگەڕان لەپێش چاوم کرایەوە، بڕیارمدا زوو لە تێپەڕێنم و خۆم بگەیەنمە پێگەی دووهەم، بەڵام هەرچیم کرد نەمتوانی خۆم بگەیەنمە سکارتین کە ئێستا دوو خولەك لە پێش منەوە بوو. لە دوایین هەورازدا لە پەلوپۆ کەوتم، لەبەر ئەوەی لە نانی بەیانی بەدواوە، جیا لە شلەمەنی هیچ شتێکی دیکەم نەخواردبوو، بەهۆی بێ هێزی لەڕادەبەدەرەوە نەمتوانی بەردەوام بم.

من بووم بە چوارەم، سکارتین براوەی ئەو قۆناغە بوو، بەگشتی بەرز بۆوە بۆ پلەی دووهەم. ئیستا ئەو بە جیاوازی شەش خولەك و نۆزدە چرکە لە دوای منەوە بوو، زوو لەش بە جیاوازی حەوت خولەك و بیست و شەش چرکە.

ماوەیەکی کەم دوای پەڕینەوە لە هێڵی کۆتایی، هەواڵنێرێکی فەڕەنسی هاتە لام و وتی، راپۆرت گەلێکیان بەدەست گەیشتووە کە پیشانی دەدات

نەدەکرد. ئەوان هەر کات بیانویستبایە دەیانتوانی چەکمەجە، گیرفانەکان و تەنانەت ئوتۆمبێلەکەشم بپشکنن.

بە میدیاکانم وت: "من لە فەرەنسا دەژیم. مانگەکانی جون و مەی لە فەرەنسا سەرقاڵی راهێنان بووم. ئەگەر بمویستبایە شتێك بشارمەوە، دەبوو ئەم ماوەیە سەردانی وڵاتێکی دیکەم بکردبایە."

رۆژی دواتر، بەرەو کێوەکانی کول دی تورماڵت ( Col du Tourmalet) بەڕێکەوتین کە رەنگە لەم پێشبرکێیەدا بەناوبانگترین کێوەکان بن و جادەکانی، زیاتر لە دە میل بە ئاسماندا بەرز بوو بۆوە. ئەمە دوایین هەوراز(هەڵگەڕان)ی ئێمە بوو، دەمانزانی کە بەر پەلاماری بێ ئامانی رکابەرەکان دەکەوین. ئێستا ئیدی لە رۆشتن لە پێشەوەی گرووپ کە زیاتر لە هەمووان با لێیدەدا و شوێنکەوتن لە دواوە بێزار بوو بووین. بەڵام ئەگەر بمانتوانیبایە یەك رۆژی دیکە خۆڕاگرین، هەموو شتێك باش دەبوو.

هەر کە گەیشتینە هەوەڵی رێگای بیست کیلۆمەتری هەورازەکە، رکابەرەکانمان دەستیان بە سەخڵەت کردن و ئازاردانی ئێمە کرد. ئێمە بەخێراییەکی زۆر پایدەرمان لێدابوو تا ئەوان نەتوانن خۆیان بگەیەننە ئێمە و ئێستا کە هەشت کیلۆمەتری دیکەی مابوو، خێراییەکەمان زیاتر کرد. تەنانەت "ورینکە"ی پاسکلیسورای فەرەنسی هاتە لای کوین و پێی وت: "کێشەیەکت هەیە؟" و کوین وەڵامی دایەوە، بەو شێوەیە نییە، گێرەکەی گۆڕی و بەخێرایی لەو دوور کەوتەوە. بەدرێژایی ئەو رۆژە

ورینکە بە گرژی و نێوچاوان تاڵییەوە، دوامان کەتبوو.

لەکاتی سەرکەوتندا، من و سکارتین، بوو بووینە سێبەری یەکتر و من بەوردی چاودێری ئەوم دەکرد. ئەو لە لێژترین بەشی ڕێگاکەدا خۆی تاوداو هورووژمی برد. من هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ئەودا دەڕۆشتم، زولەش هەر بەم شێوەیە بوو. وەك ئەوە وابوو کە تا گەیشتن بە لوتکە، ئەم پێشبڕکێیە، تایبەت بەو سێ کەسە بێت. کە گەیشتینە لوتکە، بڕێك لە هەورەکانمان لەژێر پێی خۆماندا دەبینی و لەکاتی هاتنە خوارەوەدا، تەمەکە هێندە چڕ و خەست بوو کە بەزەحمەت تا دە فووتی پێش خۆمان دەبینی. ترسابووین، پێشبڕکێیەکی قورس لەنێو تەم، کێوە گاشە بەردییەکان و ڕێگای بێ پارێزبەند، زۆر مەترسیدار بوو.

تەنیا کارێك کە دەمەویست لەم دۆخەدا ئەنجامی بدەم، ئەمە بوو کە پێ بە پێی رکابەرەکان یا لەپێش ئەوانەوە بڕۆم. بەرزایی دواتر کە لە پێشمان بوو، کول دو یۆلۆر (Col du Soulor) بوو. لەوێش سکارتین دوو جار هورووژمی برد، بەڵام من هەروەها وەك سێبەر لەگەڵی دەڕۆشتم. گەیشتینە لوتکەیەکی تەمومژاوی دیکە و پاشان گەیشتینە دوایین بەرزایی تۆردۆفڕانس، واتە کول دو ئابیسك (Col d'Aubisque) کە درێژییەکەی حەوت کیلۆمەتر و نیو بوو. دوای ئەم بەرزاییە، داگەڕانێکی بەخێرایی حەفتا میل لە کاتژمێرکدا بەرەو هێڵی کۆتاییمان لەپێش بوو.

سێ پاسکیلسوار لە پێش هەموانەوە بۆ بەدەستهێنانی پلەی یەکەم پایدەریان لێدەدا و گرووپێکی نۆ کەسیش بە دووری یەك خولەك، شوێن

پێی ئەوانیان هەڵگرتبوو. هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو کە لەم قۆناغەدا براوە دەبم یان نا. چوار کیلۆمەتری دیکەی مابوو بۆ هێڵی کۆتایی و بڕیارمدابوو تەنیا نەهێڵم ئەوان لە رووی کاتەوە پێش من بکەون. تەنیا یەك ئامانجم هەبوو ئەویش پارێزگاری کردن لە بلوزە زەردەکە بوو.

دوای گەیشتن بە هێڵی کۆتایی، لە پاسکیلەکە دابەزیم. تەواو ماندوو بووم، بەڵام خۆشحاڵ بووم بەوەی کە توانیبووم پێشەنگی خۆم بپارێزم. ئێستا دوای پێنج کاتژمێر پایدەر لێدان دەبوو لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا بەشداری بکەم. هەستم دەکرد میدیاکان دەیانەوێ لە رووی رۆحی و دەروونییەوە ئازارم بدەن. ئەوان لە پێشبڕکێکە زیاتر ئازاریان دەدام.

ئەو رۆژە، یەکێتی نێودەوڵەتی پاسکیلسواری، ئەنجامی هەموو پشکنینەکانی دوپێنگی منی بلاو کردەوە کە دەریدەخست من پاکم. لە "جین ماری لبلانك"ی بەرپرسی پێشبڕکێکانەوە، متمانەم پێدرا. ئەو وتی: "ئەوەی کە ئارمێسترانگ توانیوێتی بەسەر نەخۆشییەکەیدا زاڵ بێ، نیشانەی ئەوەیە کە تۆردۆفرانسیش دەتوانی بەسەر نەخۆشییەکانی خۆیدا زاڵ ببێت." (ئاماژە بە ژەهر بلاوکردنەوەی میدیاکان لەدژی ئارمێسترانگ)

ئێمە تارادەیەك هەموو هێرشەکانمان دوور خستەوە، هەم هێرشی رکابەرەکان لە پێشبڕکێکەدا و هەم هێرشەکانی میدیاکان لە دەرەوەی پێشبڕکێکە. پارێزگاریشمان لە بلوزە زەردەکە کرد. دواجار توانیمان ئەم

کارە بکەین و لە ماوەی سێ هەفتەدا گرووپەکەمان کونترۆڵ کرد. من مەودای ۲۲۰۰ میلم لە ماوەی هەشتا و شەش کاتژمێر و چل و شەش خولەك و بیست چرکەدا بڕی و پلەی یەکەمم بەدەستهێنا. سکارتین بە جیاوازی شەش خولەك و پانزە چرکە بوو بە دووەم و زولە بە جیاوازی حەوت خولەك و بیست و هەشت چرکە، پلەی سێهەمی بەدەستهێنا.

هێشتا جلوبەرگی پێشبڕکێکەم لەبەردا بوو.

سەیر بوو تا لە پاریس نزیکتر دەبووینەوە من تووڕەتر دەبووم. هەموو شەوێك لە حاڵێکدا کە لەشم سەر ئارەقەی سارد دەگەڕا، خەبەرم دەبوەوە و نەمدەزانی هۆکارەکەی چییە. ئایا نەخۆش کەوتبووم؟ تەنانەت لە کاتی نەخۆشیەکەش زیاتر ئارەقەم دەکردەوە. بەردەام بە خۆم دەووت، ململانێ بۆ گەڕانەوە بۆ ژیان، قورستر بووە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی ببمە پاڵەوانی تۆردۆفڕانس، بەڵام ئێستا دەمزانی کە وەکو یەك، بۆ هەر دووکیان هەوڵم داوە.

تەنیا من تووڕە نەبووم. تەنانەت فیتەری تیمەکەش، شەو لە تەنیشت پاسکیلەکەی منەوە دەخەوت، چونکە دەترسا بیخەنە سەیارە بارهەڵگرەکە و خراپەکارییەك ڕوو بدات. کەس نەیدەزانی ڕەنگە چ ساختەکارییەك ڕوو بدات تا من وەك براوەی پێشبڕکێکە ڕانەگەیندرێم. قۆناغی حەڤدەهەمی پێشبڕکێکە، ڕێگایەکی دوور و درێژ بەرەو بوردۆکس بوو، زۆرێك لە بەشداربووان لە حاڵێکدا کە لاواز و ماندوو بوو بوون، بەردەوام بوون.

مەترسییەکی جددی دیکە هەبوو کە ڕەنگبوو ڕێ لە سەرکەوتن من بگرێ و ئەویش پێکدادان و زیان بەرکەوتن بوو. تەنیا یەك لەمپەری دیکە مابوو، مەودایەکی ٣٥,٤ میلی لە پارکی شاری فوتۆڕۆسکۆپ، کاتیش لەم قۆناغەدا گرنگ بوو.

ئەو مەترسییەی کە هەبوو، کەوتن و شکانی یەکێك لە ئێسقانەکان بوو. دەمەویست لەم قۆناغەشدا براوە بم و بە میدیاکان و دەنگۆ بڵاوکەرەوەکان بڵێم کە هەر هیچ بەلامەوە گرنگ نییە لەبارەی منەوە چی دەڵێن یان چی دەنووسن. دوای ئەم قۆناغەش دەبوو دووبارە لە کۆنفرانسێکی هەواڵنێریدا بەشداری بکەم (و دیسان بەرپێکەوت پشکنینی دوپینگم بۆ بکرایە!) هەوڵدان بۆ بردنەوە لەم قۆناغەدا، سەرچڵییەکی گەورە بوو، چونکە کەسێك کە لەپێش هەمووانەوە بوو، ئەگەری ئەوە هەبوو سوود لە شانسێکی گەمژانە وەرگرێ و پاشان بەشێوەیەك زیانی بەرکەوێ کە چیتر نەتوانی پاسکیلسواری بکات.

ئەم حاڵەتە پێشتریش ڕوویدابوو، وەك ئەو شتەی کە لە مێتس بۆ "باب جولیچ" ڕوویدا. ئەو لە خێرایی ٥٥ میل لە کاتژمێردا، هاوسەنگی خۆی لە دەستدا و دوا بەدوای ئەوە، پەڵەیەك خوێنی گەورە لە سنگیدا دروست بوو. منیش لەو قۆناغەدا، هێندەی نەمابوو خۆم بکێشم بە منداڵێکدا کە لەنێو خەڵکەکەوە پەڕییە سەر جادەکە و زیانم پێبگات. لە قۆناغی ئالپ دی هیوزیش یەکێك لە تماشاچییەکان هاتە نێوەڕاستی جادەکە و گوێنێرنی خۆی لێدا. زولەش ئەگەر لە دەربەندی دوگویس تووشی ڕووداو

نەبووایە، ئێستا بە جیاوازی تەنیا یەك خولەك لە دوای منەوە دەبوو.

شەوی پێش دوایین قۆناغ، بیل ستاپیڵتۆن بۆ بینینی من هاتە هوتێل و وتی: "من ڕاهێنەر نیم، بەڵام پێموایە نابی ئەم قۆناغە بە قورس بزانی. هەوڵ بدە كارێكی گەوجانە نەكەیت."

كاری ژیرانە ئەمە بوو كە خۆ لە هەر چەشنە هەڵەیەك بەدوور بگرم، زیانم پێنەگات و بەهۆی پێكدادانێكەوە، دە خولەك لەدەست نەدەم.

من گرنگیم بە قسەكەی ئەو نەدا و وتم: "بیل، تۆ پێیتوایە قسە لەگەڵ كێ دەكەی؟"

وتی: "چی؟"

وتم: "من سبەینێ لە پێشبڕكێكەدا براوە دەبم و ناوی خۆم وەك پاڵەوانی تۆردۆفڕانس تۆمار دەكەم."

بیل بە پەشیمانییەوە وتی: "زۆر باشە، پێموایە ئەم بابەتە چیتر بۆ باسكردن نابێت."

من لە قۆناغی "مێتس"ەوە بلوزی زەردم لەبەردا بوو، نەمدەویست لەدەستی بدەم. تەنیا سێ كەس هەموو قۆناغەكانی "تایم تریل"یان بردبۆوە، ئەوان لە ڕیزی پاڵەوانە گەورەكاندا بوون و بریتیبوون لە: "بێرنارد هینالت، ئەیدی مێركس و میگویل ئینۆراین." ئێستا منیش دەمەویست بچمە ڕیزی ئەوانەوە، دەمەویست بیسەلمێنم كە بەهێزترین پیاوی تۆردۆفڕانسم.

نەمدەتوانی بخەوم، سکات مەك ئیچران لە کۆمپانیای نایك و ستاپیلتۆن هاتنە ژوورەکەم. لەپڕ یوهان خۆی بە ژوورەکەمدا کرد و سکاتیَ بینی کە لەسەر قەرەویڵەکەی من پاڵکەتووە، لە حاڵێکدا کە من هێشتا بەپێوە بووم. یوهان سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد، یازدە و نیوی شەو بوو. فەرمانی کرد: "ئەمانە لێرە بکەرە دەر و بچۆ بخەوە."

دایکم بۆ دوایین قۆناغ هاتبوو، من بەرنامەڕێژیم کرد کە ئەو لەگەڵ یەکێك لە ئوتۆمبێلەکانی ئێمە بێت. ئەو دەیەویست لەگەڵ من بیَ، لەبەر ئەوەی هەستم دەکرد ئەو هەستی وارسکەی(غەریزی) پشتیوانی دایکانە ریَ نادات زیانم پێبگات. بەڵام ئەم قۆناغە منی ترساندبوو، دایکیشم ئەوەندەی سەر لە پاسکیلسواری دەردەچوو کە بزانیَ ئاسان دەکریَ لەم قۆناغەدا پاسکیلسوار زیانی پێبگات. ئەو دەیزانی کە ئەم قۆناغە دەتوانیَ ببێتە هۆی ئەوەی کە هەموو شتێك لەدەست بدەم یان هەموو شتێك بەدەست بهێنم، هەر لەبەر ئەمەش هاتبوو.

سوار پاسکیلەکەم بووم و ئەو گێرانەم تاقیکردەوە کە دەمەویست بەکاریان بهێنم. کاتێك کە خەریکی خۆ گەرمکردن بووم، تایلەر همیلتۆن بەڕێکەوتبوو. ئەرکی ئەو لەم قۆناغەدا ئەوە بوو کە بیَ گوێدانە هەر چەشنە سەرچڵییەك، ئەوەندە دەتوانیَ خێرا پایدەر لێبدات و زانیارییە تەکنیکییە بەسوودەکان بە من بدات. ئەو نەك هەر توند و خێرا دەڕۆشت، بەڵکو بەشی زۆری ئەو ڕۆژە پێشەنگ بوو. بەڵام دواجار زولە بە کاتژمێرێك و هەشت خولەك و بیست و شەش چرکە پێش ئەو کەوت.

نۆبەی من هات، بە هێزەوە وەڕێکەوتم. سکارتین لە پێش منەوە بوو، ئەو سێ خولەك پێش من جوولەی کردبوو. سەرم داخستبوو، بۆ ئەوەی هیچ سەیری بکەم، بە تەنیشت کۆمەڵێك درەخت و ڕووەکی بەرزدا، ئەوم تێپەڕاند.

دوو بەشی یەکەمم بە کەمترین کات بڕی، ئەوەندە خێرا بووم کە بە باشی ڕوخساری دایکمم لە نێو ئوتۆمبێلەکدا نەدەبینی.

لە تایم تریلی سێهەمیشدا دیسان بە پەنجا خولەك و پەنجاوپێنج چرکە لە پێگەی یەکەمدا بووم، بەڵام ئایا دەمتوانی تا کۆتایی ڕێگاکە بەو خێراییە بڕۆم؟

لە شەش کیلۆمەتری کۆتاییدا بیست چرکە لەپێش زولەوە بووم. بەڵام ئێستا خەریکبوو کاتم لەدەست دەدا و هەستم بەمە دەکرد. ئەگەر بشمتوانیبایە بە سەر زولەدا سەرکەوم، تەنیا بە جیاوازی چەند چرکەیەك بوو. لە دوو لۆفەی کوڕی کۆتاییدا لەسەر پاسکیلەکە هەستام و خۆم تاودا، هەوڵم دەدا بەر هیچ نەکەوم، بەڵام کارێکی قورس بوو، تاڕادەیە بەسەر بەرد چنەکەدا دەپەڕیم.

بەشی کۆتایی پێشبڕکێکە کەوتبووە شارێیەکەوە، ددانەکانم توند لێکجووت کرد. بەردەوام چرکەکانم دەژمارد و پایدەرم لێدەدا. لە هێڵی کۆتایی پەڕیمەوە و سەیری کاتژمێرم کرد، کاتژمێرێك و هەشت خولەك و حەڤدە چرکەی پیشان دەدا.

من بە جیاوازی نۆ چرکە بردمەوە.

من براوەی ئەو قۆناغەی پێشبڕکێکە و پاڵەوانی تۆردۆفرانس بووم. ئێستا ئیتر دڵنیابووم کە براوەم. نزیکترین رکابەری من زولە بوو کە بەگشتی حەوت خولەك و سی و حەوت چرکە لە دوای منەوە بوو، ئەم جیاوازی کاتە لە قۆناغی کۆتاییدا قەرەبوو نەدەکرایەوە.

کاتێك دەچوومە سەر سەکۆکە، دایکم چەپڵەی لێدەدا، ئاڵای وڵاتەکەمانی رادەوەشاند و فرمێسکەکانی دەسڕی. پێش دەسپێکردنی قۆناغی کۆتایی نەمتوانیبوو ئەو ببینم، بەڵام هەر خێرا دوای تەواو بوونی پێشبڕکێکە، ئامێزم پێداکرد و لەگەڵ خۆم بردم بۆ رێوڕەسمەکە. ئەو وتی: "باوەڕ ناکەی کاتێك بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە چی روویداوە. دەزانم ئێستا قورسە بیر لەم بابەتە بکەیتەوە، بەڵام خەڵکی ئەمریکا لەخۆشیان شێت بوون. من پێشتر شتی لەو شێوەیەم نەبینیبوو."

دوای بەڕێوەچوونی رێوڕەسمەکە، گەڕامەوە بۆ هوتێل و لە هۆڵی چاوەڕوانی تووشی قەرەباڵغی هەواڵنێرەکان بووم. ئێمە بەرەو ژوورەکەم رۆشتین. یەکێك لە هەواڵنێرە فەڕەنسییەکان ویستی وتووێژ لەگەڵ دایکم بکات و لێی پرسی: "دەتوانم قسەت لەگەڵ بکەم؟"

گەڕامەوە و وتم: "ئەو لەگەڵ رۆژنامە فەڕەنسییەکاندا وتووێژ ناکات" بەڵام هەر پرسیاری لە دایکم دەکرد.

وتم: "وازی لێبێنە" دەستم لە ناوقەدی ئاڵاند و پێکەوە بەرەو ژوورەکەم رۆشتین.

ئەو شەوە بیرم لە گەڕانەوە بۆ ئەمریکا دەکردەوە. هەواڵنێرێك لە

گۆڤاری پیپل هاتە پێش و ویستی وتووێژم لەگەڵ بکات. سپۆنسەرەکانیش ورووژمیان هێنابوو بۆ هوتێلەکە تا چاویان بە من بکەوێ و دەستی هاوکاریم بۆ درێژ بکەن. دۆست و هاوڕێکانیشم یەك لەدوای یەك دەگەیشتن. بیل ستاپیلتۆن، منی بۆ نانی ئێوارە دەعوەت کرد و بۆی روون کردمەوە کە هەموو بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان، خوازیاری ئەوەن لە بەرنامەکانیاندا ئامادە بیت. ئەو لەو قەناعەتەدا بوو کە بە گەشتێکی یەك ڕۆژە بچم بۆ ئەمریکا و لە چەند وتووێژێکدا بەشداری بکەم.

پێشتر بەمشێوەیە بوو کە پاڵەوانی تۆردۆفرانس، بە هەموو ئەورووپادا بگەڕێ تا بلوزی زەردی کاپتنی پیشانی هەمووان بدات. منیش دەمەویست هەمووان ئەوە ببینن و شانازی پێوە بکەم. وتم: "ئەم بابەتە بۆ قسەکردن نابێ، من لێرە دەمێنمەوە تا گەشتی دەوری ئەورووپا بکەم."

بیل وتی: "باشە، نایابە."

وتم: "باشە، تۆ چون بیر دەکەیتەوە؟"

وتی: "بیر دەکەمەوە کە تۆ هەر بەڕاستی گەمژەی."

وتم: "بۆچی؟"

وتی: "لەبەر ئەوەی نازانی چ باسە و ئەم گەشتە دەتوانی چەندە گرنگ بێت. بەڵام دواجار تێدەگەی، تۆ ناتوانی هیچ بشاریتەوە و هەموو خەڵکی ئەمریکا چاویان لەسەر تۆیە."

کۆمپانیای نایك داوای لێکردم کۆنفرانسێکی هەواڵنێری لە نیۆیۆرك ساز بکەم. سەرۆکی شارەوانی و هەروەها دۆناڵد ترامپیش دەیانەویست لەم کۆنفرانسەدا بەشداری بکەن. خەڵکی ئاستێن خوازیاری بەرنامەیەکی پرشکۆ بوون. ئەوان پێشنیاریان کرد کە بۆ ماوەی رۆژێك، بە فرۆکەیەکی تایبەتی بچم بۆ ئەمریکا و دووبارە بگەڕێمەوە بۆ ئەورووپا تا بتوانم بەشداری لە گەشتی چوار دەوری ئەورووپادا بکەم. گێژ بوو بووم، من چەندین ساڵ لە پێشبڕکێکانی پاسکیلسواریدا بەشداریم کرد و سەرکەوتم، بەڵام کەس لە ئەمریکا گرنگی بەم بابەتە نەدەدا.

بەڵام ئێستا لەپڕ هەمووان چاویان خستبووە سەر من!

بەشێك لە بوونی من، هێشتا باوەڕی بەو راستییە نەکردبوو کە براوە بووم. دوایین قۆناغ، رۆشتن لە ئارپاجۆن بۆ پاریس بوو کە رێگایەکی ۸۹/۲ میلی بوو، زیاتر لایەنی تەشریفاتی هەبوو. بەپێی نەریتی ئەم پێشبڕکێیە، گرۆی پاسکیلسواران بەشێوە پیاسە، رێگای نێوان خاڵی دەستپێك و کۆتایی پێشبڕکێکەیان دەبڕی تا ئەو کاتەی بگەنە بورجی ئێفل و ئارکەدی. لەوێ دەبوو تیمی پۆستاڵ لە پێش گرووپەکەوە، بچێتە نێو شانزەلیزەوە. دوای ئەوە، دە سووڕمان بە دەوری گۆڕەپانی ناوەندی شاردا لێدەدا، تیمی پۆستاڵ بەتەنیا و بە نیشانەی سەرکەوتن سووڕی کۆتایی ئەنجام دەدا.

لە رێدا بەرەو پاریس، قسەم لەگەڵ هاوتیمییەکان و هاوڕێکانم دەکرد و تەنانەت دۆندرمەیەکی بسکیتیشم خوارد. تیمی پۆستاڵ وەك هەمیشە

بەشێوەیەکی تەواو جیاواز لە تیمەکانی دیکە، ڕێك دەڕۆشتن. بە یەکێك لە هەواڵنێرەکانم وت کە هاتبووە قەراج جادە: "من هیچ کارێکم نەکرد، هەموو شتێك بەهۆی هەوڵی هاوڕێکانم بوو."

چەند خولەك دواتر، هەواڵنێریکی دیکە هاتە سەر ڕێگاکە و من پێم وت: "لێرەوە سڵاو دەنێرم بۆ کێلی دەیڤیدسۆن لە فۆرت ورسی تەکساس: سڵاو کێلی، بۆ هەموو شتەکان سپاست دەکەم. ئەم سەرکەوتنەم لەبەر تۆ بوو." کێلی، کچێکی لاو بوو کە شێرپەنجەی هەبوو، لە پێشبڕکێکانی "ڕۆژدا ئەو و خێزانەکەیم ناسی. ئەوان لە هاوڕێیانی نزیکی من بوون.

دواجار لە شار نزیك بووینەوە. کاتێك بۆ یەکەم جار دەچووینە شانزەلیزە، هەستێکی تایبەتم هەبوو. بۆ ئەوەی ئێمە بچینە نێو ئەو شەقامەوە، دایانخستبوو. دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر بوو، بەهەزاران تەماشاچی کە لە هەردوو لای شەقامەکە ریزیان بەستبوو. هەموو شوێنێك پڕ لە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگی جوانکاری، ئاڵا و شیرینی بوو. زۆری ژمارەی ئاڵای ئەمریکا کە لە دوورەوە لە ئاسماندا دەشەکانەوە، منی گێژ کردبوو.

لەنێو ئاپۆراکەدا لە پاسکیلەکەم هاتمەخوار. وێنەگران، کارمەندانی ئاسایش، سەرپەرشتیارانی پێشبڕکێکە و هاوڕێ و دۆستان، دەوریان دابووم و ستایشیان دەکردم. نزیکەی پەنجا کەس لە ئاستینەوە هاتبوون کە لە نێویاندا، بارت ناگس، هاوڕێی خۆشەویستی جێف گارویی و تەنانەت جیم هویتم بینی.

بۆ بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمەکە، ڕێنماییان کردم بەرەو سەکۆکە بچم.

پاش پێدانی کاسەك، بە نیشانەی سەرکەوتن بەرزم کردەوە بۆ سەر سەرم. چیتر نەمدەتوانی بەرگەی دووری کیك بگرم. پرسیارم کرد: "دایکم کوا؟" رێگایان کردەوە و من ئەوم لە ئامێز گرت. هەواڵنێرەکان دەوری ئەویشیان تەنیبوو، لێیان دەپرسی ئایا پێتوایە کە سەرکەوتنی من، سەیر و بە پێچەوانەی چاوەڕوانی هەمووان بووە.

دایکم لە وەڵامی ئەواندا وتی: "هەموو ژیانی لانس سەیر و پێچەوانەی چاوەڕوانی هەمووان بووە."

دواجار کاتی سەرنجڕاکێشترین بەشی ڕێوڕەسمەکە، واتە دوایین سووری تەشریفاتی گەیشت، کە من لەگەڵ تیمەکەمدا، جارێکی دیکە بە نیشانەی سەرکەوتن، گۆرەپانەکەمان دەرو دەدایەوە و دەچووینە شەقامی شانزە لیزەوە. سێ هەفتەمان پێکەوە بەسەر بردبوو. لەو ساتانەدا، زۆر هێواش دەڕۆشتین و چێژمان لە یەك بە یەکی ساتەکان وەردەگرت. یەکێك لە تەماشاچییەکان، پەڕییە ناوەندی شەقامەکە و ئاڵای ئەمریکا دایە دەستم. نازانم چۆن هاتبووە ئەوێ، چونکە لەپڕ لە بەردەمم قوت بۆوە و ئاڵاکەی پێدام. ئاڵاکەم بەرز کردەوە و نوقمی ئیحساسات بووم.

دواجار گەیشتینە خاڵی کۆتایی و لەوێ لەگەڵ هەواڵنێرەکان قسەم کرد. لەحاڵێکدا کە هەوڵم دەدا پێش بە فرمێسکەکانم بگرم، وتم: "من شۆك بووم، تەنیا دەمەوێ شتێك بڵێم: ئەگەر لە ژیاندا شانسی دووەم بە کەسێك بدرێ، دەتوانێ تا کۆتایی ڕێگاکە بڕوات..."

لەگەڵ تیمەکەدا ڕۆشتین تا خۆمان بۆ میوانی شەو ئامادە بکەین.

جەژنێکی بەشکۆ بۆ دوو سەد و پەنجا کەس لە مۆزەی دی ئورسێی کە پڕ لە کەلوپەلی بەنرخ بوو. دواجار پاش سێ هەفتە، جلوبەرگی پاسکیلسواریمان داکەند و وەك شارۆمەندێکی ئاسایی، چووین بۆ میوانییەکی گەورە تا ئەو شەوە بە خۆشی تێپەڕ بکەین.

گەیشتینە مۆزەخانەکە و و لەسەر مێزەکان دانیشتین کە بە زەوقێکی زۆرەوە رازێنرابوونەوە. خواردنەوەکانمان بەخۆشی یەکترەوە خواردەوە. پاش پێشبڕکێی مێتس ئەمە یەکەم جار بوو کە شامپاینم دەخواردەوە. وەستام و بە هەموو هاوتیمییەکانی خۆم وت: "من بلوزی زەردم پۆشی، بەڵام پشکێکی زۆر کەمی هی من بوو، شتێکی بە ئەندازەی زنجیری بلوزەکە. ئەوی دیکەی بەرهەمی هەوڵی هەموو هاوتیمییەکانم بوو."

ئەو شەوە، من و کریستین چووین بۆ ریتەرز. لەوێ مۆتێلێکی گەورە و گرانمان گرتبوو. هەر دووکمان جلی نێو ماڵمان لەبەر کرد، خواردنەوەمان خواردەوە و جەژنێکی تایبەتیمان ساز کرد. دووبارە دەمانتوانی پێکەوە تەنیا بین. پێکەنیمان بە گەورەیی مۆتێلەکە دەهات. لە تەنیشت یەکتر نانی ئێوارەمان خوارد و پاشان خەوێکی قوڵمان لێکەوت.

بەیانی رۆژی دواتر، کاتێك لەخەو هەستام، سەیرێکی ئەو چواردەورە نامۆیەم کرد و هەوڵمدا بیرم بێتەوە. "کیك"یش بەرەبەرە چاوەکانی کردەوە، ئەو چاوی بڕیبووە من. لەو ساتەدا، دەمانتوانی مێشکی یەکتر بخوێنینەوە.

وتم: "خوایە گیان! من بووم بە پاڵەوانی تۆردۆفرانس."

کیك وتی: "وادیاره."

پاشان هەردووکمان دامانە پرمەی پێکەنین.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەگەر پرسیارم لێبکەن، لای تۆ پاڵەوانی لە تۆردۆفڕانس و زاڵبوون بەسەر شێرپەنجەدا کامیان گرنگتر و بەنرخترە، دەڵێم، زاڵبوون بەسەر شێرپەنجەدا.. سەیرە، بەڵام من نازناوی "ڕزگار بوو" لە شێرپەنجەم لە نازناوی "پاڵەوانی تۆردۆفڕانس" بەلاوە باشتر و بەنرختره، چونکە بەر لەوەی وەرزشکارێك بم، مرۆڤێکم، پیاوێکم، هاوسەرێکم، منداڵێك و باوکێکم!

دوای پەڕینەوەی لە هێڵی کۆتایی لە پاریس، ڕووبەڕووی شەپۆلێك لە پێشوازی بوومەوە، هەروا کە هەوڵم دەدا بەرژەوەنێك لەو ڕووداو لە زەینمدا هەبێ، پرسیارم لەخۆم کرد، بۆچی سەرکەوتنی من کاریگەرییەکی ئاوا قوڵی لەسەر خەڵك داناوە؟ ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە نەخۆشی شتێکە هەمووان تێیدەگەن. هەموومان نەخۆش دەکەوین، هیچ کەس نییە لە نەخۆشی پارێزراو بێت. کەواتە، بوون بە پاڵەوان لە پێشبڕکێی تۆردۆفڕانسدا، بە کارێکی سیمبۆلیك هەژمار دەکرا، بەڵگەی ئەوە بوو کە نەك هەر دەکرێ بەسەر شێرپەنجەدا سەرکەوی، بەڵکو دەکرێ دوای ئەو، بە سەرکەوتووییەوە درێژە بە ژیان بدەی.. ڕەنگە وەك فیل نایت (Phil Knight)ی هاوڕێم دەیووت، من خودی هیوام. دواجار بیل قەناعەتی بە من کرد کە سەفەرێکی یەك ڕۆژە بۆ ئەمریکا بکەم. کۆمپانیای نایك، بۆ ئەم کارە فڕۆکەیەکی تایبەتی تەرخان کرد، "کیك"یش لەم گەشتەدا لەگەڵ من بوو. لە نیۆیۆرك کاریگەری

سەرکەوتنەکەم لە نزیکەوە بینی. لە شاری نایك (Niketown)، بە ئامادە بوونی سەرۆکی شارەزانی و دۆناڵد ترامپ ( Donald Trump)، کۆنفرانسێکی هەواڵنێرم هەبوو، لە بەرنامەکانی "تودێی" و "دەیڤید لێتێرمن"یشدا بەشداریم کرد. نووسینگەی بەرنامەکە لە شەقامی وال ستریت بوو. کە لە زەنگی دەرگاکەمان دا و چووینە نێو بیناکەوە، ئەوان دەستیان بە چەپڵە لێدان و هاندانی من کرد، بەجۆرێك کە تەواو خافڵگیر بووم. کاتێك بیناکەمان جێهێشت، خەڵکێکی زۆر لە پێش بیناکە کۆبووبوونەوە. بە بیلم وت: "ئەم هەموو خەڵکە، لێرە چی دەکەن؟!"

بیل وتی: "لەبەر تۆ هاتوون. لانس، ئێستا تێگەیشتنی ئەو رۆژە چیم بە تۆ وت؟" دوای ئەوە، لەگەڵ کیك، چووین بۆ فرۆشگاە جلوبەرگی منداڵان. خەڵك لەملاو و لاوە دەهاتن تا تەوقەم لەگەڵ بکەن و واژۆیان بۆ بکەم.. من خافڵگیر و تووشی سەرسوڕمان بوو بووم، بەڵام کیك ئارام بوو. تەنیا بە میهرەبانییەوە دەیووت: "ئەگەر مۆڵەت بدەن، ئێمە دەبێ برێك جلوبەرگ و پێداویستی منداڵ بکڕین."

لە روانگەی ئێمەوە، قۆناغێکی دیکەی ژیان کردن و ژیانی دووبارە مابوو، ئەویش بوون بە دایك و باوك بوو.

لە هەوەڵەوە نیگەران بووم، دەترسام لەبەر ئەوەی هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ باوکم نەبووە، نەتوانم باوکێکی باش بم.

هەوڵم دەدا راهێنانی باوك بوون بکەم. بوکەڵەیەکم کڕیبوو، لە کاتی ئامادە کردنی نانی بەیانی، راهێنانی ئەوەم دەکرد کە چۆن ئەو لە باوەش

بگرم. کاتێکیش لە ئۆفیسی کارکەم بووم و وەڵامی نامە ئەلکترۆنی و تەلەفۆنەکانم دەدایەوە، بوکەڵەکەم پێبوو. لە حەوشەی پشتەوە لەگەڵ بوکەڵەکەدا پیاسەم دەکرد و تەسەورم دەکرد بوونەوەرێکی بچووکی تێدایە.

لەگەڵ کیك چووین بۆ نەخۆشخانە و تاوتوێی ئیمکانات و کەرەستەکانی ئەوێمان کرد. پەرستارێك، شێوازی کاری ڕۆژی لەدایکبوونی منداڵی بۆ روون کردینەوە و هەروەها بۆی روون کردینەوە کە دەبێ ئەو ڕۆژە چی بکەین.

ئەو وتی: "کاتێك منداڵەکە لەدایکبوو، منداڵەکە دەخەینە سەر سنگی دایکی و ناوکی دەبڕین."

وتم: "من ناوکی دەبڕم."

پەرستارەکە وتی: "زۆر باشە، یەکێك لە پەرستارەکان منداڵەکە دەشوا."

وتم: "من ئەم کارە دەکەم.."

وتی: "باشە، دوای ئەوەش منداڵەکە دەبینە ژووری منداڵە تازە لەدایکبووەکان."

وتم: "من ئەم کارە دەکەم، ئەو منداڵی منە."

دوانیوەڕۆی ڕۆژێك لە دوایین ڕۆژەکانی دووگیانی کیك، لە ئوتۆمبێلی جیادا بۆ ئەنجامدانی کارەکانمان دەڕۆشتین، لە دوورییەکی زۆر کەم لە

یەكترەوە دەڕۆشتین. لەپڕ هەستم كرد لە ئوتۆمبێلەكەی ئەو دوور كەوتمەوە. هەستم كرد زۆر خێرا لێدەخوڕێ، پەیوەندیم بە تەلەفۆنی ئوتۆمبێلەكەی ئەوەوە كرد و وتم: "هێواشتر.. وریای منداڵەكە بە."

كیك لە هەفتەكانی كۆتایی دووگیانی خۆیدا بە هەمووانی دەووت: "چاوەڕێی لەدایكبوونی دووەم منداڵی خۆمم!"

سەرەتای مانگی ئۆكتۆبەر، نزیكەی دوو هەفتەی مابوو بۆ لەدایكبوونی منداڵەكە، لەگەڵ بیل چووین بۆ لاس وێگاس. بڕیار بوو لەوێ، وتاردانێك و چەند دانیشتنی كاریمان هەبێت. كاتێك پەیوەندیم بە ماڵەوە كرد، كیك وتی زۆر ئارەق دەكەمەوە، هەستێكی سەیرم هەیە، بەڵام من زۆر بە جددیم وەرنەگرت. درێژەم بە كارەكانم دا، كە كارەكانم لەوێ كۆتاییهات، خێرا چووم بۆ فڕۆكەخانە تا خۆم بە فڕۆكەی دوانیوەڕۆی دالاس بگەیەنم كە لەوێوە دەچوو بۆ ئاستین.

لە دالاس، شوێنێكی چۆڵم پەیدا كرد و پەیوەندیم بە "كیك"ەوە كرد. لەبیرمە دەیووت هێشتاش عارەق زۆر دەكەمەوە و لەنێو سكمدا هەست بە حاڵەت گەلی كشان دەكەم.

وتم: "رەنگە ئەمە پەیوەندی بە منداڵەكەوە نەبێ و نیشانەی شتێكی دیكە بێت."

كیك وتی: "لانس، ئەمە گاڵتە نییە.."

پاشان دیسان هەستی بە ئازار كردەوە.

وتم: "باشە، باشە، من بەڕێوەم."

سوار تەیارەی ئاستین بووین و لەسەر کورسییەکانمان دانیشتین. بیل وتی: "با ئامۆژگارییەکت بکەم.. من نازانم منداڵەکەتان ئەمشەو لەدایك دەبێ یان نا، بەڵام ئەوەندە دەزانم کاتێك تەیارەکە هەستا، دەبێ دووبارە پەیوەندی بە کیکەوە بکەیت."

تەیارەکە بەڕێکەوت، من زۆر بێ ئۆقرە بووم، هەر بۆیە، هەر لە فرۆکەخانە و پێش دەرچوونی تەیارەکە پەیوەندیم بە کیکەوە کرد.

وتم: "چ باسە؟"

وتی: "ماوەی ژانگرتنەکان گەیشتۆتە یەك خولەك و هەر پێنج خولەك جارێکیش ژان دەمگرێ، تا دێت ماوەی ژانەکە زیاتر دەبێت..."

وتم: "کیك، پێتوایە ئەمشەو منداڵەکە لەدایك ببێت؟"

وتی: "بەڵێ، پێموایە وا دەبێت."

وتم: "لەگەڵ نیشتنەوەی تەیارەکە، پەیوەندیت پێوە دەکەم."

تەلەفۆنەکەم داخستەوە و بە خزمەتکارەکانی تەیارەکەم وت تا دوو بیرەمان بۆ بێنن. بتڵەکانما هەڵپچڕی و بەخۆشی منداڵەکە خواردمانەوە. ماوەی فڕینەکە چل خولەك بوو. من بەدرێژایی ئەو ماوەیە تووڕە بووم و لنگەفرتێم بوو. لەگەڵ نیشتنەوەی تەیارەکە، دووبارە پەیوەندیم بە کیکەوە کردەوە. بەگشتی هەر کات کیك تەلەفۆنەکەی هەڵدەگرت، بە تاسە و وزەوە دەیووت: "سڵاو"، بەڵام ئەمجارە زۆر ماندوو بوو.

لە حالێکدا کە هەوڵم دەدا ئارام بم، وتم: "بارودۆخت چۆنە خۆشەویستم؟"

وتی: "باش نیم.."

وتم: "ئێمە دەبێ چی بکەین؟"

وتی: "تەلەفۆنەکە راگرە."

هەستی بە ژانێکی زۆر دەکرد، پاش خولەکێك تەلەفۆنەکەی هەڵگرت.

وتم: "پەیوەندیت بە پزیشکەوە کرد؟"

وتی: "بەڵێ.."

وتم: "چی وت؟"

وتی: "وتی لەگەڵ گەیشتنی تۆدا، بچین بۆ نەخۆشخانە."

وتم: "باشە، ئێستا دێم."

سوار ئۆتۆمبێل بووین و زۆر خێرا خۆمان گەیاندە ماڵەوە. یارمەتی کیکم دا تا سوار ئۆتۆمبێلکە ببێ و بە وریاییەکی زۆرترەوە بەرەو نەخۆشخانەی سنت دەیڤید (St. David Hospital) وەڕێکەوتین. ئەو نەخۆشخانەی کە لەکاتی نەخۆشییەکەمدا، نەشتەرگەرییان بۆ من کردبوو.

لەدایکبوونی مناڵ بەو شێوەیەی کە دەڵێن وەك پەرجوویەك نییە، بە بڕوای من بەڕاستی ترسناکە، بەڕادەیەك نیگەرانی کیك و منداڵەکە بووم

کە نەمدەزانی دەبێ چی بکەم..

سك دانانەکەی سێ کاتژمێری خایاند و زۆر قورس بوو. منداڵەکە تەواو نەسووڕابوو، کیك زۆر ئازاری چەشت. دواجار ناچار بوون فێرسپس بەکار بهێنن و منداڵەکە دەرکێشن. دواجار منداڵەکە چاوی بە دنیا هەڵێنا. لوك دەیڤید ئارمێسترانگ (Luke David Armstrong) بە فەرمی لەدایکبوو.

کاتێك دەریان هێنا، زۆر بچووك و تاڕادەیەك ڕەنگی شین بوو، لەبەر ئەوەی هێشتا نەیانشۆردبوو. کۆرپەکەیان لەسەر سنگی کیك دانا، ئەو نەدەگریا، تەنیا چەند دەنگێکی وەك میاو میاوی پشیلە لێوەهات. پەرستارەکان نیگەران بوون کە باش ناگری. چەند ساتێکی دیکەش گوزەرا، بەڵام لوك نەدەگریا. وتم دە بگری ئیتر.. ساتەوەختێکی ناخۆش بوو، هەستم دەکرد ژوورەکە خەریکە بچووك دەبێتەوە.

یەکێك لە پەرستارەکان وتی: "ئەو پێویستی بە یارمەتییە."

یەکێك لە پەرستارەکان، منداڵەکەی لە باوەشی کیك دەرهێنا و بردی بۆ ژوورێکی دیکە کە پڕ بوو لە ئامێری ئاڵۆز و سەیر.

لەناکاو ئەوان دەستیان کرد بە راکردن.

کیك وتی: "چی بووە؟! چی ڕوویداوە؟"

وتم: "نازانم.."

ئەوان بە جۆرێك رایان دەکرد کە وەك بڵێی حاڵەتێکی کتوپڕ

روویداوه. دەستی "کیك"م گرت و هەوڵم دەدا بزانم لەو ژووره چی دەگوزەرێت. نەمدەتوانی منالەکە ببینم، نەشمدەزانی ئەوان چی دەکەن. کوڕەکەم لەو ژووره بوو، بەلآمن نەمدەویست کیك بە تەنیا جێبهێڵم، چونکە زۆر ترسابوو. ئەو بەردەوام دەیووت: "چی بووه؟ خەریکن چ بەلآکەیەکی بەسەر دەهێنن؟" دواجار دەستی کیکم بەردا و سەیرێکی نێو ژوورەکەم کرد.

ئەوان خەرکبوون لەڕێی دەمامکێکی بچووکەوه ئۆکسیجنیان دەدا پەو.

لەبەر خۆمەوه دەمووت... تو خوا بگری، تکایە بگری.. مێشکم لەکار کەوتبوو، تەنیا چاوەڕوانی دەنگی جیقەی ئەو بووم. ئەوەی من لە بارەی ترسەوه دەمزانی، لەو ساتانەدا بەتەواوی وەڕاست گەڕابوو. کاتێك زانیم تووشی شێرپەنجە بووم، ترسام. ئەو کاتەی چارەسەرم وەردەگرت، دەترسام. بەلآم هیچ کامیان، هاوشێوەی ترسی دووری لە منداڵەکەمان نەبوو. هەستم بە داماوی دەکرد، چونکە ئەمجاره من نەخۆش نەبووم، بەڵکو ئەوه منداڵەکەمان بوو کە مەترسی لەسەر بوو.

دەمامکەکەیان لابرد، ئەو دەمی کردەوه، روخساری کرایەوه و لەپڕ جیقەیەکی گەورەی کرد. جیقەی ئەو وەك هاواری پاڵەوانێکی جیهانی بوو. هەر کە جیقەی لێوه هات، رەنگی گۆڕا و وادیاربوو هەمووان خەیاڵیان ئاسووده بوو. دووباره ئەویان هێنایەوه بۆ لای ئێمە، باوەشم گرت و ماچم کرد.

ئەوم شۆرد و پەرستارێك فێری کردم کە چۆن مەلۆتکەی بکەم. پاشان

من و كیك و لوكیان بردە ژوورێكی گەورە لە نەخۆشخانەكە كە زیار لە مۆتێل دەچوو. ئەم ژوورە وەك هەموو ژوورەكانی دیكە، قەرەوێڵە و ئامێری تێدابوو، بەڵام سەرەڕای ئەوانە، قەنەفەیەك و هەروەها مێزێكی قاوەیی بۆ دیداری سەردانیكەرانی تێدابوو. ماوەی چەند كاتژمێرێك هەر سێكمان خەوتین، پاشان سەردانیكەران یەك لەدوای یەك گەیشتن: دایكم، دایك و باوكی كیك، بیل و لۆرا ستاپیلتۆن. ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەخۆشی لەدایكبوونی "لوك"ەوە میوانییەكەمان سازكرد.

دوای میوانییەكە، من و دایكم لە ڕاڕەوەكاندا پیاسەمان دەكرد، من نەمدەتوانی ئەوە شتە لەبیر بكەم كە چەند كاتژمێر پێشتر (لەبەر لوك) بەسەرم هاتبوو. ئێستا تێدەگەیشتم، ئەو كاتەی دایكم زانی من نەخۆشم و ڕەنگە زیاتر لە من بژی، چ هەستێكی هەبووە...

لەو نەخۆشخانەیە، بەتەنیشت ژوورە كۆنەكەی خۆمدا تێپەڕیم، لە دایكم پرسی: "ئێرەت لەبیرە؟" و پێكەوە پێكەنین.. پرسیارێك كە هێشتاش لەگۆڕی بوو ئەمە بوو كە، چەندەم ڕۆڵ هەبوو لەوەدا كە سەر لەنوێ گەڕامەوە بۆ ژیان؟ ڕۆڵی زانست و پەرجوو چەند بووە؟

وەڵامی ئەم پرسیارەم نەدەزانی، بەڵام دڵنیا بووم كە ئەوانی دیكە چاوەڕوانی وەڵامی ئەم پرسیارەن. ئەگەر بمتوانیبایە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، بە واتای دۆزینەوەی چارەسەری شێرپەنجە و لەوەش واوەتر، فەلسەفەی بوون بوو. من دەمتوانی هیوا و ئەنگێزە و بوێری و

ئازایەتی و راوێژ بە کەسانی دیکە بدەم. بەڵام نەمدەتوانی قسە لەو شتە بکەم کە خۆشم نەمدەزانی، پێویستیش نەبوو لەم بوارەدا هەوڵ بدەم. من بەوە خۆشحاڵ بووم کە زیندووم تا چێژ لەم راز و نهێنییە وەرگرم.

با نوکتەیەکی سەرنجڕاکێش و جێی عیبەرتتان بۆ بگێڕمەوە:

پیاوێك لە لافاودا گیری خواردبوو. کاتێك ئاوەکە بەرز دەبێتەوە، دەچێتە سەر بانی ماڵەکەیان و چاوەڕوانی یارمەتی دەمێنێتەوە. کەسێك بە پاپۆڕێکی ماتۆڕی دێ و پێی دەڵێ: "سەرکەوە، من رزگارت دەکەم."

پیاوەکە دەڵێ: "نا، سپاس، خوا رزگارم دەکات.."

تا دەهات ئاوەکە بەرزتر دەبۆوە. چەند خولەك دواتر، تەیارەیەکی فریاکەوتن دەگاتە سەری و پەتێکی بۆ شۆڕ دەکاتەوە.

پیاوەکە دیسان دەڵێ: "نا، سپاس، خوا رزگارم دەکات.."

ئاوەکە هەر بەرزتر دەبۆوە و دواجار دەگاتە میچی ماڵەکە و دوای پیاوەکە نوقم دەبێت. کاتێك دەچێتە بەهەشت، بە پاڕانەوەوە بە خوا دەڵێ: "خوایە، بۆ رزگارت نەکردم؟"

خوا دەڵێت: "من ئەو پاپۆڕ و تەیارەیەم بۆ رزگارکردنی تۆ نارد، بەڵام تۆ تێنەگەیشتی!"

من پێیموایە هەمووومان، بەجۆرێك لە جۆرەکان وەك ئەو پیاوەین.. پێشهاتی زۆر روو دەدات، بەڵام لە راستیی ئەوان بێ ئاگاین. لە حاڵێکدا کە دەتوانین بەرپرسیارێتی کارەکانی خۆمان لەئەستۆ بگرین و بوێر بین.

هەر یەکێك لە ئێمە تەسەوڕێکی جیاوازمان سەبارەت بە مەرگ هەیە. هەندێك نکۆڵی لێدەکەن، هەندێك نزا دەکەن و ژمارەیەکیش هەوڵ دەدەن خۆیانی لێ نەبان بکەن. بەڵام من لەو باوەڕەدام، دەبێ مرۆڤ ڕووبەڕووی ببێتەوە و تەنیا بە چەکی بوێری، خۆی پڕ چەك بکات. پێناسەی بوێری چییە: یەکێك لە خەسڵەتە ڕۆحییەکانە کە توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی بێترس -لەگەڵ مەترسی-دا بە مرۆڤ دەبەخشێت.

ئامار پیشانی دەدات کە ڕێژەی ئەو منداڵانەی لە شێرپەنجە ڕزگاریان بووە زۆر لە بەتەمەنەکانی تووشبوو بە شێرپەنجە زیاترە، من پێموایە هۆکارەکەی بۆ بوێری و بێباکی ئەوان دەگەڕێتەوە. هەندێکجار وا دێتەپێش چاو کە منداڵان لەهەمبەر شێرپەنجەدا تەیار و ئامادەترن. ئەوان بوونەوەرانێکی مکوڕ و خاوەن ئیرادەن و پێویست بەوە ناکات ئێمە ورەیان بەرز بکەینەوە. بەتەمەنەکان شتی زۆر لەبارەی شکستەوە دەزانن و لەڕادەبەدەر، رەشبین و ترسنۆکن. منداڵێك دەڵێ: "دەمەوێ یاری بکەم، زووکە.. دەبێ یاریم لەگەڵ بکەی." ئەمە بەڕاستی هەموو ئەو شتەیە کە دەیەوێت.

کاتێك کە دوای بەدەستهێنانی نازناوی پاڵەوانێتی لە تۆردۆفڕانس، کۆمپانیای ڤیتیز[١٤] بڕیاریدا وێنەی من بخاتە سەر بەرهەمەکانی خۆی، داوام لێ کردن کۆنفڕانسێکی ڕۆژنامەوانی، لە بەشی منداڵانی تووشبووی شێرپەنجەی هەمان نەخۆشخانە ساز بکرێ کە منداڵەکەم لەوێ لەدایك بوو

---

[١٤]– ئەم کۆمپانیایە، بەرهەمهێنەری دانوێڵەی لەقوتووندراوە کە وەك ژەمی بەیانی دەرخورێت.

بوو. کاتێك سەردانی منداڵەکانم کرد و واژۆی خۆم بۆ کردن. منداڵێك یەکێك لە قوتووەکانی دانەوێڵە لەقوتوونراوەکانی رفاند و لەحاڵێکدا کە بەتوندی بەستەکەی لە باوەش گرتبوو، لەبەر دەمم وەستا.

وتی: "دەکرێ ئەمە بۆ من بێت؟"

وتم: "بەڵێ، ئەوە هی تۆیە.."

هەروا لەوێ وەستابوو، سەیرێکی قوتووەکە و پاشان سەیریکی منی کرد.. تێگەیشتم کە کاری زۆر تێکردووە.

پاشان وتی: "ئەوان شێوەیان چۆنە؟"

وتم: "چی؟"

وتم: "ئێ، ئەوان دانەوێڵەن و شێوەی جۆراوجۆریان هەیە."

وتی: "ئەها، باشە."

سەیرکە! لە روانگەی ئەوەوە، ئەو قوتووە پەیوەندییەکی بە شێرپەنجەوە نەبوو، تەنیا پەیوەندی بە دانەوێڵەوە هەبوو.

ئەگەر منداڵان دەتوانن گوێ بە ئامار و ژمارەکان نەدەن، کەواتە ئێمەش ئەم توانایەمان هەیە کە ئەم وانەیە لەوانەوە فێر ببین. کاتێك باش بیر لەم نەخۆشییە بکەیتەوە، دەبینی کە جیا لە هیوادار بوون هیچ رێگایەکی دیکە نییە. لەڕاستیدا چ لە رووی پزیشکی و چ لە رووی رۆحییەوە، هەمیشە دوو ریگام لەبەرە: بێ هیوایی و خۆدانە دەست

مردن، یان جەنگان لەگەڵ نەخۆشییەکە، وەك بڵێسەی ئاگر و بە توورەییەوە...

دوای چاکبوونەوەم، لە دکتۆر نیکۆلاسم پرسی، بەڕاستی شانسی چاکبوونەوەم چەند بوو؟ ئەو وتی: "نەخۆشییەکەی تۆ زۆر پیس بوو." وتی نەخۆشییەکەی تۆ، خراپترین حاڵەتی ئەم نەخۆشییە بووە کە تا ئێستا بینیومە. پرسیارم لێکرد: "چەندە خراپ؟ شانسم لە ٥٠٪ کەمتر بوو؟" سەری راوەشاند، وتم: "کەمتر لە ٢٠٪ بوو؟" دیسان سەری راوەشاندەوە، پرسیارم کرد: "کەمتر لە ١٠٪ بوو؟!" ئەو دیسان سەری راوەشاند.

کاتێك وتم لە ٣٪ کەمتر بوو؟ بە جووڵەی سەر وتی بەڵێ..

هەموو شتێك ڕێی تێدەچێ، ڕەنگە پێت بڵێن ٩٠٪ یان ٥٠٪ و یان تەنانەت ١٪ شانسی زیندوو مانەوەت هەیە، بەڵام دەبێ تەنیا باوەڕت بەخۆت هەبێ و لەگەڵ نەخۆشییەکەدا بجەنگێی. مەبەستم لە جەنگان، خۆ پڕ چەك کردن بە هەموو ئەو زانیاریانەیە کە هەیە و ڕاوێژ کردن لەگەڵ پسپۆڕەکانی دیکەی ئەو بوارەیە. پێویستە باوەڕ بەوە بکەی کە پەلاماری لەشتی داوە و بە شوێن چارەسەرییەکاندا بگەڕێیت. ڕاستییەکی دیکەی پەیوەندیدار بە شێرپەنجە ئەمەیە کە تا کەسی تووشبوون وشیارتر و بەهێزتر بێ، شانسی بۆ مانەوە زۆرترە.

ئەگەر من ورەم بڕوخایە و لەهەمبەر نەخۆشییەکەدا پاشەکشێم بکردبایە، چی ڕووی دەدا؟ هێشتاش لەو باوەڕەدام لەم هەوڵەمدا بۆ

زیندوو مانەوە، زۆر شتم بەدەستهێناوە، چونکە ئێستا کامڵتر و پێگەیشتووتر بووم. ئەو شتەی کە شێرپەنجە منی سەبارەت بەو بە قەناعەت گەیاند ئەمە بوو کە ئێمە باشتر لەوەین کە بیری لێدەکەینەوە و توانا گەلێکمان هەیە کە تەنیا لە کاتە قەیراناوییەکاندا خۆیان پیشان دەدەن.. ئەمە ئەو راستییە بوو کە لە ئەزموونەکانی خۆمدا وەك وەرزشکارێکی پیشەیی، پێینەگەیشتبووم.

کەواتە ئەگەر لە مەینەتییەکی وەك شێرپەنجەدا، ئامانجێك وەشێردرابێ بە بڕوای من ئەو ئامانجە دەبێ بەرز کردنەوەی مرۆڤایەتی و کەسێتی ئێمە بێت.

من بڕوای قووڵم بەوە هەیە کە شێرپەنجە جۆرێك مردن نییە.. دەمەوێ دووبارە پێناسەی بکەمەوە، شێرپەنجە بەشێکە لە ژیانە. دوانیوەڕۆیەك کە چووبووم پشکنین بکەم بزانم ئایا نەخۆشییەکەم دووبارە گەڕاوەتەوە یان نا، لە زەینی خۆمدا لە هەر کام لە پیتەکانی شێرپەنجە (Cancer) وشەیەکم دروست کرد. ئەم وشانە بریتی بوون لە بوێری (Courage)، جۆری روانین (Attitude)، بێهیوا نەبوون (Never dive up)، شیاوی چارەسەر بوون (Curability)، ئاگادار بوون (Enlightenment) و یاد کردنی کەسانێك کە ئەم نەخۆشییەیان هەیە(Remembrance of my fellow patients).

رۆژێك لە دکتۆر نیکۆلاسم پرسی، بۆچی شارەزایی و پسپۆڕ بوون لە شێرپەنجەناسیت هەڵبژاردووە، بوارێك کە زۆر قورس و خەمهێنەرە؟ ئەو

وتی: "ڕەنگە لەبەر هەمان هۆکار کە تۆ پاسکیلسواریت هەڵبژاردووە." ئەو بە جۆرێك لە جۆرەکان دەیەویست بڵێ کە شێرپەنجە، تۆردۆفرانسی نەخۆشییەکانە.

ئەو وتی: "شێرپەنجە وەك بارێکی قورس وایە، هیچ نەخۆشییەك بەئەندازەی ئەم نەخۆشییە پێویستی بە خۆڕاگری نییە، گومان لە خەمهێنەر بوونی ئەم بوارە نییە، بەڵام تەنانەت کاتێك کە نەتوانی خەڵك چارەسەر بکەی، لانی کەم دەتوانی یارمەتیان بدەی. ئەگەر نەتوانی ئەوان بەتەواوی چاك بکەیتەوە، دەتوانی وورەی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ نەخۆشییەکەیان پێبدەی و هاوخەمییان لەگەڵ دەرببڕی. ساتە مرۆییەکان لەم بوارەدا، لەچاو هەموو پسپۆڕییەکانی دیکەی پزیشکیدا، زۆرترە. هەرگیز لێی رانایەیت، بەڵکو دەتوانی خۆڕاگری کەسەکان لەهەمبەر نەخۆشییەکەدا، ستایش بکەیت." ئەو وتی یەکێك لە نەخۆشەکانی بەوی وتووە: "تۆ هێشتاش ئەم نەخۆشییە ناناسی (تۆ هێشتاش نازانی ئەم نەخۆشییە چییە)، بەڵام ئێمە ئەم شانس و بەختەمان هەبووە."

من هەمیشە ئەم وانانەم لەبیرە و هەست دەکەم ئەندامێکی کۆمەڵەی تووشبووان بە شێرپەنجەم. لەو باوەڕەدام کە دەبێ زیاتر لە پێشوو هەوڵ بدەم و یارمەتی ئەو کەسانە بدەم کە گیرۆدەی ئەم نەخۆشییەن. کۆمەڵەی تووشبووان بە شێرپەنجە، کۆمەڵە هاوبەشی ئەزموونەکانە و بە هەر کەس بڵێن: "تۆ تووشی شێرپەنجە بوویت" و ئەو بیر بکاتەوە: "ئەی

خوایە، من خەریکە دەمرم"، ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە و کاتێك کە کەسێك بوو بە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە، بۆ هەمیشە وەك ئەندامی ئەو دەمێنێتەوە.

کەواتە، کاتێك دنیا هیوابڕ و خۆڵەمێشی و ناخی مرۆڤەکان گەن و خوار دێتە. پێش چاو، من بڕوانامەکەم بەدەستەوە دەگرم و سەیری وێنەکەی دەکەم و بیر لە لاتریس هانی، ئیسکات شاپیرۆ، کریگ نیکۆلز، لارنس ئاینهۆرن و منداڵێك دەکەمەوە کە دانەوێڵەکانی (ئەو دانەوێڵە لەقوتوونراوەکانی) لەبەر شێوەکەیان خۆش دەویست.. بیر لە کوڕەکەم دەکەمەوە، ئەو کە بەرجەستەبووی ژیانی دووبارەی من و هۆکارێکی دیکە بۆ بەردەوامی ژیانە.

هەندێکجار نیوە شەو بەخەبەر دێم و بۆی بێتاقەت دەبم.. ئەو لە قەرەوێڵەکەی دەردەهێنم، دەیبەمە سەر قەرەوێڵەکەی خۆمان و لەسەر سنگمی دادەنێم. هەموو هاوار و گریانێکی ئەو من خۆشحاڵ دەکات. سەرە بچووکەکەی دەباتە دواوە، چەناگەی دەلەرێتەوە، دەستەکانی رادەوەشێنێ و دەگری.. گریانی ئەو بۆ من دەنگی ژیانە، بەڵێ راستە، من وا لەو دەکەم بگری!

تا ئەو زیاتر هاوار بکات، لە خۆمدا زیاتر هەست بە شۆر و شەوقی ژیان دەکەم...




• پێش تووشبوون بە شێرپەنجە تەنیا دەژیام، بەڵام ئێستا بەهێزەوە دەژیم!

**ژیان فێری کردم چۆن بە ئامانجەوە بژیم و نرخی هەموو ساتەکان بزانم....**






• پاش هەر ئازار و مەینەتییەك، پڕ لە شادی و خۆشی دەبم، چونکە هەست دەکەم پلەیەك لە ئامانجە خوازراوەکەم نزیك بوومەتەوە.



• هەمیشە شێرپەنجە بە شانازی خولقێنترین و باشترین ڕووداوی ژیانم دەزانم.



• لە ژیاندا، هەمیشە دوو بژاردە لەبەردەم ئێمەدا هەیە: خۆبەدەستەوە دان یان بەرەنگاربوونەوە وەك ئاگری بڵێسەدار.



• پێویستە فێری ئەم راستییە ببین کە بۆ هەر سەختی و نەبوونییەك، هۆکارێکی بەنرخ هەیە کە هەندێك جار جۆری روانین و شێوەی ژیانی ئێمەی مرۆڤ دەگۆڕێ و دەبێتە مایەی بەرەوپێش چوونمان!

• ئەم نەخۆشییە، بەدرێژایی ئەم ساڵانە دیارترین ڕاهێنەری من بووە و هەیە، وانە گەلێکی فێری من کرد کە هەرگیز هاوشێوەی ئەوم ئەزموون نەکردبوو!






● تۆردۆفڕانس ٩٩ : هیچ شتێکم نییە لەدەستی بدەم!

• ئەگەری هەموو شتێك هەیە، رەنگە پێیت بڵێن: 90٪ یان50٪ یان تەنانەت 1٪ شانست هەیە، بەڵام تۆ دەبێ تەنیا باوەرت بە سەرکەوتن هەبێ و لەپێناویدا ململانێ بکەیت





• جارێك پرسیارم لێكرا: 6 یان 7 كاتژمێر پاسكیلسواری له ڕۆژدا چ چێژێكی هه‌یه؟ من به سه‌رسوڕمانه‌وه وه‌ڵامم دایه‌وه: "چێژ؟! هیچ له پرسیاره‌كه‌ی تۆ تێناگه‌م. من ئه‌م كاره بۆ چێژ وه‌رگرتن ناكه‌م. من ته‌نیا له‌به‌ر ئه‌وه پاسكیلسواری ده‌كه‌م كه ئازار بچێژم."



• دیسەمبەری 2002: بەڵێ! ئێستاش بەهەمان ئەنگێزە و خولیای پێشووەوە لێرەم. هەرگیز بۆ پارە، ناوبانگ، خۆشەویست بوون یان پاڵەوانێتی لە تۆرتۆفرانسدا، پاسکیلسواری ناکەم. من ئاشقی رکابەریم. لەو مانگانەی دواییدا، تەنانەت یەك ڕۆژ چییە لە پاسکیلەکەم دوور نەبووم!



• راستییەکەی ئەمەیە کە ئەگەر تووشی شێرپەنجە نەبوومایە، هەرگیز نەمدەتوانی ببمە پاڵەوانی خولێکی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس. ئەم نەخۆشییە فێری کردم کە کاریگەری ئازار و مەینەتی تێدەپەڕێ، بەڵام خۆبەدەستەوەدان، هەمیشەییە!




• ئازار و سەختی، کاتییە. رەنگە یەك خولەك، یەك کاتژمێر، یەك رۆژ و تەنانەت یەك ساڵ، بخایەنێ، بەڵام دواجار نامێنێ و شتێکی بەنرخی دیکە جێی ئەو دەگرێتەوە !




• هەموو بەیانییەك بە ئەشقی رەنگی زەرد لەخەو هەڵدەستم و لەسەر پاسکیلەکەم دادەنیشم. ئەم رەنگە واتای راستەقینەی ئازار و تەحەمول کردنی ئازاری فێری من کرد. رەنگی زەرد تاکە هۆکاری پێشکەوتنی منە.




• لە ماوەی نەخۆشییەکەمدا نەمدەویست بمرم.. کاتی پێشبڕکێش نامەوێ بدۆڕێم. مردن و دۆڕان بۆم من یەك واتایان هەیە.




• لەڕاستیدا ئەگەر بڕیار بوایە لە نێوان نازناوی "پاڵەوانی تۆردۆفرانس" یان "ڕزگاربوو لە شێرپەنجە" یەکێکیان هەڵبژێرم، نازناوی "ڕزگاربوو لە شێرپەنجە"م هەڵدەبژارد، چونکە پێش ئەوەی وەرزشکار بم، مرۆڤ، پیاو، هاوسەر، منداڵ و باوکم!

• لە پەراوێزی پێشبڕکێکانی تۆردۆفرانس: "لە قوڵایی بوون و لە ناخی دڵمەوە ئەم رکابەریەم خۆش دەوێ. هیچ شتێك لەم دنیایەدا بەڕادەی ئەم رکابەرییە من هان نادا. ئەم پاڵەوانێتییە، تەنیا پێشبڕکێیەکی پاسکیلسواری نییە، بەڵکو وێنایەکی ژیانە و جۆرە تاقیکردنەوەیەکی جەستەیی، هزری و تەنانەت مەعنەوییە."





• شێرپەنجە بەشێك لە راز و نهێنییە مەعنەوییەکانی سەرکەوتنی منە، چونکو هیچ کام لە رکابەرەکانم تا ئەو رادەیە لە مەرگ نزیك نەبوونەوە. نەخۆشی گەلێکی لەم شێوەیە، شێوەی روانین و دنیابینی مرۆڤ دەگۆڕن، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا بە یەکێك لە باشییەکانی رکابەرێتی دادەندرێت.




تەنیا ئەمە و هیچی دیکە. زۆر کات هەر ناتوانم باوەڕ بکەم کە لەپێناو ئەم کارەدا، مووچەش وەردەگرم. ئەمە تەنیا کارێکە کە ئەنجامدانی ئەو، ساتەکانی ژیانم لە یەکڕەنگی و وەك یەکی دەردەهێنێت.."

"ئێستا ئەگەر کاتێك بتوانم لە تەنیشت "لوك"ی کوڕمەوە پایدەر لێبدەم، چێژەکەی سەد هێندە زیاتر دەبێت."

## (یادداشتی وەرگێڕی فارسی)

بەسەرهاتی ئەم کتێبە و ئەوەی کە بۆچی بڕیارمدا وەرگێڕمە سەر زمانی فارسی، ئەوەندە دوورو درێژە کە ئەگەر بمەوێ لەسەری بدوێم، بەڕادەی کتێبێك قسەم بۆ وتن هەیە. تەنیا دەتوانم بڵێم کە دوای پێداچوونەوەی کۆتایی، هەستم کرد خۆشم براوەی "تۆردۆفرانس"ێکم.. تۆردۆفرانسێکی دیکە!.. ئەم کتێبە، تەنیا بیانوویەك بوو تا "تۆردۆفرانس"ەکان و ماراسۆنەکان بیری من و ئێوە بهێنێتەوە، چونکو هەر کام لە ئێمە، بەردەوام ڕووبەڕووی یەکێك لەم جۆرە تاقیکردنەوانە دەبینەوە، بەڵام باوەڕمان بە خۆمان نییە و زوو پاشەکشێ دەکەین.

بەش بە بەشی ئەم کتێبە ژیام، تا توانیم بیخەمە سەر کاغەز و بۆ ئێوەی بگێڕمەوە. لە هەوەڵەوە ویستم تەنیا ژیاننامەیەك لە لانس ئارمێسترانگ وەرگێڕم و بڵاوی بکەمەوە، بەڵام بەرەبەرە هەستم کرد لە زەریایەکی قووڵدا نوقم بووم کە ڕزگار وون لێی زۆر ئەستەمە. لەبەر ئەمە، ئامادە کردنی ئەم کتێبە نزیکەی ساڵێکی خایاند.

هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە کە کەوتمە ژێر کاریگەری ئازایەتی "ئارمێسترانگ"ەوە، تا دوا ساتەکان کە سیدی بەڵگەنامەکانی کتێبەکەم بۆ ڕادەست کردن بە ناوەندی بڵاوکردنەوە، ئامادە دەکرد، بەردەوام هەستم دەکرد بارێکی قورس بەسەر شانمەوەیە. نەمدەزانی بۆچی؟! ڕەنگبێ ئەرکێکم کەوتبووە سەر شان و خۆم لێی بێئاگا بووم! گڕی ئەوین و تاسە بۆ وەدیهێنانی ئەم ئەرکە، وەها لە ناخمدا بڵێسەی

سەندبوو کە لە دژوارترین بارودۆخیشدا، وازی لێنەدەهێنام و بەرەو خۆی کەمەندکێشی دەکردم.

دەڵێن لەکاتی لەدایکبوونی هەر بوونەوەرێکدا، پەیامێکی ئارام، بەڵام قووڵ و لێوانلێو، بەگوێی ئەودا دەچپێندرێت. ئەم پەیامە، ئامانجی ئەو بوونەوەرەیە کە دەبێ بیگەیەنێتە مەنزڵ. مخابن ئێمەی مرۆڤ هێندە گیرۆدەی کاروباری ژیانی رۆژانەمان دەبین کە لەبیرمان دەچێتەوە بۆچی هاتووین، چ ئامانجێکمان لەپێشە؟! بەڵام رووداوگەلێك لە ژیاندا هەن، کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو پەیامە ئاسمانییە جارێکی دیکە لە زەینی ئێمەدا دەرکەوێتەوە. رەنگە بە رواڵەت ئەم رووداوانە ناخۆش و خراپ دیار بن، بەڵام دەبێ بزانین کە ئەمە جۆری روانینی ئێمەیە کە هەندێکجار وەها بەرتەسك دەبێتەوە کە رێ نادات راستی بەتەواوی ببینین. چونکە راستی ئەزموونێك نییە. دیارییەکی حازر و ئامادە نییە. راستی شتێکە کە بە وشیاری، تێگەیشتن و بەدەسهێنانی مەعریفە، لە ناخی هەر مرۆڤێکدا، دەگەشێتەوە و بەهۆی ئەو مرۆڤەوە، پەی پێدەبرێت.

بە بڕوای زۆرێك لە دەروونناسان، خۆشبەختی پێش ئەوەی خاڵێکی دیاریکرا و پێناسەکراو بێت، جۆرێك روانینە. رەنگە خۆشبەختی، جیا لە وەدیهێنانی ئەم خەونە شتێکی دیکە نەبێت. ئەو خەونانەی لە منداڵیدا دروست بوون و وێنەیەکی هەمان پەیامی ئاسمانییە، کەواتە خەونەکانت لەبیر مەکە...

حەمید رەزا بولحەسەنی



• نەخۆشخانەی - شەریعەتی، بەشی پێوەنی دەمارو چاندنی مۆخی ئێسک. هاوینی ١٣٨٥

ئەم کتێبەی ئێستا لەبەر دەستاندایە، گێڕانەوەی ژیانی پڕ لە هەوراز و نشێوی ئەفسانەی پاسکیلسواری جیهان و براوەی حەوت خولی پێشبڕکێی نێودەوڵەتی تۆردۆفرانس و پاڵەوانی راستەقینەی گۆڕەپانی ململانێ لەگەڵ شێرپەنجەدایە کە ئەویش "لانس ئارمێسترانگ"ە. بە بڕوای من ژیانی ئەو بە واتای وشە پاڵەوانێتێکە کە دەتوانێ کار لە هەموو مرۆڤێک بکات و شێوە بیرکردنەوە و روانینێکی نوێی پێببەخشێت. شێوە بیرکردنەوە و روانینێک کە دەتوانێ مرۆڤێکی دیکەی لێ دروست بکات: مرۆڤێک کە نەک هەر ترسی لە بەرەنگاربوونەوە نییە، بەڵکو ئامێزی بۆ دەکاتەوە.

بەرگ | ئیبراهیم ساڵح


۷۰۰۰دینار

ISBN: 9781575067841

9 781575 067841

ناوەندی رۆشنبیری تیرۆژ
nawandi terozh
07501424649 - 07700409371

چاپخانە چوارچرا